# شانازیی مرۆڤایەتی

# نووری نەمر

# ٥

پێغەمبەری خوا: فەرمانده و سەرکردەی سوپا

محمد فتح الله گولەن




# شانازی مرۆڤایەتی

# نووری نەمر

## ٥

پێغەمبەری خوا، فەرماندەو سەرکردەی سوپ

نووسینی

محمد فتح الله گولەن

وەرگێڕانی

دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان

چاپی یەکەم: تشرینی دووەم ٢٠١٦

تیراژ ٥٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردنی ١٨٣٠١ای ساڵی ٢٠١٥ی پێ بەخشراوە

چاپکراوە لە لایەن:

دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

# پێڕستی بابەتەکان



## بەشی پێنجەم

## پێغەمبەری خوا؛ فەرماندە و سەرکردەی سوپا

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ عَلى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ

وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعِين

# پێشەکی

باسکردنی کەسایەتیی بەرز و ناوازەی حەزرەتی محەممەد موستەفا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، زیاد لە باسکردنیش، پێشکەشکردنی وەك چارەیەك بۆ ڕزگاریی مرۆڤایەتی و ئیکسیرێك بۆ دەردە ناسۆرەکانی.. هەروەها ناساندنی ژیانی پیرۆزی بەشێوەیەك کە شایستەی ئەو زاتە مەزنە بێت، لەو بابەتە گرنگانەیە کە وەك زۆر کەسی تر، دنیای هزر و هەستی منیشی خستبووە ژێر فشاردوە و لە هەموو ڕوویەکەوە بووبووە خواست و خولیایەکی بەرنەگیراو...

ئەو مایەی شانازیی مرۆڤایەتییە. ئەوەتا چواردە سەدەیە لە سەرانسەری دنیادا گەورەترین بیرمەند و کەڵەفەیلەسوف و ئەو زانا و ڕووناکبیرانەش کە هەریەکەیان ئەستێرەی گەشی ئاسمانی هزر و بیرمانن، لەدوایەوە دەستەنەزەر وەستاون و لە ڕوویدا دەڵێن "تۆ ئەو مرۆڤەیت کە شانازی بە شوێنکەوتوویتەوە دەکەین."

بۆ گەورەیی ئەو ئەوەندە بەسە کە سەرباری ئەو هەموو تێکدان و کاولکارییە ماددی و مەعنەوییانەی لەم چەرخەدا کراون، کەچی هێشتا لە منارەکانەوە زایەڵەی "أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله" دەبیستین و شاباڵگرتەی ڕۆحی ڕەوانی محەممەدی بە هەموو لایەکدا دەبینین وَ لەگەڵ ڕۆحانییەکاندا ڕۆژی پێنج جار ئێمەش دێینە جۆش و خرۆش.. دیسانەوە سەبارەت بە مەزنی و شکۆی ئەو دەتوانین بڵێین: سەرەڕای هەوڵی سەروسەری دوژمنانی دین لە ناوەوە و دەرەوە لەپێناو گومڕاکردن و لەڕێ لادانی ئەوەی نوێ، کەچی وا ئەمڕۆ

چەندەها لاوی تازەپێگەیشتوو هەرچەند لە قۆناغێکی زەمەنیی ئەوتۆشدان کە دەرککردنیان بە حەقیقەتی ئەحمەدی وەك پێویست سەخت و دژوارە، چەشنی بەرەوپیرچوونی پەروانە بۆ ڕووناکی بەرەو حەزرەتی محەممەد ﷺ باڵ دەگرن. بەم کارەشیان هەڵوێستێك دەنوێنن کە لە دنیادا هاوتای نییە. دەستی زەمەن کورتتر بوو لەوەی بتوانێت هیچ حەقیقەتێکی تایبەت بەو لە ناخماندا کۆن و ڕەنگپەڕ بکات. بەڵێ، ئەو هێشتا تەڕ و تازەیە لە سینەماندا. هەروەك زۆرجار بە دۆستەکانیشم دەڵێم: هەرکات دەچمە مەدینەی مونەووەرە، بۆن و بەرامەی ئەو سەروەرە بەجۆرێك دەمبینێت، هەر دەڵێیت هەنگاوێك لەوڵاترەوە بە خۆی پێشوازیم دەکات و بە دەنگە ژیانبەخشەکەیەوە پێم دەڵێت "مرحبا، أهلا و سهلا" و بەخێرهاتنم دەکات. جا ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێوماندا تا ئەو ڕادەیە زیندە و تازەیە. هەروەهاش بە تازەیی و پاراویی دەمێنێتەوە.

بەڵێ، زەمەن پیر دەبێت و بەساڵا دەچێت. هەروەك چۆن هەندێك فیکر و بۆچوونیش پووچ و نابوود دەبن و لە بیرچوونەوە دەکەون. کەچی حەزرەتی محەممەد ﷺ بەوێنەی ئەو خونچەیەیە کە ڕۆژ دوای ڕۆژ ئاڵتر و پاراوتر دەبێت. هەمیشە لە نوێبوونەوەدایە.

پێم وایە ئەگەر هێندەی کەسانی دی کە شتانی تر باس دەکەن، بمانتوانیایە پێغەمبەری ئازدار باس بکەین -کە بەداخەوە نەمانتوانیوە- بەو ئەندازەیەی کەسانی تر دەخرێنە پێش چاو و برەویان پێ دەدرێت، زەمینە بسازایە بۆ ڕۆشنایی خستنەسەر لایەنەکانی کەسایەتیی ئەو سەروەرە، هونەر و گشت یەکە و دامەزراوەکانی ژیان بۆ ناساندنی ئەو سەفەربەر بکرانایە، ئەوا ئەوکات لە دەروونی ئەوەکانی ئەمڕۆدا تەنها ئەو تەختی دادەنا و دڵەکانیش تەنها بۆ

ئەو لێیان دەدا.. سەرەڕای هەموو ئەمانە، و ئێستا لە خۆرهەڵات و خۆرئاوای دنیادا، ڕۆژ دوای ڕۆژ مرۆڤەکان هەریەکە و بە گۆزەکەی دەستییەوە بەرەو ئەو سەرچاوە سازگار و خاوێنە ڕادەکەن کە بە "منهل العذب المورود" ناوی دەبەم و کۆششی ئەوە دەکەن بگەنە مەنزڵی ئەو سوڵتانەی کە تاج لەسەری خۆرەکان دەنێت.

بەڵێ، ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا، لەپێشی هەمووشیانەوە ئەمریکا، بەریتانیا، فەرەنسا و ئەڵمانیا، تێبینیی بووژانەوەیەك دەکەین ڕووەو ئەو. لە زۆر جێشدا موسڵمانان بە تەشیی دەستیانەوە سەرگەرمی ڕستنی بنەماکانی بەرنامەکەی ئەون و نەخش و نیگاری ناسك و دڵڕفێنی تایبەت بە ئیسلام دەچنن، هەر دەڵێیت ڕۆحیەتی "عەصری سەعادەت" سەرلەنوێ لەنێو موسڵماناندا زیندووبووەتەوە. باروودۆخی جیهانی ئیسلامیش جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەمەدا نییە... ئەو بەشەری ئەوانەی یەك دوو سەدە لەمەوبەر بەبێ هیچ داوەرییەکی ژیری و هەروەها بە ساکاری هاتبوونە ڕیزی موسڵمانانەوە، ئەمڕۆ چینێکی ڕۆشنبیر و خوێندەواری وا هاتووەتە مەیدان کە لێکۆڵینەوەی زانستییانەی ڕەهەندەکانی ئیسلام دەکات و لەژێر شەبەنگی پرشنگداری ڕاستدا شوێن پێی حەزرەتی محەممەدی (عليه الصلاة والسلام) هەڵگرتووە... ئەوانەش کە تا دوێنێ توێژی خوێندەوارانیان بۆ مەرامی خۆیان بەکاردەهێنا و زانکۆ و مەڵبەندەکانی فێربوونیان کردبووە شوێنکەوتەی تاقمێك "....یزم" و دەزگا نیشتمانییەکانیشیان بۆ بەرژەوەندیی کوفر وەگەڕخستبوو، لەمەودوا هەروەك توانەوەی شەختە سەهۆڵینەکان، یەك لەدوای یەك دەتوێنەوە و بەخێرایی بەرەو رسول الله (عَلَيهِ أَفضَلُ الصَّلاةِ وَأَتَمُّ التَّسلِيمِ) دەکەونەڕێ.

ئەوانەی چەندەها ساڵە هەزارەها جار شوێنیان گۆڕی و وێڵی لقێکن خۆیانی

پێوە ڕاگیر بکەن. ئەوانەش کە وا لەم سیستەم بۆ ئەو سیستەم و لەم ڕێباز بۆ ئەو ڕێباز لە هەناسەبڕکێدان، زوو بێت یا درەنگ، مایەپووچی و بێ ناکامیی کرد و کۆششەکانیان دەبینن و بەپرتاو بەرەو مەکتەبەکەی حەزرەتی محەممەد (عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) ڕادەکەن. ئەو مەکتەبەی کە هەرگیز نشوستی بەخۆیەوە نەدیوە. ئەوە "مۆریس بۆکای" و "ڕۆجێ گارودی" و چەندەهای تری نەناسراویش...

بەڵام داخۆ ئێمە وەك پێویست ئەو "سوڵتانی دڵان"ەمان ناسیوە کە سوڵتانەکان فێری سوڵتانداری دەکات؟ جا بۆچی ئێوە سەغڵەت بکەم! ئایا منێك کە لە پێنج ساڵییەوە سەرم لە سوجدەدایە و خۆم بە "قطمیر"[1]ی گەردن بەستراوی دەرگانەکەی دەزانم، توانیومە بەتەواوی بیناسێنم؟ یاخود تا چەند سەرکەوتوو بووم لە گەیاندنی ئەوەی کە دەیزانم؟ جا بۆیە لێرەدا ڕووی گوفتارم دەکەمە هەموو ئەوانەی وان لە مەقامی ناساندنی ئەودا و خۆشم دەخەمە ڕیزیانەوە و دەڵێم: ئایا توانیومانە ئەو سەروەرەی کە شاهی تەختی دڵانە بەشێوەیەك کە شایانی قەدر و قیمەتی بێت، بە مرۆڤی ئەم سەردەمە بناسێنین و بڵێسەی تاسە و شەیدایی لە ناخیاندا تاو بدەین؟..

نەخێر! ئەگەر مرۆڤایەتی ئەوی بناسیایە، دەبووە مەجنوونی و دەیدایە ئەو کەژ و هەردە، هەرکاتیش یادی شیرینی ئەو ڕۆژەکانی پێچابا، دڵی دەکەوتە جۆش و چاوەکانی ئەسرینیان بۆ دەڕشت. جا ئەودەم بۆ چوونە نێو جیهانی پاکی پێغەمبەرایەتییەکەیەوە دەکەوتە پەرواز و لەپێناو گیان بەبەرداکردنەوەی خۆڵەمێشی دڵەی سووتاوی کە لەتاو عەشقی ئەو گڕی سەندبوو خۆی دەدایە بەر شنەی با تا بەرەو هەوارگەی ئەوینی ئەو ڕاپێچی بکات...

لەکاتێکدا ئادەمیزاد هێندەی ئاشنایی و ناسینی خۆشەویستی ئاڕاستەی

---

١. قطمیر ئەو ناوەیە کە لە سەگەکەی "أصحاب الکهف" نراوە.

شتان دەکات، بەرامبەر ئەو شتانەش کە نایزانێت و ئاشنایی نییە، هەردەم جۆرێك لە دوژمنایەتی نواندووە. هەربۆیە ئەو خاڵەی کە دوژمنان بەدرێژایی تەمەنیان هەوڵی خۆیانی تێدا چڕدەکەنەوە، بریتییە لە سڕینەوەی "نامی جەلیلی محەممەدی" لە یادگەکاندا و گۆشکردنی نەوەی نوێ لەسەر دوژمنایەتیکردنی فەخری کائینات (عَلَيهِ أفضَلُ صَلاةٍ وَسَلَام). بەڵام ئەوە چ درەوشانەوەیەکی لوتفئامێزە کە سەرەڕای خواستی دوژمنان بۆ ڕیشەکەنکردنی ناوی ئەو لە دەروونەکاندا، کەچی وا ئەمڕۆ تێکڕای بەربەستەکانی گەیشتن بەو تەی کراون! ئەخوازەڵا لاوان، کە وەك دڵخۆشیی ئەو کەسەی لە بیاباندا خەریك بووبێت لە تینواندا بمرێت، کەچی لە پڕێکدا و بەشێوەیەك کە هەرگیز چاوەڕوانی نەکردبێت لە پەنای سەریدا ئاوێکی سازگاری کەوسەرئاسای دەستکەوتبێت. ئاوەها بەو چەشنە خۆیان هەڵدەدەنە ئامێزی پڕ سۆزی ئەو ئازدارەوە. بێگومان ئەو سینە پڕ سۆز و میهرەش لە ئامێزیان دەگرێت و هەرگیز ئەو کەسانە بێبەش ناکات کە بەرەو لای دێن.

نازانم قەت سەرنجی ئەو کەسانەتان داوە کە لە ڕۆژانی هەینیدا مزگەوتەکان سەرڕێژ دەکەن؟ ئەگەر بەوردی سەرنجتان دابێت، ئەوا بینیوتانە کە زۆربەیان لە گەنجانن. داخۆ دەبێت ئەو پاڵنەرە چی بێت کە لەبەرامبەر پەلکێشکاریی بەرنامە بۆداڕێژراوی نەوەکان بۆ ناو گێژاوی ترسناکی گومڕایی و سەرکەشیدا، وای لەو گەنجانە کردبێت کە بەبێ گوێدانە ساردوسڕی زستان و لەگەڵ ئەوەشدا کە هەڵدەلەرزن لە سەرمادا، دەستنوێژ بگرن و لە ناهەموارترین هەلومەرجدا بەرەو مزگەوتەکان هەنگاو بنێن؟ گەر پێتان باش بێت من وەڵام دەدەمەوە: ئەوە جازیبەی قودسیی حەزرەتی محەممەدە...

ئەگەر عەقڵ و هەستەکانیشمان هەرگیز پەیی پێ نەبەن، ئەوا دەروونەکان

بوونەتە پەروانەی دەوری ئەو شەمعە، ئەو خۆرە.. لە داهاتوویەکی زۆر نزیکیشدا ئەو عەقڵە دەربەدەر و پەرێشانانەی کە تا ئێستا نەیانتوانیوە بەرەو ئەو بدەنە پرتاو و بەورنەی مێشی زستان لەملاو ئەولادا پەکیان کەوتووە، بۆ ئەم حاڵەیان دەستی پەشیمانی دەگەزن و بە خۆیان دەڵێن "ئاخ و داخ! ئێمە بۆ نەبووینە پەروانە و بەرەو ئەو نەڕۆیشتین؟" بەڵام ئەوکات لەوانەیە بۆ هەندێکیان زۆر درەنگ بووبێت و هەموو شتێك کۆتایی هاتبێت...

جیهان بەهەڵەداوان بەرەو لای ئەو دێت. ئەوەتا ناوەندە زانستی و ئەکادیمییەکان لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن و ئەو دەروونانەش کە بەڕووی جیهانی فیکردا واڵان، شوێنی دەکەون و زۆرێکیش لەوانەی کە تا ڕۆژانێك لەبەرەی دوژمنانیدا بوون، وا ئێستا دەبنە دۆستی زۆر نزیکی و دەچنە داڵدەی ئەوەوە، هەروەك بەڕاستیش چوون... ئیدی ئەمڕۆ تەنانەت بە پێوانە و کێشانەکانی بەرەی بەرامبەریش حەزرەتی محەممەد (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) سەنگی خۆی هەیە و ئەوانیش دان دەنێن بە قەدر و گەورەییەکەیدا... پێغەمبەری خوا لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: "بە دە کەس لە ئوممەتەکەم کێشرام، من سەنگینتر دەرچووم. ئەوجا بە سەد، لەپاشان بە هەزار کەس کێشرام، دیسان هەر من سەنگینتر بووم. لەبەرامبەر ئەمەدا، ئەو دوو مەلائیکەتەی بەم کارە ڕاسپێررابوون، وتیان: وازبهێنە، خۆ ئەگەر بە هەموو ئوممەتەکەشی بکێشرێت، هێشتا هەر ئەم قورستر دەبێت."[1] جا خۆ ئەوەش هاتەدی. پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یەکێك لەو خەونانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دیویەتی "لە تایەکی تەرازوودا من و لە تاکەی تریشیدا هەموو ئوممەتەکەم دانرا، من سەنگینتر بووم."[2]

---

١. سنن الدارمي، المقدمة ٣؛ البزار، المسند ٤٣٧/٩؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ٢٥٥/٨.

٢. أحمد بن حنبل، المسند ٧٦/٢؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ٥٨/٩.

بەڵێ. ئەگەر سەرجەم ئەصحاب و تابیعین و شوێنکەوتووانی تابیعین و ئەوانەی دوای ئەوانیش و ئەو کەسایەتییە مەزنانەش کە تا ڕۆژی قیامەت دێن و ئەو خواناسانەش کە ڕێچکەی چوونە نێو دڵانیان دۆزیوەتەوە و تێکڕای ئەولیا و ئەصفیا و موقەررەبین، هەر هەموویان لە تای تەرازوویەکدا دابنرێن، ئەوا دیسان سوڵتانی دڵان، نووری چاوان قورستر دەبێت. ئاخر چۆن نا! لەکاتێکدا بوون لەبەر حورمەتی ڕووی ئەو بەدیهێنراوە.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هۆی بەدیهاتنی بوونەوەرانە. لە وتەیەکدا کە وەك فەرمووده ناوبانگی دەرکردووە، بەمجۆرە باسکراوە "لَوْلَاكَ لَوْلَاكَ مَا خَلَقْتُ الْأَفْلَاكَ" "ئەگەر تۆ نەبوویتایە، بوونم بەدی نەدەهێنا."[1] بەڵێ وایە. نووسینی کتێبێك کە تێگەیشتنی مەحاڵ بێت، کارێکی بێهودەیە. خوای گەورەش لە هەموو کارێکی بێهودە و بەهەواتە پاك و بێگەردە. بەمجۆرە، زۆر پێویست بوو ڕابەرێکی دەنگ زوڵاڵی وەك سەرداری زەمان و مەکان، حەزرەتی عالی مەقام (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بێت و واتای دێڕەکانی گەردوون ڕوون بکاتەوە. ئەمە وێڕای ئەوەی کە بوونی ڕاڤەکار و ڕاگەیەنەرێك زۆر پێویست بوو تا ئەوەی ڕاستییەکانی پشت پەردەی بوون ئاشکرا بکات. هەروەها ئەو مرۆڤەی کە گەردوونی بۆ بن، بە خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی ناویەوە بۆ خزمەتی ڕامکراوە، ئاگادار بکاتەوە لەوەی کە لە کوێوە هاتووە.. بۆ کوێ دەڕوات و.. ئامزەدی چ شتێکە... کەوابێ، ئەگەر ئەو نەبووایە، گەردوونیش و مرۆڤیش هیچ مانایەکیان نەدەبوو... بەڵێ، حەزرەتی محەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەو مرۆڤەیە کە واتای بۆ شتان گەڕاندەوە. ئەو لە نازدارترین خۆشەویست خۆشەویستترە لامان.

---

١. علي القاري، الأسرار المرفوعة ٣٨٥؛ العجلوني، كشف الخفاء ٢/٢١٤.

لێرەدا -لەگەڵ داننانم بەوەی کە خۆم بە گوناهبارترینی باوەڕداران دەزانم- هەستێکم هەیە بەبێ باسکردنی تێناپەڕم. نیازیشم لە گێڕانەوەی ئەوەیە کە: ئەگەر من تا ئەو ڕادەیە پێغەمبەری خوام خۆشبوێت، کێ دەزانێت مەشخەڵی ئەوینی ئەو لەو دڵانەدا کە لێهاتنیان هەیە، تا چ پلەیەك بڵێسەی سەندووە!.. بۆیە دەبێت لەم سۆنگەیەوە بڕوانرێتە ئەو حاڵەتە ڕۆحییەی دەیگێڕمەوە. دەنا، پێم شەرمە لە حوزوورتاندا باسی شتێك بکەم کە پەیوەندی بە خۆمەوە هەبێت.

ئەو کاتەی خوای گەورە بە نسیبی کردم دەموچاوی گوناهکارم بسووم بەو خاکە پیرۆزەدا، شارەکەی پێغەمبەری خوا هێندە درەوشاوە بوو لەلام و چێژێکی ڕۆحی وام چەشت، ئەگەر لەوکاتەدا -بە فەرزی مەحاڵ- لە هەموو دەروازەکانی بەهەشتەوە بانگهێشت بکرامایە، باوەڕبکەن نەدەچووم بۆ هیچ کامیان و مانەوەم لە شارەکەی رسول الله (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)دا هەڵدەبژارد. لەڕاستیدا بەهەشت ئاوات و ئارەزووی هەموومانە. تاکە موسڵمانێکیش نییە ئەم ئاواتەی نەبێت. ئەی مەگەر هەموو بەیانی و ئێوارانێك لە دوعاکانماندا لە پەروەردگار ناپاڕێینەوە کە پەنامان بدات لە دۆزەخ و بمانخاتە بەهەشتەکەیەوە؟ لەگەڵ داننانم بە هەموو ئەمانەدا، دەڵێم: ئەگەر لەوکاتەدا بانگ بکرامایە بۆ بەدەستهێنانی ئەو پایە بەرزەی کە لە دواڕۆژدا بەدەستدێت، لەوانەیە مۆڵەتم لە پەروەردگارم بخواستایە و عەرزی ئارەزووی مانەوەم بکردایە لە ڕەوزەی پاکی رسول الله (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)دا. تکا دەکەم وا گومان نەبەن بەمانە شایستەیی و لێهاتوویی خۆم بۆ ئەو مەقامە بەرزانە دەربڕیبێت، بەڵکو تەنها ویستوومە ئاماژەیەك بۆ ئەو خۆشەویستییە بکەم کە بۆ پێغەمبەری خوا هەمە. گەرنا، بەدرێژایی ژیانم لەو کەسانە بووم کە دوعا دەکەن و دەپاڕێنەوە تا خوای گەورە شەرەفمەندیان بکات بەوەی ببنە کۆیلەی گەردنبەندی بچووکترین

هاوەڵی پێغەمبەری خوا. زۆرجاریش ئەم دوعایە ویردی سەر زوبانمان بووە "پەروەردگارا، بۆ ساتێکیش بێت لە خولیای دەموچاو سووین بە تۆزی بەر پێیان بەدوورمان مەگرە." ئامین.

لە "ماڵی خوا"شدا ئاخم لەهەمان جۆش و خرۆش تەژی بوو. لەوانەیە ئەمانە هەست و ئەستی هاوبەشی هەموومان بن. ماوەتەوە بڵێم؛ ئەوانەی پڕاوپڕی ئەم هەستانە دەژین، تەنها من و چەند کەسێکی هاوشێوەی من نین، بەڵکو پێغەمبەری خوا (صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّمْ) شەیدا و ئەویندارى وای هەیە، ئەم حاڵەتە ڕۆحییەی من گێڕامەوە. بەلای ئەوانەوە زۆر کرچوکاڵ و سەرەتایی دەبێت.

جا مادەم باس گەیشتە ئێرە، پێم خۆشە بیرەوەرییەکی تریشتان عەرز بکەم: لەگەڵ کاک عارف حیکمەت کە ئەو کات ئەندام پەرلەمان بوو لە حەج پێکەوە بووین. کاک عارف پەیمانی دابوو کە "ئەگەر بچمە مەدینە، شەرت بێت وەك گوێدرێژ لە خۆڵەکەیدا خۆم بگەوزێنم." جا هەر کە پێی نایە خاکی مەدینەوە، پەیمانەکەی هێنایەجێ. ئەوەبوو ئەو ڕۆحە بەرزە خۆی لە خۆڵدا گەوزاند و تەپاوتلی تێدا دەکرد. لێرە و لەوێ هەرکات ئەو دیمەنەم دێتەوە یاد، خۆم پێ ناگیرێت و چاوانم پڕ دەبن لە فرمێسك.

حەزرەتی محەممەد (عَلَیهِ الصَّلاةُ وَالسَّلاَمْ) پێغەمبەرە. بەڵام پێغەمبەرێك کە گشت پێغەمبەرانی پێش خۆی لە مناری پێغەمبەرایەتییانەوە مزگێنی هاتنیان داوە. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەو پەیمانەمان بۆ تۆمار دەکات کە لە سەرجەم پێغەمبەرانی وەرگرتووە سەبارەت بە باوەڕهێنان و پشتیوانیکردنی ئەو پێغەمبەرەی کە خۆیان مژدەی هاتنیان داوە:

﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾ (آل عمران: ٨١)

"(بهێنەرەوە یادیان) کاتێك خوا پەیمانی لە یەکە یەکەی پێغەمبەران وەرگرت. کاتێك کتێب و دانایی پێبەخشین بەوەی کە ئەگەر: لە ئایندەدا پێغەمبەرێکم بۆ رەوانەکردن و بەڕاستدانەری ئەوەی ئێوەش بوو ئەوە دەبێت باوەڕی پێ بهێنن و پشتگیری بکەن. ئنجا خوا فەرمووی: ئایا بڕیارتاندا و پەیمانی منتان بەوجۆرە وەرگرت کە پێم ڕاگەیاندن؟ وتیان: بڕیارماندا (و هەروا دەکەین). ئەوسا خوا پێی فەرموون: دەی بەشایەت بن و منیش لەگەڵتان یەکێکم لە شایەتەکان."

ئیتر ئەو پێغەمبەرانەش لەو پەیمانەیاندا کە بە پەروەردگاریان دابوو ڕاستگۆ بوون و لە هەموو جوڵە و کردەوەیەکیاندا لەو چوارچێوەیەدا مانەوە. ئەوەتا کاتێك سەروەرمان میعراجی کرد، هەموویان بە ڕۆحیانەت لەدوایەوە نوێژیان کرد.[1] بەڵێ. وەك بڵێیت هەموو پێغەمبەران (عَلَيهِمُ السَّلَام) لە پێشەکی هەمووشیانەوە؛ حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی نوح و حەزرەتی موسا و حەزرەتی عیسا دەیانویست ببنە بانگبێژ و قامەتخوێنی. حەزرەتی مەسیح لە ئینجیلدا ئەو پێغەمبەرە قەدربەرزەی دەخستە بەرچاو و دەیوت "من دەڕۆم تا سەرداری زەمان بێت."[2] بەڵێ، ئەودەمەی بەرەو ئاسمان بڵند بووەوە، دامێنی ئاسمانەکان پڕبوون لە گەوهەر و ئەستێرەکان بەوێنەی بەردی سەر ڕێ لەژێر پێیدا ڕاخران. کاتێکیش خۆر گەیشتە ئاسۆکەی حەزرەتی محەممەد (عَلَيهِ أَفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام)، خولیا و سەودای سەری بوویووە ئەوەی ببێتە گەوهەرێك لە تاجەکەی

١. صحيح مسلم، الإيمان ٢٧٨.

٢. يوحنا، باب ١٦، ڕستەی ٧-١٥.

موستەفادا. بەڵێ، هەموو ئەمانە وەك پەروانە بەدەوری پێغەمبەرایەتییەكەیدا پەرواز بووبوون و دەسووڕانەوە. ئیتر لەمانەوە چی دەربچێت!

لەتاو شەمعەی نووری ئەحمەد جوبرەئیل بووە پەروانە
لەتاو جەماڵی نووری محەممەد مەلەك پەروانەئاسا
سەرگەرمی سووڕانە...

هاودەم لەتەك ئەمانەشدا، لە ڕوانگەی خەسڵەتە ئادەمییەكانیشەوە لە لوتكەدا بوو و ڕابەرایەتی و پێشەنگیی ئێمەی ئادەمیی دەكرد. بۆ نموونە؛ پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) سەرۆك خێزانێكی كاملی بێهاوتا بوو. ئەوەتا لە ماوەیەكی دیاریكراوی ژیانیدا، نۆ دانە ئافرەت لەژێر نیكاح و بەڕێوەبردنی ئەودا بوون.[1] لەگەڵ ئەمەشدا بواری نەدا لەنێوانیاندا هیچ جۆرە دەمەقاڵێ و بارگرژییەك ڕووبدات. جا ئەگەر ئەو ڕۆڵانەی لەو خانەیەدا -كە تنۆك تنۆك ئیكسیری ئەبوەتی لێ دەچۆڕێ- گۆش و پەروەردەكران، هەریەكەو بەسەر سەدەیەكدا دابەش بكرانایە، ئەوا دەبوونە موجتەهید و موجەددیدانێك، بەس بن بۆ ڕۆشنكردنەوەی ئەو سەدەیە. داخۆ دەبێت چەند كەس لەم ڕووەوە پێغەمبەری خوایان ناسیبێت!..

حەزرەتی فەخری عالەم (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لەهەمان كاتدا سەركردەیەكی سەربازیی بێوێنەش بوو. ئەوەتا بە مشتێك مرۆڤەوە كە وەك خەرمانەی مانگ دەوریان دابوو جەنگی بەرووی جیهاندا ڕاگەیاند و تەخت و سەرای چەندین گەورە سوڵتانی یەكسانی خاك كرد و چەندینی تریشیانی كردە بەندەی بەردەرگانەكەی. ئەمە لەكاتێكدا كە بە ڕواڵەت هونەر و زانستی جەنگی لە كەسەوە فێرنەبووبوو.

---

[1] البخاري، النكاح ٤، ١٠٢.

ئنجا پێغەمبەری نازدار (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەو مرۆڤە مەزنە بوو کە زانستەکان لای ئەو دەگەیشتنە پایان. دەتوت لە شاشەیەکدا تەماشای ئەو ڕووداوانە دەکات کە تا ڕۆژی قیامەت دێنە سەر شانۆی بوون یان هەروەك ئەوەی لە تۆمارێکی غەیبیدا بیانخوێنێتەوە. ئاوا لە یەك بەیەکیان دەدوا. تەنانەت دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو سەدەیەش بەسەر کۆچکردنیدا بۆ خانەی جاویدانی، کەچی وا ئەمڕۆ هەموو لایەکمان لەو کۆتا خاڵەدا کە زانست و تەکنەلۆجیای پێشکەوتووی سەردەم پێی گەیشتووە. ئەو بەیداخە شەکاوەیە دەبینین کە رسول اللّٰه (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) چواردە سەدە لەمەوپێش هەڵی کردووە.. ئیدی ئەوانەیان کە خوای گەورە هیدایەتی لەچارە نووسیون، "کەلیمەی قودسییەی تەییبە" دەهێنن و هەریەکێکیان دەبێتە ئەڵقەیەکی نوورین لە زنجیرە کاروانی موسڵماناندا. ئەمەش نموونەیەك لەنێو هەزاران نموونەدا:

لە کاسێتێکی ڤیدیۆییدا تەماشای دکتۆرێکی بەرەگەز کەنەدیم کرد کە ناوی "کیث مۆر" بوو. ئەم دکتۆرە، پسپۆڕی زانستی کۆرپەلەزانی و پرۆفیسۆری توێکارییە لە کۆلێژی پزیشکیی زانکۆی "تۆرۆنتۆ". مۆر کاتێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە گوێبیستی قۆناغەکانی گەشەی کۆرپەلە دەبێت لە سکی دایکدا، کە ڕاستییەکی زانستییە و تەنها لە ڕێگەی تەکنەلۆجیای پێشکەوتووی ئەم سەردەمەوە دۆزراوەتەوە، یەکسەر دەڵێت "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰه وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللّٰه" و بەمە تەسلیمییەتی خۆی بۆ پێغەمبەری خوا دەردەبڕێت. هەروەها زانایەکی فیسیۆلۆجی یابانیش کاتێك ئایەتەکانی قورئان سەبارەت بە بوارەکەی خۆی دەبینێت دەڵێت "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰه" -هەرچەندە لەسەر زاریشی گران بوو- و بۆ ساتێکیش چییە لە هاتنە ناو ئیسلام دوودڵ نابێت.

بەڵێ. هەروەك ئاشكرایە لەو شوێنەدا كە زانستەكان دەچەقن و پەكیان دەكەوێت، قورئانی پیرۆز چەندین دەروازەیان بە ڕوودا واڵا دەكات. كۆتا خاڵیش كە زانست و زانیاری پێی بگات، لەگەڵ خاڵی دەستپێكی پێغەمبەری خوادا یەكدەگرێتەوە. باشە، بەڵام كێ ئەمانەی فێركردووە؟ ئەو وانەی لە زاتی "العَلِیم" و "الخَبِیر"ەوە وەرگرتبوو و "موعەللیمی ئەزەلی" لەودیو ڕەحلەی تەدریسەكەیەوە بوو. هەربۆیە دەستی زەمەن نەگەیشتە چمكی مەعریفەتەكەی تا كۆنی بكات. بەڵكو بەپێچەوانەوە، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار پاراوتر و نوێتر دەبووەوە. هەتا دنیاش دنیا بێت هەر لە تازەبوونەوەدا دەبێت.

ئنجا حەزرەتی حبیب الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) بەشێوەیەك كە بۆ هیچ كەسێكی تر نەرەخسابێت، لەلایەن هاوەڵانییەوە خۆشدەویسترا. بۆ نموونە: لە كۆتایی ڕووداوی "ماء الرجیع"دا، كاتێك كافرانی دڵ پڕ لە قین "خوبەیبی كوڕی عەدی"یان ڕاپێچی پەتی سێدارە دەكرد، ئەم پرسیارەیان ئاڕاستەكرد "ئایا پێت خۆش بوو ئێستا محەممەد لە جێگەی تۆدا بووایە و تۆش لەناو ماڵ و منداڵی خۆتدا بە ئاسوودەیی ژیانت بەسەربېردایە؟" وەڵامی ئەم پرسیارە ڕوون و یەكلایی و بێپەروا بوو:

- نەخێر وەڵڵاهی، ڕازی نابم لەپای ڕزگاربوونی مندا، تەنانەت دڕكێكیش بچێت بە پێی پێغەمبەری خوادا.

جا لەپاش نواندنی ئەم تابلۆ مەردانەیە لەسەر سەكۆی سێدارە، حەزرەتی خوبەیب (رضيَ اللهُ عَنْهُ) دەستەكانی بەرز دەكاتەوە و دەڵێت "خوایە گیان، بەبێ ماڵئاوایی كردن لە خۆشەویستەكەت هاتم بۆ ئێرە. دەسا سەلامی منی پێ بگەیەنە." پێغەمبەری خوا كە لەوكاتەدا لەنێو ئەصحابدا دانیشتبوو و قسەی دەكرد، لەپڕ هەستایە سەرپێ و فەرمووی "سەلامی خوا لە تۆش ئەی

خوبەیب." کاتێکیش هاوەڵان پرسیاریان کرد، پێغەمبەری نازدار (عَلَیهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە چاوی پڕ فرمێسکەوە وەڵامی دانەوە "موشریکەکان خوبەیبیان شەهیدکرد. لە دواساتەکانیدا سەلامی بۆ ناردم، منیش وەڵامی سەلامەکەیم دایەوە."[1]

دیمەنێکی تر کە تا ئێستاش دڵگوشادی دەبەخشێتە دەروونی هەموو ئیماندارێک: کاتێک حەزرەتی "سومەیرا" لە غەزای ئوحوددا دەنگۆی شەهیدکردنی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَیهِ) دەبیستێت، دەستبەجێ خۆی دەگەیەنێتە دامێنی چیای ئوحود... جا کە لەوێ پێی دەڵێن "باوکت".. "مێردەکەت".. "کوڕەکانت" شەهیدبوون و تەرمەکانیانی پیشان دەدرێت، ئەم شێرەژنە گوێ بە هیچ کام لەمانە نادات و بەملاو ئەولادا هەر بەدوای پێغەمبەری خوادا دەگەڕێت و لەبەرخۆیەوە ورتەی دێت و دەڵێت "رسول الله چی بەسەر هاتووە؟" ئنجا کە شوێنی پێغەمبەری خوای پێ نیشان دەدەن، بە ڕاکردن بەرەو ئەو شوێنە دەڕوات و لەبەردەم پێغەمبەری خوادا خۆی دەدات بە زەویدا و دەڵێت " كُلُّ مُصِيبَةٍ بَعْدَكَ جَلَلٌ (ئیتر هەر ئەوەندەی کە تۆ لە ژیاندایت، هەرچی بەڵا و موسیبەت هەیە سووک و بێ ئەرزشە!)"[2] بەڵێ، رسول الله (عَلَیهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ئا بەو شێوەیە جێی خۆی لە دڵ و دەروونەکاندا کردبووەوە.

نموونەیەکی تر: مەردی ئاسۆکان لەودیوی ئاسمانەکانەوە بانگهێشتکرابوو. ئیدی وادەی جێهێشتنی ئەو دۆستانە هاتبووە پێش کە بیست و سێ ساڵ پێکەوەییان هەبوو. هەربۆیە لە دوا ڕۆژەکانی تەمەنیدا کەمێک بە دڵتەنگی و خەفەتەوە دەچووە لای هاوەڵانی. ئەم حاڵەتەی پێغەمبەری خوا هێندە کاری لە هاوەڵان دەکرد و هەستی دەبزواندن، کاتێک پێغەمبەر (صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّمَ)

---

١. سعيد بن منصور، السنن ٣٤٩/٢؛ الطبراني، المعجم الكبير ٢٦٠/٥؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٦٦/٤.
٢. ابن هشام، السيرة النبوية ٥٠/٤؛ الطبري، تاريخ الأمم و الملوك ٧٤/٢؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ١١٥/٦.

دەچووەوە خانەی سەعادەتی، دەتوت لە سینەی هەر یەکێکیاندا شنەی خەزان هەڵی کردووە. ئەوەبوو هاوەڵی بەڕێز موعازی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه) لەلایەن پێغەمبەری خواوە ڕاسپێررابوو کە بچێت بۆ یەمەن. ئیتر ئەویش لەو نێوانەدا هاتوچۆی دەکرد. کاتێك دەڕۆیشت پەیامەکانی پێغەمبەری دەبرد. لە گەڕانەوەشدا ئەو مەسەلە و گرفتانەی دەهێنا کە چاوەڕوانی چارەسەر بوون. بەرلەوەی دوایەمین گەشتی ئەنجام بدات، چووە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داوای دوعای لێ کرد. ئنجا بەرێ کەوت. بەڵام ئەمجارەیان جیاواز لە جارانی پێشوو حەزرەت پێی فەرموو "لەسەر خێر بڕۆیت ئەی موعاز. بەڵام ئەم جارەیان لەگەڕانەوەتدا لەوانەیە تەنها بتوانیت سەردانی مزگەوتەکەم و گۆڕەکەم بکەیت." ئەم چەند وشەیە بروسکەیەك بوو و دای لە حەزرەتی موعاز. لە پەلوپۆ کەوت و فرمێسك لە چاوانی داباریێن. دەتوت ئەژنۆی شکاوە. چوون بۆ یەمەن بە لایەك، تەنانەت توانای نەبوو لە شوێنی خۆیشی هەستێت.[1]

لەلایەکی ترەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەروەك موو لە ماست دەربهێنێت، ئاوەها بەئاسانی سەرجەم ئەو گرفت و کێشانەی چارەسەر دەکرد کە تایبەت بوون بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە. "بێرنارد شۆ" کە سیازدە سەدە دوای ئەو هاتووە، تەنها یەکێکە لەو سەدان مرۆڤەی بەرەی بەرامبەر کە بەم وتانەی خوارەوەی ئەم ڕاستییەی قبووڵکردووە "مرۆڤایەتی چەندە ناتاجی ئەو حەزرەتی محەممەدەیە کە هەموو کێشە و گرفتە کەڵەکەبووەکانی ئەم چەرخەی بە وێنەی سانایی خواردنەوەی کوپێك قاوە چارەسەر دەکرد." فەزیلەت و گەورەیی ئەوەیە کە دوژمنیش دانی پێدا بنێت.

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٢٣٥/٥؛ البزار، المسند ٩١/٧-٩٢؛ إبن حبان، الصحيح ٤١٤/٢؛ الطبراني، المعجم الكبير ١٢١/٢٠.

بەڵێ، ئەو کاتەی مرۆڤایەتی بۆ لای حەزرەتی محەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) دەگەڕێتەوە، بە ئاسوودەیی و دڵنیایی شاد دەبێتەوە. ئیتر ئەوکات، دەستی دەگاتە ئاسۆ پرشنگەکان و لە دەربەدەری و گاڵتەجاڕیی دەستی ڕۆژگار و پەژموردەیی دنیا و ئاخیرەت ڕزگاری دەبێت و بەرەو ئاسمانی مرۆڤایەتی بەرز دەبێتەوە. تەنانەت لەگەڵ کۆسپ و ڕێگریی هەموو هێزە نەیارەکانیشدا، سروەی ئەم دووەمین بووژانەوەیە هەڵی کردووە. ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ۝ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴾

(الصف: ٨-٩)

"ئەوانە دەیانەوێت بە فووی دەم نووری خوا بکوژێننەوە!! (خەیاڵیان خاوە) خوا نووری خۆی (ئایینی خۆی) تەواو دەکات و دەیچەسپێنێت. هەرچەندە کافر و بێبڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێشیان ناخۆش بێت. هەر ئەو خوایە پێغەمبەرەکەی خۆی ڕەوانەکردووە هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموویی و ئایینی حەق و ڕاستیدا، تا سەری بخات بەسەر هەموو ئایین و بەرنامەکاندا. هەرچەندە هاوەڵپەیداکەرانیش پێیان ناخۆش بێت."

بەڵێ، خوای گەورە دینەکەی خۆی سەردەخات. سینە و دڵە ئاتاجەکانیش کەمەندکێشی دەبن و بەختەوەری و دڵنیایی خۆیان لەودا دەبیننەوە و دەگەنە ئاستێك، هەر لە دنیادا وا دەزانن چوونەتە بەهەشتەوە. جا کافر و ستەمکارانی دنیای ئەولا و مونافیقانی ئاسیاش کە لەپێناو بەرژەوەندیی خۆیاندا مرۆڤەکان دەقۆزنەوە و بێئاگایانی ناوخۆشمان، پێیان خۆش بێت یان نا، ڕۆژێك دێت ئەو شاهی شاهانەی کە لەلایەن پێغەمبەرانەوە بە "سوڵتانی ئەنبیا" ناسراوە و ڕۆژی پێنج جار ناوی پڕشکۆی بەگوێی جیهاندا دەدرێت، دەچێتە نێو گشت دڵەکانەوە و دەبێتە خۆشەویست و لەدڵداهەڵگیراوی هەموو لایەك.

ئەو لەهەمان کاتدا کانگای دڵنیایی و ئارامییە. ئێمە باوەڕی تەواومان هەیە بەوەی کە ئەو پەیامەی ئەو هێناویەتی، لەهەمان کاتدا سەرچاوەی ئاسوودەیی و دڵنیاییشە. گەورەترین شاهیدی ئەم ڕاستییەش مێژووە. تاکە ڕێگەی دووبارە چەشتنەوەی ئەم ئارامییەش بە مرۆڤایەتی، بریتییە لە ناساندنی ئەو سەروەرە و ئەو نوورەی کە هێناویەتی. چونکە هەرکات مرۆڤایەتی چاکتر ئەو پێغەمبەرەی ناسی، خۆشەویستی بۆی زیاتر دەبێت و لە سایەی ئەو خۆشەویستییەشدا سیمای کۆمەڵگە دەگۆڕرێت.[1]

جا لە چوارچێوەی ئەم پێشەکییەدا کە پێشینان بە "دیباجە" ناویان دەبرد، پشت ئەستوور بە لوتف و کەرەمی پەروەردگار، هەوڵماندا بەکورتی چەند شتێکی پێرست ئاسا دەربارەی ڕەهەندە جیاوازەکانی سەروەری هەردوو جیهان، مایەی شانازی بوونەوەران عەرز بکەین.

لەڕاستیدا هەر وتەیەك باس لەو بکات جوان و شیرینە. ئەوەش کە جوان و پەسەند نییە، دەبێت بدرێتە پاڵ دەربڕین و شێوازەکەی. جا ئەگەر لە دەربڕین و شێوازدا کەموکورتییەك هەبێت، ئەوا بەتەواوەتی بۆ من دەگەڕێتەوە. ئەوەشی تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، تەنها و تەنها جوانییە.

---

١. حەزرەتی عەلی (رضيَ اللهُ عَنْهُ) بەمشێوەیە باسی پێغەمبەری خوای دەکرد: مَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ "هەرکەس ئەکارە بەرزەکانی- بزانیایە و تێکەڵاوی بکردایە، ئەوی -لە هەموو شتێك- خۆشتر دەویست." الترمذي، المناقب ٨؛ إبن أبي شيبة، المصنف ٦/٣٢٨؛ البيهقي، شعب الإيمان ٢/١٥٠.

## أ. پێغەمبەر؛ فەرماندەی سەربازی

### ١. جیهاد و ئامانجەکانی

خوای گەورە بۆ ماوەیەك دەرگای جیهادی ماددی بەڕووی پێغەمبەردا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەکردەوە. ئەمەش تا چەند ساڵێك هەروا درێژەی کێشا، چونکە سروشتی کارەکە ئەمەی دەخواست و هەموو شتێك کاتێکی دیاریکراوی هەبوو. پاش ئەو ماوەیەش خوای گەورە دەرگای خەباتی ڕەوا و بەکارهێنانی هێزی بەڕوودا واڵاکردن و پێی فەرموون "ئێستا کاتی ئەوەتان هاتووە بەرگری لە خۆتان و مافەکانتان بکەن."[١]

پێش ئەوەی بچینە ناو ئەم بابەتە قووڵ و فراوانەوە، پێم باشە لەسەر چەند خاڵێك بوەستین کە بوونەتە جێی پرسیار لەلای هەندێك:

بەرلەوەش دەرگا لەسەر ڕەهەندی فەتانەتی پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لە بواری جەنگ و بەڕێوەبردنی سوپادا بکەینەوە، باسێك لەو زەمەن و هەلومەرجە دەکەین کە تێیدا فەرمانی جیهاد بە سەروەرمان کراوە. لەلایەکەوە تێگەیشتن لە چەمکی جیهاد بەشێوە گشتییەکەی و، لەلایەکی تریشەوە زانینی مێژووی دەستپێکی جیهادی ماددی -واتە فەرماندان بە جەنگ- گرنگیی خۆی هەیە. چونکە شێواندنی ئەم چەمکە لەلایەن دوژمنانی ئایینەوە و، تێکەڵکردنی کات و زەمینەکانیشی لەلایەن دۆستانی نەزانەوە، بەردەوام لێڵی لە هزرەکاندا دروستکردووە. بۆیە بڕوام وایە پێویست بکات چەند شتێك بۆ هەردوولا ڕوون بکەینەوە.

---

١. سورەتی الحج، ئایەتی ٣٩-٤٠.

سەرداری پێغەمبەران (صَلَوَاتُ اللهِ عَلَيْهِ) بەدرێژایی ژیانی تاڵە موویەك لە بنەماکانی ئیسلام لای نەداوە، سەرتاپای ژیانی پیرۆزی بریتی بووە لە پیادە و بەکردەکردنی ئیسلام و دابەزاندنی بۆ ناو واقیعی ژیان. ئەمە هاوکات دەچەسپێت بەسەر بابەتی جیهادیشدا، هەروەك چۆن دەچەسپێت بەسەر گشت بابەت و بوارەکانی تریشدا.

## أ. بەرگری

ئیسلام ڕێگەی داوە بە هەموو تاك و نەتەوەیەك مافی بەرگری کردنیان لە خۆیان هەبێت دژی هەرکەسێك کە هەڕەشە لە قەوارە و بوونیان بکات و هەوڵی کوشتن و قڕکردنیان بدات، بگرە هەندێکجار فەرمانیشی پێ دەکات. ئەگەر کەسێك ویستی پەلاماری خۆت، سامانت، ژیانت، ئایینت، یان ئابڕوو و ناموست بدات، ئەوا دەبێت لەڕوویدا بووەستیتەوە و سەنگەری لێ بگریت. بۆ نموونە، با بڵێین دەوڵەتێك سنووری وڵاتەکەتی بەزاند و هاتە ناو سنوور و خاکەکەتەوە، ئەو کات چی دەکەیت؟ یان ئەگەر هاتوو لەناوخۆدا کەسانێکی بەکرێگیراوی لە دژت جوڵاند، چی بە خەیاڵتدا دێت؟ ئەگەر هاوئایینەکانت لە پارچەیەك لە پارچەکانی سەرزەویدا دووچاری ستەم و دەستدرێژی بوونەوە، تۆ چۆن هەڵسوکەوت دەکەیت؟ بەدڵنیاییەوە لە ئاست ئەو پێشهاتانەدا ناڵێیت "هیچ" و، بێباکانە ڕەفتار ناکەیت..

لە ڕوانگەی ئەم خاڵەوە، بەر لە چواردە سەدە پێش ئێستا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وەك بنەمایەك مامەڵەی لەگەڵ بەکارهێنانی هێزدا کردووە و ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەگەر موسڵمان بیەوێت ژیانێکی سەربەرز

و موسڵمانانە بژی، ئەوا دەبێت لەکاتی پێویستدا لەپاڵ حیکمەتدا هێز و، هاوشانی ئیرشاد و ئامۆژگاریش توانای سەربازی بخاتە گەڕ بەمەش ڕێگای ژیانی شەڕەفمەندانەی نیشانداوە.

بەڵێ، موسڵمان دەبێت خاوەن هێز بێت و هێزیش بخاتە خزمەت حەقەوە. ئیدی ئەودەم دەتوانێت دەنگی خۆی بدات بە گوێی جیهاندا و، زایەڵەی دەنگە ناسازەکان کپ بکات و، ببێتە سومبولی هاوسەنگی لە هاوکێشە جیهانییەکاندا.

## ب. وەستاندنی ستەم

خەڵکێکی زۆر هەن لەم جیهانەدا دووچاری ستەم و چەوساندنەوە دەبنەوە. ڕەنگە لەمڕۆدا پێمان وابێت لەڕێی پەنادانی ئەو خەڵکە ستەمدیدەیە و بەدەستهێنانی هەندێك دەستکەوت لەسەر ئاستی سیاسیدا، بتوانین ئەوجۆرە کێشانە چارەسەر بکەین. تا ڕادەیەکی دیاریکراو ئەمە بە شتێکی ئەقڵگیر دادەنرێت. بەڵێ، ئامێزمان دەکەینەوە بۆ برایانمان لە ئەتەوە و ئاییندا و هەوڵ دەدەین بە قوربانیدانی خۆمان هەندێك لە کێشەکانیان چارەسەر بکەین، بەڵام نازانم بەمجۆرە مامەڵەیە لە چەندا چەندی گرفت و قەیرانەکان چارەسەر دەبن؟ هەر لە نزیك خۆماندا نزیکەی ملیۆن و نیوێك تا دوو ملیۆن کەس دووچاری ستەم و چەوساندنەوە بوون و، پیادەکردنی دروشمە ئیسلامییەکان و تەنانەت بەکارهێنانی ناوی ئیسلامیشیان لێ قەدەغەکراوە. خۆ ئەگەر ئێمە باوەش بۆ نیو ملیۆنیشیان بکەینەوە، ئەوا ملیۆنێك یان زیاتر لەوێ هەر لەژێر چەپۆکی ستەمدا دەمێننەوە.

جا ئەگەر ئێمە دەستەوسان بین لە چارەسەری کێشەیەکی بچووکی دەوڵەتێکی بچووکدا، ئیتر چۆن دەتوانین مامەڵە لەگەڵ ئەو کێشە و ململانێ جیهانییانەدا بکەین کە لە نزیکەوە پەیوەندییان پێمانەوە هەیە؟! کەواتە پێویستە دەوڵەتێکی وەها لە گۆڕێدا بێت، هەموو لایەك بەهەندی وەربگرن؛ کاتێك ناوچاوی گرژکرد یان تووڕەبوو، خەڵکانی تر هۆشیان بەبەردابێتەوە و سنووری خۆیان بیر بکەوێتەوە. جا بۆیە بوونی هێزێکی لەوجۆرە کە سام بخاتە دڵی دوژمن و بە هانای چەوسێنراوانەوە بچێت و حەق و حەقیقەت بچەسپێنێت و ناحەقی لەناوبەرێت، لە هەموو کات و سەردەمێکدا پێویستە. ئەمەش بەوە دەبێت کە جاروبار دەست و بازووی ئەم هێزە بەکردەیی پیشان بدرێت، وەك ئەوەی لە رابردوودا ڕوویداوە.

ئەو دەمەی موسڵمانان لە هاوسەنگییە نێودەوڵەتییەکاندا سەنگیان هەبوو، هەرئەوەندەی جاڕدرا "وا کاروانی کەشتیەکانی سوڵتانی بەرەو ئۆقیانووسی هیندی دەڕوات." ئەم بانگەوازە بەس بوو بۆ ئەوەی ئینگلتەرا چاوترس ببێت و دەست هەڵبگرێت لە خولیای داگیرکردنی هیندستان. بەڵێ، لەو سەردەمەدا لەنێو کایە جیهانیەکاندا خاوەنی سەنگێکی لەم شێوەیە بووین هەر بۆیە لە فەرەنساوە تاوەکو هیندستان لە سایەی سەنگ و ڕۆڵی دادوەریمان، ستەملێکراوان و چەوساوان پەنایان بۆ دەهێنایین تاکو مافیان بۆ بسێنینەوە و ستەمیش شەرمەزار بکەین.

بەڵێ، لە ئیسلامدا جەنگ بۆ ئەوە بەرەوا بینراوە تاکو ببێتە فریاگوزار و دالدەی چەوساوە و زەبوونان و لانەواز و بێلانەکان. جا ئەگەر بڕواداران نەبنە فریادڕەس، ئیدی بەجێهێنانی ئەم ئەرکە لە کێ چاوەڕێ دەکرێت؟ خوا لەسەر زەویدا ئێمەی بە ئەرکی چەسپاندنی حەق و ڕاستی ڕاسپاردووە، بۆیە پێویستە

گەیشتن بەو خاڵە بە ئامانجی بوونمان بزانین و هەوڵ بدەین پێی بگەین وە گەرنا ستەم و زۆرداری هەروا درێژە دەکێشێت.

## ج. ئازادیی بانگەواز

ئەگەر ئاستەنگ خرایە نێوان ئازادی و حەق و ڕاستی و بڵاوکردنەوەی ڕێگەی ڕاستەوە، ئیسلام ڕێگەمان پێ دەدات بجەنگین لەپێناو پاراستن و مسۆگەرکردنی ئەو ئازادییانەدا. تکا دەکەم سەرنج بدەن: لە پێناو بڵاوکردنەوەی حەق و حەقیقەت جەنگ بەرپا ناکرێت! بەڵکو ئەگەر ڕێگری کرا لە ئازادیی بڵاوکردنەوەی حەق و حەقیقەت ئەوکاتە پەنا دەبرێتە بەر جەنگ.

بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلامەتی. مەردانی بواری عیرفان و بانگەوازکارە لێبڕاوەکانتان دەنێرن بە هەموو لایەکی دنیادا. بەڵام ئەگەر کەسانێك کۆسپ و تەگەرەیان دروستکرد، ئەوکات هەوڵ دەدەن ئەو کۆسپانە لەڕێ لابدەن. چونکە ئەو کارەی ئەوان دەبێتە ڕێگر لەوەی خەڵکی بە ویستی ئازادی خۆیان بچنە بەهەشتەوە. ئێوە بۆ پاراستنی ئازادیی بیروباوەڕ هەوڵ دەدەن و، بە ئەندازەی لادانی بەرهەڵستی و لەمپەرەکان ئاینەکەتان بڵاو دەکەنەوە. ئەگەر جەنگیشت بەرپاکرد بۆ پاراستنی ئازادی، (کە دەکرێت ئەمە بەخاڵی چوارەم دابنێین) پێویستە بەو جەنگە ڕێز و پایەی مرۆڤایەتی زامدار نەکەیت و، پەلاماری منداڵ و ئافرەت و پەرستگا و ئەوانە نەدەیت کە کەناریان گرتووە بۆ خواپەرستی و لەگەڵ ئەوانەشدا کە چەکیان لەدژ هەڵنەگرتوون ناجەنگن.

لای هەمووان ئاشکرایە کە دۆخی ئێستا چەندە لەخوار ئەو ئاستەوەیە. جا نازانم دەستەواژەی "لەخوار ئەو ئاستەوەیە" بەس بێت بۆ وێناکردنی ئەدگاری

ئەوانەی بۆمبی ناوەکییان بەسەر شارە پڕ لە دانیشتووانەکاندا بەردایەوە؟ وا نازانم! ئەوەتا لە ڕابردوویەکی نزیکدا بۆمبی ناوەکییان تەقاندەوە بەسەر شاری "هیرۆشیما و ناکازاکی"دا و، نزیکەی (٨٠) هەزار مرۆڤی بێتاوانیان کوشت و دەیان هەزار زامدار و کەمئەندام و پەککەوتەشیان خستەوە. ئەو لایەنەشی ئەم کارەی ئەنجامدا، دنیایەکی شارستانی بوو!

ئێستاش بڕوانن بۆ ئەزموونی پەیڕەوانی ئیسلام! کاتێك پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و جێنشینەکانی سەرکردەیەکیان دەنارد بۆ جەنگ، فەرمانیان پێ دەکرد پیر و منداڵ و ئافرەت نەکوژن و، توخنی ئەو ڕەبەنانە نەکەون کە لە خەڵوەتگادا پەرستش دەکەن. هەروەها پەرستگا نەڕووخێنن و دار و درەخت نەبڕنەوە و دەست نەبەن بۆ ئاژەڵ و، ماڵ و سەروەتی خەڵکی بەهەدەر نەدەن.[1] ئێستا دەپرسم: داخۆ کەسانێك کە ڕێگەیان داوە دڕندانە چەکی کۆکوژ بەکاربهێنرێت، دەتوانن ڕەچاوی ئەو بنەمایانە بکەن؟

ئەوجا وەرن تەماشای ئەو کەلێنە بکەن کە لە نەبوونی کەسانی باوەڕدار لەنێو هاوکێشەکاندا هاتووەتە مەیدان، ئینجا ئەگەر پێتان خۆشە بگرین یان ئاخ و حەسرەت هەڵبکێشن! خۆزیا ئێمە لەبری یەکێك لەو زلهێزانە بووینایە! هەرچۆنێك بێت ئەو هەموو ستەم و ئەشکەنجەیە نەدەبینرا!...

ئێستا ڕووی گوفتارم دەکەمە ئێوە: ئەگەر تەنها لەبەر ئەم ئاکامەش بێت مەگەر نەدەبوو فەرمانبەریی جیهاد بەجێ بهێنرایە؟ بەڵێ، هەموو ئەمانە ئەوە دەهێنن ملی ڕێیان بۆ بگرینە بەر و لە پێناویاندا تێبکۆشین. دەی هەر ئەمەشە وای کرد سەردارمان بەردەوام ڕێبواری ئەو ڕێگەیە بێت.

---

١. صحيح مسلم، الجهاد ٣؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٠٠/١؛ البيهقي، السنن الكبرى ٨٥/٩، ٩٠.

ئەم بابەتە قووڵ و فراوانەمان لە کتێبێکی سەربەخۆدا کە تایبەتە بە جیهاد شرۆڤەکردووە، بۆیە لێرەدا بەو ئەندازەیە وازدەهێنین و خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو سەرچاوەیە دەکەین.[1]

بەدرێژایی قۆناغی مەککە پێغەمبەری نازدارمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هەڵنەستاوە بە هیچ جۆرە بەرەنگاری یاخود خەباتێکی ماددی. هەمیشە ئامۆژگاری پەیڕەوانی دەکرد تا خۆگر و دامەزراو و ئارامگربن. ئەوەی لەم قۆناغەدا بەرچاو دەکەوێت پەنابردنە بەر دەستووره ئەڵماسییەکانی قورئانی پیرۆزە. هەوڵ و ماندووبوونی چواردە ساڵەی ئەوەبوو بچێتە دڵانەوە و تەختی خۆشەویستی لە دەروونەکاندا دابنێت. بەڵێ، سیازدە ساڵی ڕەبەق لە مەککەدا بە پەیڤە پیرۆزەکانی، کە خەڵووزیان دەگۆڕی بۆ ئەڵماس و خۆڵیش بۆ ئاڵتوون، پەیامی خۆڕاگری و بەربەرچنەدانەوەی دا بە گوێی هاوەڵانیدا. ئەگەر ئازاریان بدایە ئەو ئازاری نەدەدانەوە. ئەگەر جنێویان پێ بدایە، ئەو بەربەرچی نەدەدانەوە. بەڵکو بە ئارامی و حەوسەڵەیەکی بێسنوورەوە دۆڵ و ساراکانی ئازار و مەینەتی دەدایە بەر. لەپێش چاویدا باوەڕدارانی ئازار دەدران و دەکوژران، کەچی ئەو سەرباری ئازارە بێئەندازەکانی خۆی، ئازاری ئەوانیشی لە سینەیدا دەچەشت. بۆ نموونە؛ کە بتپەرستەکان جۆرەها ئازاریان بەسەر خانەوادەی یاسردا دەباراند، پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) بەلایاندا تێدەپەڕی و دڵی دەدانەوە:

«صَبْراً يَا آلَ يَاسِرٍ فَإِنَّ مَوْعِدَكُمُ الجَنَّةُ»

"ئارام بن خانەوادەی یاسر، ژووان و مۆڵەتم لەگەڵ ئێوە لە بەهەشتدایە."[2]

---

١. محمد فەتحوڵلا گولەن، ڕۆح و حەقیقەتی جیهاد لە ئیسلامدا.

٢. الحاكم، المستدرك ٤٢٣/٣؛ البيهقي، شعب الإيمان ٢٣٩/٢، إبن هشام، السيرة النبوية ١٦٢/٢.

ئەو (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) لە لوتكەی ئارامی و خۆڕاگریدا بوو، كەچی ڕق و كینەی خوانەناسان تا دەهات ئەستوورتر دەبوو.. هەر بەوەشەوە نەوەستان، نەخشەیان بۆ شتی تریش داڕشتبوو: بەنیازبوون بە یەكجارەكی باوەڕداران لە مەككە وەدەرنێن و ناچار بەكۆچیان بكەن. بەڵێ، لە زێد و نیشتمانیان كە ساڵەهای ساڵ بوو بەسەربەرزی تیایدا دەژیان، لەماڵ و منداڵیان دوور دەخرانەوە و كۆچی زۆرە ملێیان پێ دەكرا. دواجار موسڵمانان دەستیان كرد بە كۆچ. هاوەڵان یەك لەدوای یەك مەككەیان جێ دەهێشت حەزرەتی عومەر یەكێك بوو لەوانە. بەڵام كۆچی ئەو كۆچێكی پڕ لە ئاسۆر بوو، چونكە خێزان و منداڵەكانی لەگەڵدا نەبوو، خۆی بەتەنیا كۆچی دەكرد.[1] ئەوەش تاكە ڕێگەچارە بوو. كە حەزرەتی ئەبوبەكریش توێشووی كۆچی دا بەشاندا. -لەو فیداكارییە بڕوانن- عائیشەی كچی -كە هەمیشە بە "دایكمان" بانگی دەكەین و یادی بەرز ڕادەگرین- لەگەڵیدا نەبوو. ئەگەرچی هێشتا كیژێكی بچووكیش بوو، دەبێت لەكوێ بووبێت؟ لەڕاستیدا نازانین، چونكە هەر بەوجۆرە دەیانتوانی كۆچ بكەن، جگە لەوەش بژاردەیەكی تریان لەبەردەمدا نەبوو.

بەڵێ، هەمووان دەستیان لە نیشتمان و خانە و لانەیان هەڵگرت و ناچاربوون كۆچ بكەن. ڕۆژێكیان ئەبوجەهل و عوتبەی كوڕی ڕەبیعە و عەباسی كوڕی عەبدولموتەلیب چوونە سەربانی ماڵی ئیبن جەحش. بە بینینی ئەو ماڵە چۆڵ و ڕوخاوە، عوتبە فرمێسك تزایە چاوانی. ئەبوجەهلیش ڕووی كردە عەبباس و وتی "برازاكەی تۆ بوو هەموو ئەمانەی بەسەر هێناین."[2]

نەخێر، هەرگیز پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) بەرپرسیار نەبوو لەوە،

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٢٢٧/٣؛ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٢٧١/٣.

٢. الهيثمي، مجمع الزوائد ٦٣/٦-٦٤؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٣١٨/٢-٣١٩.

ئەوە تاوانێك بوو لە ئەستۆی ئەو ستەمكار و زۆردارانەدا بوو كە ئەو خەڵكە بێتاوانەیان لە خاك و نیشتمانیان دەرپەڕاند. بگرە دەستی ڕەشی ستەمیان گەیشتە ئاژەڵەكانیشیان. فرمێسكی بێباوەڕ بۆ ئەو ستەمە بوو كە بە دەستی خۆی ئەنجامی دابوو.

موسڵمانەكان ناچاربوون بێ هیچ ئازووقە و توێشوویەك و لە قرچەی گەرمای بیاباندا ڕێگەیەك ببڕن كە ماوەكەی نزیكەی (٥٠٠كم) دەبوو. بڕینی ئەو ماوەیە لەو ڕۆژگارەدا مانگێكی ڕەبەقی دەخایاند. مانگێك هەر بەو جلانەی بەریانەوە ڕێیان دەكرد. جلوبەرگ بەهەرحاڵ. هەر خوا خۆی دەزانێ لەو ماوەیەدا چییان خواردووە! ئەم مرۆڤانە -كە دواتر بە سەربەرزییەوە لە مەدینەی مونەووەرەدا ژیانیان دەبردە سەر- ناچاربوون پەنا ببەنە بەر برا ئەنصارەكانیان لە خەڵكی مەدینە.

لەو ئازارە یەك لەسەر یەكانە بڕوانن! بەڵام ئەو كۆمەڵە قودسییە بێ ئەوەی ناڵەیەكیان لێ ببیسترێت خویان دەدایە ژێرباری ئەو ئازارانە. بۆچی؟ ئاخر چونكە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێیدەفەرموون "ئارام بگرن و خۆڕاگر بن، چونكە مەنزڵ و ژوانتان بەهەشتە."

سەروەری پێغەمبەران (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەگوێرەی فەرمانەكانی خوا ڕەفتاری دەكرد و ڕێی نەدەدا تۆزقاڵێك هەستبزوان و هەڵچوونی سۆزدارانە دەستوەربداتە ڕێكارەكانی. كەچی سەرباری ئەوەش هێشتا ئەفرین و تووڕەیی بەرەی بەرامبەر نەدەڕەوییەوە. بەڵێ، وا دیاربوو ستەم و ڕاگواستن و ئەشكەنجەی بێشومار بەس نەبوون بۆ دامركاندنەوەی داخی دڵی بتپەرستان. كار گەیشتە ئەوەی ڕۆژێكیان بڕیارێكی دوور لە هەموو بەها و ئەخلاقێكی مرۆڤانە بدەن:

"با دەست بەسەر موڵك و زەوی و زاری موسڵمانەکاندا بگرین و لەنێوان خۆماندا دابەشیان بکەین!"

سنووری ئەم پاوانخوازییە بە چەشنێك بوو کە پاش هەشت نۆ ساڵ پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەسەرکەوتوویی هاتە ناو مەککەوە، حەزرەتی ئوسامە (رضيَ اللّٰهُ عَنْهُ) لێی پرسی "ئەی پێغەمبەری خوا، لە کوێ نیشتەجێ دەبیت؟" ئەویش بە چاوی پڕ ئەسرینەوە وەڵامی دایەوە "جا بۆ عەقیل هیچ جێیەکی بۆ هێشتووینەتەوە؟!"[1] واتە ئەو سەروەرە بێبەش بوو لەوەی لە کونجێکی ئەو ماڵە پیرۆزەدا بحەوێتەوە کە تێیدا لەدایکبووبوو و منداڵیی تێدا بردبووە سەر. ئەو ماڵەی کە ئەمڕۆ وەك کتێبخانە بەکاردەهێنرێت. عەقیل گەورەترین منداڵی ئەبوتالیب بوو، هەتا ئەو ڕۆژەش کە موسڵمان بوو، دەستی هەڵنەگرت لە دوژمنایەتی چاکترین نەوەی ئادەم، وەك ئەوەی میراتگری بێت دەستی بەسەر سەرجەم دارایییەکەیدا گرتبوو. هەتا ڕۆژی موسوڵمان بوونی، خاوەن ڕۆحێك بوو بێبەش لە هەموو چەشنە وەفا و ئەمەکدارییەك.

عەبدوڵای کوڕی ئوبەی ی دووڕوو، ئەو باس و خواسەی مەککەی بە هەڵ زانی و لەناو بازاڕی مەدینەدا کردی بە هات و هاوار "هۆ موسڵمانان! بۆخۆتان لێرە پاڵتان لێداوەتەوە و لە مەککەش سەروەت و سامانتان تاڵان دەکرێت، خەڵکی لە بازاڕدا موڵکتان بەش دەکەن. ڕۆژێك دێت نە لێرە و نە لەوێش خاوەنی هیچ نابن."

ئەمەش جۆرێکی تر بوو لە زۆرداری. ئەوجا وەك بڵێیت ئەو هەموو ستەمە بەس نەبێت، ئەو دەمەی کاروانێکی بتپەرستان کە ماڵ و سامانی موسڵمانانی

---

١. صحيح البخاري، الجهاد ١٨٠؛ صحيح مسلم، الحج، ٤٣٩.

لەخۆ گرتبوو، بەرەو شام دەڕۆیشت، بە ئەنقەست لەنزیک مەدینەوە تێپەڕین، هەروەك بە موسڵمانان بڵێن "تەماشا بکەن و بۆخۆتان لە داخاندا بمرن!" بەوەش وازیان نەهێنا، بگرە لەپێش چاویانەوە وشتر و مەڕ و ماڵاتەکانیان لێ دەخوارین.

لە ڕاستیدا ئەوە سروشتی تاڵانخوازیی بێباوەڕی بوو. جا خۆ ئەوەی ئەمڕۆش بەچاوی خۆمان دەیبینین، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەوەی ئەو ڕۆژگارەدا نییە. عاکیفی شاعیر لە جێیەکدا دەڵێت "دەڵێن مێژوو دووبارە دەبێتەوە، جا گەر پەندی لێ وەربگیرایە، ئیدی چۆن دووبارە دەبووەوە؟" ئەوەتا دووبارە ستەم لەسەر ستەم.. باوەڕدار دووچاری ستەم و زۆرداری دەبێتەوە، ئەوەیشی دەیەوێت پشتیوانی بکات ئەویش تووشی ستەم دەبێتەوە. تەنگی پێ هەڵدەچنن و لە ماڵ و زێدی خۆی وەدەری دەنێن و مافی بوون و ژیانی لێ زەوت دەکەن...

ئێستا ڕێم بدەن جارێکی تر بپرسم: ئەگەر ئێوە لە جێگەی ئەواند. بوونایە، چیتان دەکرد؟ بیربکەنەوە کە بە هەزارەها لە هاوەڵان هەمان بیر و هەست مۆڵی دابوون و دەروونیان بریندار بوو. هەموو ڕۆژێك تیرێکیان ئاراستە دەکرا و زامیان دەکولێنرایەوە. خۆ ئەگەر ئاسمان لەوە زیاتر مۆڵەتی درێژ بکردایەتەوە و ڕێگەی نەدایە بە بەرهەڵستی، ئەوکات هەستیان بە دڵشکاوی دەکرد. هەربۆیە خۆری بەزەیی خوایی هەڵهات و هات بەهانایانەوە:

﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ﴾

(الحج: ٣٩-٤٠)

"مۆڵەتدراوە بەو باوەڕدارانەی شەڕیان پێ دەگێڕن کە بجەنگن و بەرهەڵستی بکەن، چونکە بەڕاستی ستەملێکراون. بێگومان خوا دەسەڵاتی هەیە کە سەریان بخات و سەرکەوتنیان پێ ببەخشێت. ئەوانەی کە بەناحەق لە وڵاتیان دەرکران، تەنها تاوانیان ئەوەبوو کە دەیانوت پەروەردگارمان "اللّه"یە."

بەڵێ، ئەوەی پێی دەوترا ستەم و چەوساندنەوە ئەوان دریغییان نەکرد، تەنانەت مافی ژیانیشیان لێ زەوتکردن. دەی وا ئێستا مۆڵەتی بەرپەرچدانەوە دەدرا بەوانەی ساڵەهایە لەژێر فشاردا بوون، دووچاری مەینەتی بووبوونەوە و هەوڵی کوشتنیان درابوو. ڕواڵەتی گشتیی حوکمەکەش ئەوەیە کە هیچ بڕوبیانوییەك لە ئارادا نەبوو بۆ دەرکردنی موسڵمانان لە زێدی باوباپیریان، جگە لەوەی کە دەیانوت پەروەردگارمان "اللّه"یە. واتە ئەوان دووچاری جۆرەها بەشخوراو بووبوونەوە؛ ژن و منداڵیان بەجێهێشتبوو و وەك کۆیلە ژێرپێ خرابوون، تەنانەت هەیانبوو (٧-٨) ساڵی تەواو کۆت و زنجیر کرابوو.

بۆیە دواجار بە مەبەستی پاراستنی مافی ستەملێکراو و چەوساوە و زنجیر لەپێ دراو و بێلانەکان، مۆڵەت درا بە جەنگ و بەکارهێنانی مافی بەرگریکردن. لەهەمان کاتیشدا ئەمە فەرماندان بوو بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) تاکو هەستێت بە ئەرکی جیهاد.

ئیسلام هەرگیز ئایینی شمشێر و خوێن نەبووە، وەك هەندێك لە دووڕووان و کافران بانگەشەی بۆ دەکەن. ڕاستە پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) شمشێری بەکارهێناوە، پێشتریش پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلَام) هەواڵی ئەم تایبەتمەندییەی ئەویان داوە. ئەوەتا حەزرەتی مەسیح (عَلَيْهِ السَّلَام) لە پەسنی ئەودا دەڵێت "ئەو شمشێری لەدەستدایە."[1] هەرکات پێویستی بکردایە دەجەنگا لەگەڵ ئەوانەی

---

١. القاضي عياض، الشفاء ٢٣٤/١-٢٣٥.

شایستەی بوون. پێش ئەویش پێغەمبەرێکی دی دەربارەی ئەو وتوویەتی "نالآکانی قودسیەکان لە پێشیانەوەیە" ئەوەتا ئەوان لەهار چوارلای دونیادا ئەو نالآیەیان شەکاندۆتەوە و لەژێریدا کۆبوونەتەوە و لە پێناوی حەق و ڕاستی تێدەکۆشن. بەڵێ، ئەو ڕۆحە موبارەك و واتا پیرۆزە لەسەر دەستی ئەوان لە سەرتاسەری گێتیدا دەشەکایەوە. ئیدی بەوجۆرە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەناو ئەو هەلومەرجەدا فەرمانی پێدرا بە جیهاد و خەبات دژی نەیارانی.

وەك ئەوەی بە سەرسەختە هاوچەرخەکانی بڵێت "ئێوە ناتوانن ڕێ لە ئازادیی بیروباوەڕ بگرن. مافی ئەوەتان نییە ئەو ڕێڕەوانە دابخەن کە بەرەو مرۆڤایەتی دەڕۆن." ئێمە تاوەکو ئێستاش چەپڵە بۆ شۆڕشی فەرەنسا لێ دەدەین کە تابلۆی هەزاران دڕندەیی و نەفامییە و بە دەروازەی ئازادی دادەنێین. لەکاتێکدا ئەو شۆڕشە چەندین دیمەنی کوشتار و سەربڕینی هەزاران کەسی نمایشکردووە. تا ئەوەی لە کۆتاییدا هەرخۆی سەری خۆی خوارد. ئەوەبوو "ڕۆبیس پییەر" کە فەرمانی هەڵواسینی "دانتۆن"ی دەرکردبوو، لێی پرسی "دوایین ئاواتت چییە؟" دانتۆن بەمجۆرە وەڵامی دایەوە "هیچ ئاواتێکم نییە، هەرچۆنێك بێت سەری من و سەری تۆدواجار دەکەونە نێو هەمان تەنەکە خۆڵەوە."

ئەوە ڕووی ڕاستەقینەی ئەو کودەتایەیە کە وتیان دەروازەکانی ئازادی خستووەتە سەرپشت! کەس لە پەتی سێدارە ڕزگاری نەبوو. یەکەمجار شا و دار و دەستەکەی، بەدواشیدا خەڵکانی تر...

کەچی لەولاوە دەبینین پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چواردە سەدە لەوەوبەر بە

دەستی نوورپەخشی خۆی کە چین چینی تارماییەکانی پەرت پەرت دەکرد، هەستاوە بە بنەبڕکردنی ستەمکاری و خەڵاتکردنی مرۆڤایەتی بە ئازادی. بەهاناوەچوونی ستەملێکراو و بەشخوراو ئەرکی سەرشانتانە، ئاخر خۆ ناکرێت بۆخۆتان پاڵی لێ بدەنەوە و وەك ئەوەی گوێ لە ئاوازی نەی بگرن، ئاوەها خەریکی گوێگرتن بن لە ئاهوناڵەی ژێردەستان! خۆ ئەگەر هیچ ڕێگەیەکی دیکە لەئارادا نەبوو بۆ چەسپاندنی حەقیقەت و ڕاماڵینی ستەم جگە لەوەی پەنا ببەیتە بەر هێز، ئەوکات دەبێت لە چوارچێوەی ڕێگەپێدراو و ڕەوادا پەنای بۆ بەریت. ئاشکرایە کە ئەمە لەم ڕۆژگارەدا لە توانای ئێمە بەدەرە، بەڵام کە ساتەوەختی بەکارهێنانی هێز و هەلومەرجی لەبار هاتەکایەوە، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) نەخشەی بۆ داڕشت و چووە مەیدان. لەپاڵ ئەوەشدا، ستراتیژی جەنگیی حەزرەت هێندە دروست و ژیرانە بوو کە کۆی ئەوانەی لە سەردەمی پێغەمبەردا لەبەرەی موسڵماناندا گیانیان لەدەستداوە، تەنها سەد و ئەوەندە کەس دەبن. کەچی بەتەنیا ژمارەی قوربانیانی جەنگی جیهانیی دووەم، لە ئاکامی ململانێی نێوان هەردوو بەرەوە زیاتر لە چل ملیۆن قوربانی بووە. هەروەها بۆئەوەی ڕژێمێکی ناڕەوا و نامرۆڤانە لە ڕووسیا دابمەزرێت، نزیکەی سەد ملیۆن مرۆڤ کوژران. ژمارەی قوربانیان هێندە لە ئەندازە بەدەر بوو، هەروەك بڵێیت کەشتی بەسەر خوێنیاندا خرایە ڕێ و، لە ئێسکی سەریان تەلار و باڵەخانە بنیات نرا. ئامانجیش ئەوەبوو بەو تەلارە بڵێن "ڕژێمی نوێ".. ئەو ڕژێمەش ناوی شیوعییەت بوو..

"لە دڕندەییدا مرۆڤەکان مردووخۆریان تێپەڕاندبوو،

مرۆیەك بێ ددان بووایە، هەر براکانی خۆی دەیانخوارد."

سا ئەو ڕژێمانەی لە ئارەزووبازیی مرۆڤەوە سەرچاوەیان گرتووە بچن بە ئاخی زەویدا! ئەوەتا دەشچن.. هەرسیستەمێك ڕەچاوی سروشت و فیترەت نەكات و پاڵ نەداتەوە بە حەقەوە و ڕێ نەدات بە ئەشونمای مافی تێیدا، چارەنووسی تیاچوون دەبێت.

بەڵێ، بەدرێژایی دە ساڵی دەورانی مەدینە، بە مەبەستی چەسپاندنی ڕاستییە لەژمارە نەهاتووەكان، چەندین پێكدادانی سەربازی لەگەڵ بەرەی كوفر ڕوویدا. لە تێكڕاشدا تەنها سەد و ئەوەندە كەس لە ڕیزی موسڵمانان شەهیدبوون. ژمارەی كوژراوانی لایەنی بەرامبەر نازانم. كەچی وەك لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، تەنها ژمارەی ئەوانەی لە جەنگی جیهانیی دووەمدا كوژراون، چل ملیۆن زیاتر دەبێت. ئەو ڕێژەیەش بریندارا‌ن و كەمئەندامان و ئەوانە ناگرێتەوە كە دواتر مردوون.

بۆیە دەتوانین بڵێین چاخی بەختەوەری، سەردەمی پەرەپێدانی ڕێزگرتن بووە لە مرۆڤایەتیی مرۆڤ و هزر و هەستەكانی. بانگەشەكارانی ئەمرۆی هیومانیزمیش هێشتا زۆریان ماوە بگەنەوە بەو ئاستۆیە، بگرە هەر پێشی ناگەنەوە. چونكە ئەو كەسەی ئەو شارێیەی كردووەتەوە، حەزرەتی محەممەدە (عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ). لەجیهانی ئەودا باوەڕدار بەگوێرەی ڕێنماییەكانی ئەو دەچێتە مەیدانی جەنگ، لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز دەرگاكانی ئاشتەوایی و ناوبژی داناخات. هەروەها سووكایەتی بە بەها مرۆییەكان ناكات و بەناحەق دەستی ناچێتە خوێنی كەس. هاوكات وڵاتان داگیر ناكات و سامان و موڵكی گەلان بەتاڵان نابات.

## د. له ئیسلامدا ئاشتەوایی بنچینەیە

زۆرینەی خۆرئاواییەکان نە لە ڕابردوو و نە لە ئێستادا ئەم بەها خواییانەیان نەناسیوە. لەبەرئەوە هەڵساون بە داگیرکردنی وڵاتان و دەستگرتن بەسەر سامانی سروشتیی ژێرزەوی و سەرزەوی گەلاندا. نەتەوەکانیان چەوساندووەتەوە و کردوویانن بە کۆیلەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان. لەو پێناوەدا جەنگاون. هەر لەبەرئەوەش خوێنیان ڕشتووە. ئامانجی ڕاستەقینەی پشت جەنگی بەڵقان و جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەم و جەنگی کەنداو و سۆماڵ هەر ئەمە بووە.

بەڵام جەنگ لە ئیسلامدا لەپێناو ئامانجێکی بەرز و دەستەبەرکردنی ئازادیی بیروباوەڕ و کردنەوەی ئەو دەروازانەدا بووە کە مرۆڤ دەگەیەنن بە بنەما گەردوونییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا هەرکات پێویستی کردبێت ڕێگەی ئاشتەوایی فەرامۆش نەکردووە. چونکە ئاشتی بنچینەیە و جەنگیش پاشکۆ و حاڵەتێکی نائاساییە:

﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾

(الانفال: ٦١)

"جا ئەگەر (دوژمنان) ئارەزوویان بۆ ئاشتی نواند و حەزیان پێکرد، ئەوا تۆش ئامادەیی خۆت دەرببڕە و پشت بە خوا ببەستە. چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و زانایە."

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾

(البقرة: ٢٠٨)

"ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، هەر هەمووتان خۆتان بخەنە ژێر سایەی ئیسلامەوە و بەتەواوی پەیڕەوی بکەن و شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون. چونکە بەڕاستی ئەو دوژمنی ئاشکراتانە."

ئەم ئایەتانە و هاوشێوەکانیان بانگی موسڵمانان دەکەن بۆ ئاشتی و ڕێککەوتن. داوایان لێ دەکات دادپەروەر و ڕاسترەو بن، با لە گەرمەی جەنگیشدا بن. بەڵام لە ڕژێم و ڕێسا مرۆڤکردەکاندا جەنگ گۆڕەپانی نمایشکردنی بازوو و کەڵبەیە، تەنانەت ڕێککەوتنیش جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ جەنگدا. ئەو ڕژێمانە لەژێر هەر ناو و ناونیشانێکدا بن، سەرەنجام هیچیان بەدەر نین لەوەی ڕژێمی شەیتانی و چەواشەکاریی گرۆی ئادەمی بن و مەبەستیان هەڵگیرساندنی ئاژاوە و پشێوی بێت. شەیتان ئەو ڕژێمانە دەڕازێنێتەوە و ئەشێوەی بریسکەدار و خەڵەتێنەردا بۆ فریودانی شوێنکەوتووانی دەری دەخات. چونکە ئەو دوژمنێکی ئاشکرای مرۆڤە. ڕەنگە ئەم کارەش بۆ ئەوە بکات تاوەکو لە هەوێنی خۆتان و فەلسەفەی مێژووییتان دوورتان بخاتەوە. بەڵێ، پێویستە ئیماندار هەمیشە ئاشتی و ڕێککەوتنی لەبەرچاو بێت، تەنانەت لە گەرمەی جەنگیشدا. لەوانەیە باوەڕداریش بکەوێتە جەنگەوە لەگەڵ باوەڕدار. بەڵام لێرەشدا دیسانەوە هەر ئاشتی و ئاشتەوایی!

﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾

(الحجرات: ٩)

"ئەگەر دوو دەستە لە موسڵمانان بوو بەشەڕیان، ئەوا دەستبەجێ هەوڵ بدەن ڕێکیان بخەن و ئاشتیان بکەنەوە. خۆ ئەگەر لایەکیان هەر دەستدرێژی دەکردە

سەر لایەکی تر، ئەوا ئێوە بەگژ ئەوەیاندا بچن کە ستەم و دەستدرێژی دەکات هەتا ئەوکاتەی دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خوا. جا ئەگەر لایەنە سەرکەشەکە سەری دانەنەواند بۆ فەرمانی خوا. ئەوا ئێوە ناوبژیوانییەکی دادگەرانە لەنێوانیاندا بکەن و دادپەروەری ئەنجام بدەن. چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کە دادپەروەری ئەنجام دەدەن."

ئەگەر دوو گرۆ لە ئیمانداران هەرا و ئاژاوە کەوتە نێوانیان، بەو هۆیەوە گەل و نیشتمان دووچاری مەترسیی پارچەپارچەبوون و دووبەرەکی بووەوە و، پشێوی بە هەموو لایەکی وڵاتدا تەشەنەی کرد، لە وەها حاڵەتێکدا پێویستە لێپرسینەوە لەوانە بکرێت کە شەڕ دەکەن، ئەگەرچی باوەڕداریش بن. پێویستە هەموو هەوڵ و تەقەلایەك بخرێتە گەڕ بۆ پاراستنی یەکڕیزیی کۆمەڵگە و یەکپارچەیی گەل و نیشتمان.

ئەمە فەرمایشتی قورئانە، کەچی بڕوانە ئێمە خەریکی چین؟ ڕابردووی نزیکمان ئەوەندە دڵخۆشکەر نییە. وتراوە "بێئومێدی کۆسپی بەردەم هەموو گەشە و کامڵبوونێکە." ئەوەی بکەوێتە داویەوە ئیدی ناتوانێت جارێکی دی ڕاست ببێتەوە.. زۆنگاوێکە هەرکەس تێی بکەوێت نوقم دەبێت. بەهەرحاڵ، لەگەڵ بوونی ئەو هەموو دارمان و پەرتەوازەییەدا، ئەستەمە هەموو یەکێکمان بتوانێت گەشبین بێت.

بەڵێ، باوەڕداران شایەتی خوان لەسەر زەویدا و، ماف و ڕەگەزی هاوسەنگیی نێو نەتەوەکان و زامنی تەبایی گشتین. بۆیە مافی خۆیانە لە پێناو مسۆگەرکردنی حەق و دادگەریدا دەستوەربدەنە هەموو شتێك. جا ئەگەر لە وڵاتی خۆیاندا یان لە هەر وڵاتێکی تردا ڕەوشی سەقامگیری و دادگەری تێکچوو، بەجۆرێك کە پێویستی بە دەستتێوەردان دەکرد و ئەوانیش توانای

ئەوەیان هەبوو، پێویستە لەسەریان لە پێناو دەستەبەرکردنی ئاسایش و ئارامی هەڵوێستی خۆیان هەبێت. ئەگەر بڕیاری دەستتێوەردان و جەنگ درا، ئیدی مانای وایە ئامانج ڕوونە و ئاڕاستەش ئاشکرایە. پشت بە خوا دەبەستیت و لەسەر ئەو ڕێگەیە بەردەوام دەبیت کە دەزانیت ڕێگەی حەقە. ئەی ئەوە نییە خوای گەورە سەبارەت بە دەرئەنجامە ناسۆرەکەی جەنگی ئوحود دەفەرموێت:

﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾ (آل عمران: ١٥٩)

"جا کە بڕیارت دا کارەکە بکەیت، پشت بە یارمەتیی خوا ببەستە."

بەڵێ، ئەگەر هۆکار و بارودۆخەکان پەلکێشیان کردیت بەرەو جیهادی ماددی، واتە ئەگەر ئاستەنگ خرایە نێوان تۆ و ئازادیت لە بڵاوکردنەوەی ئایینەکەت.. یان ئەگەر کەسێك نەبوو ئەو ستەمە بڕەوێنێتەوە کە بەسەر چەوساوە و ستەملێکراوانەوەیە و کەسیش نەبوو کۆتایی بە گریە و هەنسکیان بهێنێت.. یان لە حاڵێکدا کەسانێك هێز بەکاربهێنن بۆ ڕێگرتن لە پەخشکردنی حەقیقەت.. یاخود دەستدرێژییان کردە سەر نیشتمانت و هەڕەشەیان لە ژیانت کرد. ئا ئەوکاتە بۆت هەیە بچیتە مەیدان و بازووی جەنگ و تێکۆشانی لێ هەڵبکەیت.

## ٢. ئامادەكاری

كاتێك هەلومەرجەكان داخوازی ئەوەبوون بچیتە مەیدان، ئەوسا دەبێت بە باشترین شێوە خۆت ئامادە بكەیت. بێگومان لەپێش هەموو شتێكیشەوە ئامادەكاریی مەعنەوی دێت. شارەزایانی بواری سەربازی چاك دەزانن كە هێزی مەعنەوی چەندە ڕۆڵی گرنگ دەبینێت لە جەنگدا، بۆیە بایەخی تایبەتی پێدەدەن. بێگومان ئەو بزوێنەرەش كە دەبێتە سەرچاوە و قەڵای هێزی مەعنەوی، باوەڕە. كەسێك خاوەن باوەڕ نەبێت، چاوەڕێی شتێكی وای لێناكرێت لە مەیدانی جەنگدا.

### أ. وردەبەرزی

فەرموون با بچینە خزمەت چەپكێ لەو ئایەتانەی كە گیانی مەعنەویی باوەڕدار بەهێز دەكەن و سازی دەكەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن:

﴿ فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ ۚ وَمَن يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾

(النساء: ٧٤)

"دەبا بجەنگن لەپێناوی خوادا ئەوانەی ژیانی ئەم دونیا دەفرۆشن بە ژیانی ئەو دنیا. جا ئەوەی دەجەنگێت لە پێناوی خوادا، ئەگەر بكوژرێت و شەهید ببێت، یان سەركەوتن بەدەست بهێنێت، ئەوا لە ئایندەدا پاداشتی مەزن و بێ سنووری پێ دەبەخشین."

﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ ۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴾ (الأنفال: ٦٥)

"ئەی پێغەمبەر هانی ئیمانداران بدە لەسەر جەنگ (دژی ئەوانەی کە کۆسپن لەبەردەم گەیاندنی پەیامی خوا). ئەگەر بیست کەسی خۆڕاگر هەبێت لە ئێوە، ئەوا زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەسدا. خۆ ئەگەر سەد کەس لە ئێوە هەبن، ئەوا زاڵ دەبن بەسەر هەزار لەوانەی بێباوەڕن. چونکە بەڕاستی ئەوانە کەسانێکن تێناگەن (کە چ هێزێك پشتیوانی لە ئێوە دەکات)."

﴿ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً ﴾

(البقرة: ٢٤٩)

"چەندین دەستە و گرۆی کەمی وا هەن کە بە ئیزنی خوا بەسەر دەستە و گرۆی زۆردا سەرکەوتوون."

﴿ وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾

(آل عمران: ١٣٩)

"(ئەی ئیمانداران) کۆڵ مەدەن و سارد مەبنەوە و خەفەت مەخۆن. چونکە هەر ئێوە سەربەرز و سەرفراز و سەرکەوتووترن، بەو مەرجەی ئیمانداری چاك و ڕاست و دروست بن."

﴿ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ (الأعراف: ١٢٨)

"سەرەنجام و چارەنووس بۆ ئەوانەیە کە لە خوا دەترسن و پارێزکارن."

ئەو بنەما و دەستوورەی کە لەم ئایەتانەوە نمە دەکات بریتییە لە بڕگەی:

"الحَقُّ يَعْلُو وَلَا يُعْلَى عَلَيهِ"

"حەق هەمیشە بڵند و سەرکەوتووە و هیچ شتێك بەسەریدا سەرناکەوێت."

ئەمە ئەو هەستەیە کە دڵی باوەڕدار پڕ دەکات لەکاتێکدا کە ڕوو لە جەنگ دەکات، چونکە بەوە خۆی دەداتە پەنا قەڵای باوەڕ کە هەرگیز شووراکانی نابەزێنرێت.

جا لەم ڕوانگەیەوە کاتێك پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەربازە نەبەردەکانی ڕەوانەی سەنگەر دەکرد، بەردەوام واتای ئەو جۆرە باوەڕ و متمانەیەی دەخستە دڵیانەوە.

ئەوانە ئەو قارەمانانە بوون کە بە ئەندازەی پەرۆشیی دوژمنەکانیان بۆ ژیان، ئەوان پەرۆشی مەرگ بوون و بەرەو پیری دەچوون. چونکە دەیانزانی ئەو کلیلە ئەفسوناوییەیە کە دەرگاکانی بەهەشتیان بۆ دەکاتەوە. بۆیە بەردەوام دەیانوت "دەبێت لە کوێ بە خوێنی شەهیدی دەستنوێژ بگرم و بگەمە حزووری پەروەردگارم؟"

خولیایان ئەمە بوو و لە بەرەی جەنگدا خەویان بە شەهیدبوونەوە دەبینی. جا ئایا هیچ هێزێك هەیە بتوانێت لەبەردەم ئەمجۆرە کەسانەدا خۆی ڕابگرێت کە گاڵتەیان بە مردن دەهات؟ دوژمنان ئەوەیان دەبینی بۆیە هەر ئەوەندیان پێ دەکرا هەڵبێن.

## ب. هێزی باڵادەست

لایەنی گرنگی دووەم بریتییە لە لێبڕانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆئەوەی ئوممەتەکەی بکات بە هێزێك کە لەنێو هاوسەنگیی نێودەوڵەتیدا سەنگی هەبێت و جەمسەرێك بێت قسەی بڕوات. چونکە ئەگەر تۆ خۆت نەگەیەنیتە ئەو ئاستە، ئەوا پەراوێز دەخرێیت. بگرە لەوانەیە چەندین بڕیار دەربکرێت کە لە دژی تۆ بن و ناچاریش بکرێیت سەریان بۆ دابنەوێنیت.

هۆکاری سەرەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە تۆ هێز و قورسایی پێویستت نییە لەبەرامبەر زلهێزەکان و لەنێو هاوکێشە نێودەوڵەتییەکاندا. لەکاتێکدا خوای باڵادەست دەفەرمووێت:

﴿ وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴾ (النساء: ١٤١)

"دڵنیابن هەرگیز خوا ناهێڵێت بێباوەڕان بەسەر ئیمانداراندا دەستڕۆیشتوو بن و ڕیشەکەنیان بکەن."

واتە دەرچەیەك نییە بێباوەڕ بتوانێت لێیەوە بەرزتر بێت لە باوەڕدار. واتە نابێت هیچ کۆمەڵگەیەکی گاور یان جولەکە یان بتپەرست یان سەرمایەدار یان بێباوەڕ یان شیوعی، فەرمانڕەوایی کۆمەڵگەیەکی موسڵمان بکات.. هەر لەڕاستیشدا نەیانتوانیوە فەرمانڕەوایی موسڵمانە ڕاستەقینەکان بکەن. چونکە بە هیچ شێوەیەك خوا بەوە ڕازی نییە. وەك ئەوەی بفەرموویێت "من خۆم ئەو دەرگایانەم بەڕوویاندا داخستووە."

لە باوەڕدار ناوەشێتەوە لەژێر چەپۆك و زەبری کەسانی تردا ژیان بگوزەرێنێت و پشت بە غەیری خوا ببەستێت و وەك مشکی لێبێت بەدەست پشیلەوە.

بەڵێ، باوەڕداران چ لەسەر ئاستی تاك بێت یاخود گەل، کۆمەڵانێکن خاوەنی ئاکاری بەرزن و پێویستە هەر لەو بەرزی و بڵندییەشدا بمێننەوە. بۆیە دەبینیت پێغەمبەر (صَلَّىٰ ٱللَّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەخشەی ئەو ئامانجەی بۆ نەتەوەکەی کێشاوە، هەروەك پێیان بڵێت: ئاسۆی بەرزبوونەوەی ئێوە هیچ سنوورێك ناناسێت. جا ئەگەر ئێوە لەسەر زەویدا خاوەنی هێزێکی لەوجۆرە نەبن، ئەوا ژێرپێ دەکەون، یان هەروەك لەو فەرمودە پیرۆزەدا هاتووە کە ئەبوداود و ئەحمەد کوڕی حەنبەل ڕیوایەتی دەکەن "هاکا گەلان شاڵاو بدەن بەسەرتاندا، هەروەك کەسانێکی برسی و چڵێس بدەن بەسەر خوان و سفرەتاندا و خۆیان بکەن بە هاوبەشتان."[1] واتە پەلاماری خۆتان و ئەو سەروەت و سامانەش دەدەن کە

---

١. سنن أبي داود، الملاحم ٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ٥/٢٧٨.

پەروەردگار پێی بەخشیون. وەك چۆن کەسانی چاوبرسی و تێرنەخۆر پەلاماری خوانێك بدەن.

بە دەربڕینی ئەم ساتەوەختە: بۆ بەتاڵانبردنی نەوت و سەروەت و سامانی وڵاتانی وەك داغستان و سوریا و لیبیا و میسر، لە هەموو لایەکەوە دەدەن بەسەرتاندا.

دەبا ئێستا لە خۆمان بپرسین: باشە بۆچی هەموو ئەو کارەساتانەمان بەسەر هات؟ ئاخر ئێمە نەمانتوانی وەك گەل و کۆمەڵگە ئەو وزەیە بەگەڕ بخەین کە دەیگەیاندینە ئەو ئامانجەی حەزرەت بۆی دیاریکردبووین. ئەوەتا خوا لە شێوەی بەئاگاهێنانەوەدا پێمان دەفەرموێت:

﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴾

(الأنفال: ٦٠)

"هەرچی لە تواناتاندا هەیە بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام بیخەنە گەڕ و ئامادەی بکەن. وە لە ئامادەکردنی هەموو جۆرە ئەسپ (و هۆکارەکانی تری گواستنەوەدا) کەمتەرخەمی مەکەن. تا دوژمنانی خوا و دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکەن. با کەسانی تریش جگە لەم دوژمنانەی ئێستا، پێی چاوترسێن بن کە ئێستا ئێوە نازانن کێن و نایانناسن. بەڵکو هەر خوا خۆی دەیانناسێت. هەر شتێکیش ببەخشن لە پێناوی خوادا ئەوە جێی خۆی دەگرێت و بەهەموونتە ناڕوات و دەستان دەکەوێتەوە و ستەمتان لێ ناکرێت."

موسڵمانانی پێشین زۆرچاك لەو فەرمانە خواییە تێگەیشتبوون. مەولانای شبلی لە توێژینەوەی ژیاننامەی حەزرەتی عومەردا (رضيَ اللهُ عَنْهُ) دەڵێت "لەوکاتەدا کە لە هەموو لایەکەوە لەگەڵ نەیارەکانیدا دەستەویەخە دەبوو، سەرباری بەکارهێنانی ئەو هەموو ئەسپ و وشترە لە بەرەکانی جەنگدا، کەچی برێکی زۆر ئەسپی ئامادەکراوی هەبوو کە هێشتا بەشداری جەنگی پێ نەکردبوون." بۆ نموونە؛ لە کێڵگەیەکی دەرەوەی مەدینەدا (٤ هەزار) و، لە دەوروبەری سنوورەکانی سوریاشدا بەهەمان شێوە (٤ هەزار) ئەسپی تری ڕەسەنی عەرەبی بەخێو دەکرد. ئەمانە وەك یەدەك دانرابوون و بۆ کاتی ناچاری سوودیان لێ وەردەگیرا.[١]

کەوابوو ئەو کاتە بەگوێرەی ئەو دەسەڵات و توانایەی خوا پێی بەخشیبوون، خۆیان ساز و پڕچەك کردبوو. دەستەواژەی "الرباط" تێگەیشتنێکی لەوجۆرەش دەدات بەدەستەوە. چونکە بە واتایەکی تایبەتی تر، ڕیبات بریتییە لە سازکردن و تەرخانکردنی ڕەگەزە سەرەکییەکانی ئاژەڵ یاخود مرۆڤ لە پێناو مەبەستێکدا.

قورئانیش ئەو ئامانجەمان پیشان دەدات، هەروەك پێمان بڵێت: ئایین و زمان و ئابڕوو و ناموس و کەرامەت و زێد و نیشتمان و سەرجەم پیرۆزییەکانتان بپارێزن لەو دوژمنانەی کە بە چاوچنۆکی و ناپاکی و سوکایەتییەوە تەماشایان دەکەن. چەندێکیش هێزتان پێویستە بۆ بەرگری، ئامادەی بکەن و هەرگیز کەمتەرخەمی مەکەن لەو کارەدا. هیچ دەرفەتێك مەدەن بەدەست دوژمنەکانتانەوە بۆ ئەوەی نەبنە گەمە و داشی دەستیان.

---

١. مولانا الشبلي، حەزرەتی عومەر و بەڕێوەبردنی دەوڵەت، ٣٠٢.

## ج. پەنابردنە بەر شمشێر ئەگەر پێویست بکات

وەك چۆن قورئانی پیرۆز بە مەبەستی چەسپاندنی هاوسەنگی لەسەر زەویدا، حیکمەت و هێزی پێکەوە بەستووەتەوە، بەو شێوەیەش، حەزرەتی محەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) پێغەمبەرێکە بە فەرمانی جەنگەوە هاتووە. ئەوەتا تەورات و ئینجیل لە پەسنیدا دەڵێن "صَاحِبُ الْقَضِيب (خاوەنی شمشێرە)"[1] بەڵێ، ئەو زاتە هەڵدەستێت بە بڵاوکردنەوەی حەق و ڕاستی، بەڵام ئەگەر ڕێگری کرا لە گەیاندنی حەق و حەقیقەت، ئەوا هێز بەکاردەهێنێت و سوود لە شمشێر وەردەگرێت. ئەو لەهەمان کاتدا پێغەمبەری شمشێریشە.

جا لەبەرئەوەی پێغەمبەری شمشێریشە (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، بۆیە خوای باڵادەست لەسەر زاری قورئانەوە تەکنیك و ستراتیژی جەنگی فێرکردووە. لە ئایەتی (٤)ی سورەتی (الصف)دا قورئان پێی دەفەرمووێت:

﴿ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ ﴾ (الصف: ٤)

"بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کە دەجەنگن لە پێناو ڕێبازی خوادا بە یەك ڕیز و یەك پارچە و یەك دڵ، چونکە هەروەك کۆشکێکی بەرزی پتەوی داڕێژراون بە قورقوشم."

ڕێکخستنی ڕیزەکان بەوجۆرە تۆکمە و پتەوە، بەهێزترین قەڵغان بوو لەڕووی تێکشکاندنی هێڵەکانی بەرگری لەلایەن دوژمنەوە.. لەچاو هەلومەرجەکانی ئەو ڕۆژگارەشدا باشترین جۆری ڕێکخستن بووە. بەڵێ، دەبوو تاکەکان بە چەشنێکی ئەوتۆ پاڵ بدەن بەیەکەوە و شان لە شانی یەك توند بکەن. دوژمن

---

١. القاضي عياض، الشفاء ١/٢٣٤-٢٣٥.

هەر بە بینینی دیمەنی یەکریزی و پێکەوەییان زەندەقی بچێت! پێغەمبەریش (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) ئەم شێوازە لە خواوە فێربووبوو و لە زۆرێك لە جەنگەکاندا پیادەی دەکرد و سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا.

قورئان و سوننەت بە چەشنێك بایەخ بەم لایەنە دەدەن، ئەوەی کەمتەرخەمی تێدا بنوێنێت سەرزەنشت دەکرێت. بەڵێ، گەر بڕیاربێت لە سەنگەری بەرگریدا ڕووبەڕووی دوژمن ببینەوە، ئەودەم نابێت هیچ سستییەك بنوێنین.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴾

(التوبة: ٣٨)

"ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە: ئەوە بۆچی کاتێك پێتان دەوترێت ڕاپەڕن و ئامادەبن و هێرشبەرن لە پێناوی ئایینی خوادا (دژی ئەو خوانەناسانەی خۆیان ئامادەکردووە بۆ کوژاندنەوەی نووری خوا)، ئێوە لەشتان دادەهێزرێت و دەلکێن بەزەویدا و گیردەبن. ئایا ئێوە ڕازین بە ژیانی دنیا و بە گرنگتری دەزانن لە ژیانی نەبڕاوەی قیامەت و بەهەشتی بەرین. بێگومان ژیانی دنیا بەبەراورد لەگەڵ ژیانی پڕ لە شادیی قیامەتدا زۆرزۆر کەم تەمەن و کەم خۆشییە."

﴿ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيۡـٔٗاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴾

(التوبة: ٣٩)

"ئەگەر (بۆ جیهاد) ڕانەپەڕن و دەستبەکار نەبن، ئەوا سزایەکی زۆر بەئێشتان دەدات و کەسانێکی تر دەهێنێتە کایەوە لە ئێوە نەبن، وەنەبێت ئێوە بتوانن هیچ زیانێك بە خوا بگەیەنن، خوا هەمیشە بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتدارە."

﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾

(التوبة: ٤٠)

"ئەگەر ئێوە پشتگیری پێغەمبەر نەکەن و یارمەتی نەدەن، ئەوا بەڕاستی خوا پشتگیری کرد و سەری خست، کاتێك ئەوانەی بێباوەڕ بوون دەریان کرد لە شاری مەککە و، یەکێك بوو لەو دوو کەسە کاتێك هەردووکیان لەناو ئەشکەوتەکەدا بوون (کە کافران گەشتبوونە دەوروبەری ئەشکەوتەکە، ئەبوبەکری هاوەڵی خەمی لێهات) پێغەمبەریش دڵی دایەوە و پێی فەرموو: خەفەت مەخۆ، دڵنیابە خوامان لەگەڵدایە. ئەوسا ئیتر خوا ئاسوودەیی و ئارامیی خۆی دابەزاندە سەری و پشتگیری و بەهێزی کرد بە سەربازانێك کە ئێوە نەتان دەبینین و بەرنامە و ئایینی بێباوەڕانی دانەواند و ڕیسواتری کرد، بەرنامە و ئایینی خواش هەمیشە بەرز و بڵندترە، خواش هەمیشە باڵادەست و دانایە."

بەڵێ، وەك چۆن ئەو دەمەی ئێوە پشتگیریتان نەکرد، خوای گەورە دەستبەرداری پێغەمبەرەکەی نەبوو و لەبەرامبەر سەرجەم شەڕخوازەکاندا کۆمەکیی کرد، هەر بەوجۆرەش بە ئەندازەی دڵسۆزی و ڕاستگۆییتان خوا ئێوەش سەردەخات و پشتتان دەگرێت.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەبەردەوامی لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا ڕێنمایی ئوممەتەکەی دەکرد بۆ ئەو ڕێگەیە، بۆیە هەرگیز چاوەڕێی ئەوە نەدەکرا ئەو کۆمەڵە ببەزێت یان ژێرپێ بکەوێت. لە ڕاستیشدا نەبەزی و ژێرپێ نەکەوت.

کەواتە پێویستە موسڵمانان ببنە ڕێکخەری هاوسەنگی لە جیهاندا، هەمیشە و هەردەم ئامادە و لەسەرپێ بن، هەرکاتێکیش پێویستی کرد دەستبەجێ لە بەرەی جەنگدا ئامادەبن. هەر ڕەفتارێکی پێچەوانەی ئەوەش گوناهە، دەبێت تەوبە و داوای لێخۆشبوونی لەسەر بکرێت.. بفەرموون ئێوە و ئەم نموونەیە لە چاخی بەختەوەرییەوە:

﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾

(التوبة: ١١٨)

"هەروەها تەوبەی ئەو سێ کەسەشی وەرگرت کە (لە غەزای تەبوك) دواخران. دوای ئەوەی کە زەوی چەندە فراوانە لێیان تەنگبووەوە. خۆیشیان لە خۆیان بێزاربوون، دڵنیاش بوون کە هیچ پەنایەك نییە (لە خەشم و تووڕەیی خوا بیان پارێزێت) جگە لەوەی خۆیان بدەنە پەنای ئەو زاتە. پاشان تەوبەی لێوەرگرتن، تا تەوبە بکەن. بەڕاستی هەر خوا تەوبە وەرگر و میهرەبانە."

## ٣. هەستی گوێڕایەڵی و پابەندی

گوێڕایەڵی زۆر گرنگە، لەویش گرنگتر چەسپاندنی ئەم هەستەیە لەناو کۆمەڵگەیەکی دەشتەکیدا. بەڵێ، لەو کۆمەڵگە نەفامەدا هیچ کەس گوێی لە کەس نەدەگرت و کەس کەسی قبووڵ نەبوو. بەڵام ئەو سەروەرە پلە بە پلە بەجۆرێك لەسەر گوێڕایەڵی ڕای هێنان، گەیشتە ئاستێك کاتێك لاوێکی تەمەن هەژدە ساڵ نەونەمام کرا بە سەرکردەی لەشکرێك کە کەسانی وەك حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر و عەلی و گەورە هاوەڵانی تری تێدا بوو، جگە لە یەك دوو دەنگی ناڕازی کەس دەنگی نەکرد...[1]

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ ۖ وَٱصْبِرُوٓاْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾

(الأنفال: ٤٥-٤٦)

"ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە: کاتێك دەگەنە دەستەیەك و ڕووبەڕووتان دەبنەوە، ئەوە دەبێت خۆڕاگر بن و سەنگەر چۆل نەکەن و زۆر یادی خوا بکەن و لێی بپاڕێنەوە، بۆئەوەی سەرفراز و سەرکەوتوو بن. گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەشی بکەن لە هەموو کردار و گوفتارێکدا و ئاشووب و ئاژاوە مەگێڕن و مەچن بەگژ یەکدا، خۆ ئەگەر بچن بەگژ یەکدا و یەکتر بشکێنن، ئەوە شکست و لاوازی ڕووتان تێ دەکات و شکۆداری و دەسەڵاتتان لەبەین دەچێت. دەبێت خۆگر و نەفەس درێژ بن (هەم لە مەیدانی جەنگدا، هەم لەناو یەکتردا). چونکە بەڕاستی خوا یار و یاوەری خۆگر و ئارامگرانە."

---

١. صحیح البخاري، الأحکام ٣٣؛ صحیح مسلم، فضائل الصحابة ٦٣-٦٤؛ إبن هشام، السیرة النبویة ١٢/٦.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ﴾

(النساء: ٥٩)

"ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردار و گوێڕایەڵیی خوا و پێغەمبەر و فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن (لە بیروباوەڕ و پابەندیدا)."

لەڕاستیدا چەمکی گوێڕایەڵی لەناو هاوەڵاندا هێندە ڕەگی داکوتابوو، ئەوەتا حەزرەتی ئەبوبەکر وێڕای ئەوەی کە خەلیفەی موسڵمانان بوو، کەچی داوای لە سەرکردەی لاو "ئوسامە" دەکرد ڕێگە بدات بە حەزرەتی عومەر تاکو لەگەڵیدا بمێنێتەوە و ببێتە وەزیری.[1]

ئاخر بۆ دەبێت خەلیفە داوای مۆڵەت بکات؟ بۆچی؟ چونکە پێغەمبەر (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) کردبووی بە سەرکردە.. پێویست بوو بە دڵ و بە گیان بەگوێی بکەن. پێغەمبەر (صَلَوَاتُ ٱللَّهِ وَسَلَامُهُ عَلَيۡهِ) تا ئەوکاتەی کۆچی دوایی کرد بەردەوام پێداگری لەسەر بایەخی گوێڕایەڵی دەکردەوە. چونکە دڵنیابوو کە گوێڕایەڵی نەکردن دەرگای پشێوی و ئاژاوە دەخاتە سەرپشت. لەمەشدا بەجۆرێك سەرکەوتوو بوو هیچ کەسێکی تر پشکی وەهای بەرنەکەوتووە. بەڕادەیەك جارێکیان لە سوپاکەی عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەدا سەرکردەی سوپا فەرمانی کرد خۆیان فڕێ بدەنە ناو ئاگرەوە. هەندێکیان ویستیان هەنگاوێکی لەوجۆرە بنێن، لەکاتێکدا ئەوە جۆرێك بوو لە خۆکوشتن. بۆیە هەندێکیان هاتنە دەنگ و وتیان:

"ئێمە بۆ ڕزگار بوون لەئاگر واتە بۆ نەچوونە نێو دۆزەخ باوەڕمان بەئیسلام هێناوە، با ئەم بابەتە لەپێغەمبەری خوا بپرسین بزانین لە حاڵێکی

---

١. الطبري، تاريخ الأمم و الملوك ٢/٢٤٦.

وەهاشدا هەر پێویستە گوێڕایەڵ بین؟ ئیتر کە دواتر پرسیار لە ئازیزمان دەکەن، پێیان دەفەرمووێت "ئەگەر بچوونایەتە ناویەوە، ئیدی لێی نەدەهاتنە دەرەوە، گوێڕایەڵی تەنها لە چاکەدایە."

بەڵێ، تا ئەو ئاستە قووڵ بووبوونەوە لە هەستی گوێڕایەڵیدا. تیغی شمشێر دەدرا بە سەریاندا کەچی کەس بیری لە پاشەکشێ نەدەکردەوە، چونکە هێشتا فەرمانی کشانەوە لە سەرکردەکەیانەوە دەرنەچووبوو. خۆ ئەگەر پێچەوانەکەی لە ئارادا بووایە و هەر جەنگاوەرە و بە ئارەزووی خۆی مامەڵەی بکردایە، ئەوەدەم هیچ شوێنەوارێك بۆ یەکێتی و هەماهەنگی نەدەمایەوە و، هەموو شتێك ئاوەژوو دەبووەوە. لەوبارەیەوە قورئانی پیرۆز دەفەرمووێت:

﴿ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾ (الأنفال: ٤٦)

"گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بکەن لە هەموو کردار و گوفتارێکدا و ئاشووب و ئاژاوە مەگێڕن و مەچن بەگژ یەکدا، خۆ ئەگەر بچن بەگژ یەکدا و یەکتر بشکێنن، ئەوە شکست و لاوازی ڕووتان تێ دەکات و شکۆداری و دەسەڵاتتان لەبەین دەچێت. دەبێت خۆگر و پشوودرێژ بن (هەم لە مەیدانی جەنگدا، هەم لەناو یەکتردا). چونکە بەڕاستی خوا یار و یاوەری خۆگر و ئارامگرانە."

## ٤. پێغەمبەری سەرباز و ستراتیژی هەمەلایەن

پێغەمبەری خوا (عَلَيهِ أَفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) وەك سەربازێکی بێوێنە هەمیشە پلان و تاکتیکی جۆراوجۆری پیادەکردووە. ئەگەر جارێك نەخشە و شێوازێکی بەکار بهێنایە، بۆ جارێکی تر هەمان ئەو شێوازەی بەکار نەدەهێنایەوە. لەبەرئەوە جێی سەرسوورمان نییە کە نەیارەکانی بەردەوام تووشی سەرسامی و حەپەسان دەبوون. شێوازی پارتیزانی و پەلاماری لەناکاو -کە لە ئێستادا زۆر بەکاردێت، بەڵام لەوکاتەدا نەدەزانرا- کە بریتییە لە هێرشکردن و پاشان کشانەوە. ئەوجا دیسانەوە هەڵمەتبردنەوە لە بەرەیەکی ترەوە کە دوژمن خەیاڵی بەلایدا نەچووە، پشێوی خستبووە نێو ڕیزەکانی قوڕەیشەوە و گیریان خواردبوو بەدەستیەوە.

لە جەنگی بەدردا تا بەو شێوازە بەرەنگاری دوژمنانی بووەوە. ڕاستتر بڵێم، بتپەرستان هەر لە سەرەتاوە تووشی پەشۆکان هاتن، چونکە نەیاندەزانی چییان لێ قەوماوە! بۆیە هەر لە یەکەمین نەعرەتەوە شڵەژان و لەرزەیان پێکەوت. ئەمە سەرباری ئەوەی چەندین ئامادەکاریی سەربازییان بۆ ئەو جەنگە سازکردبوو، هەر لە جەنگاوەرەوە بیگرە تا دەگاتە ئەسپ و کەرەستەی جەنگی. لەبەرامبەریشدا ئەوەندەی ئێمە بزانین موسڵمانەکان لە دوو یان سێ ئەسپ زیاتریان پێ نەبووە. چەکی هەر موسڵمانێکیش جگە لە نێزەیەك و هەندێك تیر هیچی تر نەبووە. چونکە ئەوان بەنیازێکی ترەوە هاتبوون بۆ بەدر. بەڵام هەرکە دوژمنان خۆیان لەبەردەم نەخشەیەکدا دیتەوە کە تا ئەو ڕۆژە لەسەری ڕانەهاتبوون، یەکسەر شڵەژان و شپرزەیی بەرۆکی گرتن. ئیدی لە بازنەی تەقدیری خواییدا هۆکارەکان نیشتنە سەریان و لە تۆڵەی هاوەڵدانانیان بۆ خوا، زللەی بەئازاریان تێ سرەواندن.

داهێنانێکی دیکەی جەنگیش، ئەنجامدانی نوێژی بەکۆمەڵ بوو لە مەیدانی بەرەنگاریدا. ئەوەش بۆخۆی ئاماژەیە بۆ بەکەمزانینی هێزی دوژمن و، بەرزکردنەوەی گیانی متمانە و ورە لای باوەڕداران. خۆ دەکرا بەرەی بەرامبەر ئەمە بە دەرفەت بزانن و بیقۆزنەوە. بەڵام دۆخەکە هەرگیز بەوجۆرە نەبوو کە ئەوان چاوەڕێیان دەکرد، چونکە خوای گەورە بەم جۆرەی خوارەوە نوێژی ناو بەرەی جەنگی فێری خۆشەویستەکەی کردبوو:

﴿ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾

(النساء: ١٠٢)

"کاتێکیش تۆ (ئەی پێغەمبەر) لەناو هاوەڵاندا دەبیت و پێشنوێژییان بۆ دەکەیت (لەکاتی جەنگدا)، ئەوە با دەستەیەکیان لەگەڵ تۆدا بوەستن بۆ نوێژ و چەکەکانیان پێ بێت. جا کاتێک ئەم دەستەیەی کە نوێژ دەکات چوونە سووژدە، با ئەوانی تر لە پشتانەوە بن. (ئینجا کە لێبوونەوە لەو ڕکاتە) ئەو دەستەیەی تر کە پاسەوانییان دەکرد و نوێژیان نەکردووە، با بێن لەگەڵ تۆدا نوێژەکەیان بکەن. با هۆشیار و چەکداریش بن. چونکە بێباوەڕان ئاواتەخوازن ئێوە بێئاگا بن لە چەک و کەلوپەلتان، تا هێرش بکەنە سەرتان و تەفروتوناتان بکەن. بەڵام بۆتان هەیە چەکەکانتان دابنێن ئەگەر نارەحەت بوون بەهۆی بارانەوە، یان هەندێکتان نەخۆشکەوتن، هەمیشە وریابن، بەڕاستی خوا سزای ڕیسواکەر و شەرمەزاری بۆ خوانەناسان ئامادەکردووە."

دوژمنەکە لە دوورەوە چاودێری موسڵمانان دەکات، شتێکی سەیر دەبینێت. دەبینێت موسڵمانان نوێژ دەکەن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا شمشێر و قەڵغان و ڕمەکانیان هەر پێیە. ئەوجا کاتێك دەیانەوێت هێرش بکەن، دەموودەست کۆمەڵێکی تریان بەرچاو دەکەوێت؛ دەبینن هەندێکیان لە ڕیزی نوێژەوە دەگوازنەوە بۆ ڕیزی پاسەوانی و، لە ڕیزی پاسەوانیشەوە بۆ ڕیزی نوێژ.[1]

کەواتە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە فەرمانی پەروەردگاری تەنانەت لە نوێژیشدا پلانی بۆ جەنگ و بەرگری کێشاوە.

## أ. پەنهانی لە جموجوڵدا

هیتلەر کاتێك باس لە ژیانی سەربازیی خۆی دەکات، دەڵێت "من نهێنیی دەرك پێ نەکرانم دۆزیوەتەوە." کەچی ئێمە دەزانین بنەمای "شاراوەیی" لەلایەن پێغەمبەری خواوە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بە مرۆڤایەتی ناسێنراوە. لە توانای کەسدا نەبووە پەی بە پلان و نەخشەکانی بەرێت، چ لەکاتی هێرش یان بەرگریدا. ڕێڕەوی ڕۆیشتنی خۆی ئاشکرا نەدەکرد تاکو ماوەیەکی زۆری لە ڕێگەکە نەبڕیایە.[2] کاتێك ڕووی کردە مەککە، هیچ کام لە موسڵمانان یان بتپەرستان بەڕوونی نەیاندەزانی ئامانج و نیازی چییە تا ئەوکاتەی کەمێکی مابوو بگاتە ناو شار. کاتێکیش لە دە هەزار جێگەوە دە هەزار مەشخەڵ داگیرسا، ترس و سام نیشتە گیانی قورەیش. بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو. چونکە لەشکری ئیسلام هێندە لێیان نزیك بووبووەوە، دەرفەتی ئەوەیان نەبوو خۆیان کۆبکەنەوە و دەست هەڵبێننەوە.[3]

١. صحيح البخاري، صلاة الخوف ١-٣؛ صحيح مسلم، صلاة المسافرين ٣٠٥-٣١٢.
٢. صحيح البخاري، الجهاد ١٠٣.
٣. صحيح البخاري، المغازي ٤٨؛ إبن سعد، الطبقات الكبرى ١٣٥/٢.

## ب. تۆڕی هەواڵگری

لەلایەکی ترەوە، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تۆڕێکی هەواڵگری وای دامەزراندبوو کە پێشتر کەس شتی وەهای نەبیستبوو. هەواڵ و زانیارییەکان لەکاتی خۆیدا دەگەیشتە ناوەند و، لەوێ دەخرانە بەر باس و لێکۆڵینەوە. مێژوو حاڵەتێکی وای تۆمار نەکردووە کە زانیارییەکانی پێغەمبەر کەوتبنە دەست دوژمنانی. جارێکیان "حاتەبی کوڕی ئەبوبەلتەعە" هەڵەیەکی لەو شێوەیەی ئەنجامدا. ئەوەبوو بە ژنێکدا هەواڵی نارد بۆ مەککە تاکو هەواڵی هاتنی پێغەمبەریان پێ ڕابگەیەنێت. بەڵام تەتەرەکەی لە ڕێگەدا گیرا. ئەوەی جێی سەرنجە کەس سەرکۆنەی حاتەبی نەکرد.. مادەم بابەتەکە چارەسەر کرابوو ئیدی پێویستی بە سەرکۆنە نەدەکرد. دواجار حاتەبیش دانی بە هەڵەی خۆیدا نا. ڕاستە ئەو یەکێك بوو لە بەشداربووانی بەدر، بەڵام هەڵەی هەبوو. دواجار ئەو زاتەی هیچ هەڵەیەکی نەبوو (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) چاوپۆشی لێکرد.[1]

بەڵێ، پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) تۆڕێکی هەواڵگری وەهای پێکهێنابوو لە توانای کەسدا نەبوو دزە بکاتە ناویەوە و زەفەری پێ بەرێت. پلەی شاراوەیی و ڕازپارێزی لای پێغەمبەر لەو ئاستەدا بوو. ئەو زاتەی هەموو شتێکی فێرکردووە، چواردە سەدە لەوەوبەر هەموو ئەو شتانەشی فێری بەندە خۆشەویستەکەی کردووە کە لەم مەیدانەدا دەوترێن.

دەیتوانی هەواڵ بگەیەنێتە جێگەی وەها کە وشتر بە دوو شەو و ڕۆژ ئەوجا دەیتوانی بیگاتێ. کەچی ئەو بە کەمتر لەو ماوەیە هەواڵ و زانیارییەکانی دەگواستەوە. تەماشاکەن، ئەو دەمەی سەروەر لە مەدینە بوو، سوپاکەی لە

---

١. صحيح البخاري، المغازي ٤٦؛ صحيح مسلم، فضائل الصحابة ١٦١.

سنوورەکانی شام دەجەنگا. بڕینی ئەو دوورییەش پێویستی بە دە ڕۆژ گەشتی بەردەوام هەبوو. کەچی پەیامبەرەکانی ئەو ماوەیەیان تەنیا بە هەشت ڕۆژ دەبڕی.

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ناوازەیی و تۆکمەیی ئەو تۆڕە هەواڵگرییەی دروستی کردبوو. بۆ نا، لەکاتێکدا پەروەردگار ڕێنموونی دەکرد، ئەویش بەردەوام ئەو ڕێگایانەی دەگرتەبەر کە فێرکارە ئەزەلییەکەی نیشانی دابوو. نێردراوی یەکەم ڕۆژێکی تەواو بە ئەسپەکەی دەڕۆیشت، پاش ئەوەی ماوەی ڕۆژێکی تەواوی دەبڕی، لە ئەسپەکەی دادەبەزی و هەواڵەکەی دەسپارد بە نێردراوی دووەم و خۆی پشووی دەدا. دووەمیش بە ئەسپی خۆیەوە بەپەلە ڕۆژێکی ڕەبەقی دەبڕی و نامەکەی دەگەیاندە نێردراوی سێیەم. ئیتر بەو جۆرە تاکو هەواڵەکە دەگەیشتە شوێنی مەبەست. بەمشێوەیە هەواڵ و زانیارییەکان لەڕێی نێردراوی چوست و ئەسپی باش ئامادەکراوەوە لە کورتترین کاتدا دەگوێزرانەوە. ئەگینا چۆن ڕێی تێدەچوو لە مەککە دابنیشیت و هەواڵی فیزانت پێ بگات؟

ئەو خاوەن فەتانەتە مەزنە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) لە چوارچێوەی هەلومەرجەکانی ئەو ڕۆژگارەدا، بە هەر هەواڵێکی بۆن و بەرامەی دڵنیایی و ئاسوودەیی پەخش دەکرد و ڕۆژانێکی ڕەنگینی وێنا دەکرد. هەموو ئەمانەش بەڵگەی گۆیان لەسەر پێغەمبەرێتییەکەی.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هەرکات بارودۆخ داخوازی ئاشتی و تەبایی بووایە، وەك سەربازێکی بلیمەت یەکسەر ڕووی دەکردە ئاشتەوایی. هەر سەبارەت بەم لایەنە پێم باشە ئەم چەند دێڕەش زیاد بکەم:

قورئانی پیرۆز پێی دەفەرموونێت:

﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾

(الأنفال: ٦١)

"جا ئەگەر (دوژمنان) بەلای ئاشتیدا دایانشکاند و حەزیان پێکرد، ئەوا تۆش ئامادەیی خۆت دەرببڕە و پشت بە خوا ببەستە. چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و زانایە."

بە واتایەکی دیکە؛ واتە دەست بە هۆکارەکانەوە بگرە و ڕەچاویان بکە، لەگەڵ ئەوەشدا پشت بەستن بە خوا فەرامۆش مەکە. چونکە پشت بەستن بەبێ دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە، هێمای تەمبەڵی و تێنەگەیشتن و هەست نەکردنە. بەڵام پشت بەستن پاش ڕەچاوکردنی هۆکارەکان، ناونیشانی ملکەچی و تەسلیمبوونە و، هاوکات گوزارشتیشە لە ناسین و پەیڕەوکردنی یاسا و بنەماکانی شەریعەتی فیتری و ئایەتە تەکوینییەکان.

## ج. قۆناغبەندی لە بانگەوازدا

لە قۆناغێکی دیاریکراوی بانگەوازدا فەرمانی خواوەند بەمجۆرە بوو:

﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴾

(النحل: ١٢٥)

"(ئەی پێغەمبەر، ئەی ئیماندار) بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامە و ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت و دانایی و ئامۆژگاری جوان و بەجێ و گفتوگۆ و موجادەلە بە جوانترین شێوە. چونکە بەڕاستی پەروەردگارت هەرخۆی زانایە کە کێ گومڕایە. هەروەها هەرخۆیشی زانایە بە هیدایەتوەرگران."

خوا زۆر چاك دەزانێت كێ سەرلێشێواوە و كێیش ڕێگەی ڕاستی گرتووە. تۆ تەنیا ئەركی خۆت بەجێ بهێنە و كارت بەسەر شتی ترەوە نەبێت! ئەم ئایەتە لە ڕوویەكەوە بانگێشتی ئەویش و تێكڕای هاوەڵانیشی دەكرد تاكو سەرگەرمی بەدەستهێنانی باوەڕێكی تۆكمە و دامەزراو بن. بەدوایدا قۆناغێكی تر هات و فەرمانی دا بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەكاتی پێویستدا بە زمانێكی توندتر جاڕی بانگەوازەكەی بدات و هۆزەكەی بێدار بكاتەوە:

﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴾ (الشعراء: ٢١٤)

"سەرەتا خزمە هەرە نزیكەكانت ئاگادار بكەرەوە!"

﴿ فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ ﴾ (الحجر: ٩٤)

"ئیتر هەر فەرمانێكت پێدراوە ئەنجامی بدە و گوێ مەدە بە بوختان و ڕەفتاری هاوەڵگەران."

## ٥. چەند بڕگەیەك لە ژیانی ئەو

هاوکات لەگەڵ بانگەوازی ئاشکرای ئیسلامدا، فشارەکان زیادیان کرد و، هەندێك هاوەڵی وەك سومەییە و یاسر و کەسانی تر شەهیدکران.

هەندێکیان بە ئازاردان و برسیکردن، یان بە چەقاندنی خەنجەر و نێزە بە سنگیاندا شەهید دەبوون.. ئنجا کۆچ دەستی پێکرد. کۆچ بۆ حەبەشە و دیسان گەڕانەوە. پاشان کۆچ بۆ مەدینە.. بەرلەوەش وەفاتی دایکی ئیمانداران، خاتوو خەدیجە و، ئەبوتالیبی مامی، واتە ساڵی دڵتەنگی. دەرەنجامی هەموو ئەمانەش، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە ڕوانگەی هۆکارە ڕواڵەتییەکانەوە بەتەنیا و بێپارێزەر مایەوە. لەڕاستیدا خوای باڵادەست هەموو ئەو ئامراز و هۆکارە ڕواڵەتییانەی لێگرتەوە کە ئەو لە ڕووکەشدا پشتی پێبەستبوون. بۆ ئەوەی تەنها و تەنها ڕوو لە کردگار بکات، کە ڕەخسێنەری گشت هۆکارەکانە. چونکە یەکێك لە دەستوورەکانی فیترەت ئەوەیە کە: ڕووکردنە خوای بەدیهێنەری هۆکارەکان لە دنیای دۆستانی خوادا ئەوکاتە دێتەدی کە تەواوی هۆکارەکان هەردەس بهێنن. کەواتە پێویستە تیشکی هەموو هۆکارەکان خامۆش ببن تاکو لەپاڵ مەیلە فیترییەکەدا، بەندە بە ناچاری و دەستەوسانیش ڕوو وەربچەرخێنێتە پەروەردگار و پەی بە نهێنییەکانی نووری تەوحید ببات و لە ویژدانیدا ڕازی ئەحەدییەت نمایان ببێت. ڕێك وەك ئەوەی بەسەر حەزرەتی یونسدا هات.. تاکو لەدواییدا بیگەیەنێتە لێواری سەلامەتی و درەختی کولەکەی بۆ بڕوێنێت و ئەو نوورە مەزنەی خۆی نیشان بدات کە دەبوو بیبینێت.

بەڵێ، بە مردنی ئەبوتالیب پشتیوان و کۆمەکێکی لێسەنرایەوە، بە کۆچی حەزرەتی خەدیجەیش داڵدە و کۆڵەکەیەکی تر. جا بۆئەوەی وانەیەکی بەپێز بە

هەموو نەوەکانی داهاتوو بڵێتەوە. هەرمسی بە هەموو هۆکارە ماددییە ڕواڵەتییەکان هێنا و ڕووی کردە خوای سازێنەری هۆکارەکان، هەروەك پێی بڵێت "تۆ کەسێکیت دەستنیشانکراوی ئەوەی تەنها بڵێیت "اللە"، ئەی نابینیت کە پێش لەدایکبوونت باوکتم بردەوە، پاش لەدایکبوونیشت دایکت و پاش ئەویش باپیرەت؟ بەڵێ، ئەوانەی کە تۆیان دەپاراست یەك لە دوای یەك هەموویانم لێسەندیتەوە، تاکو جگە لە من خەیاڵت بەلای کەسی تردا نەترازێت. لەبەرئەوە لەهەمووکاتێکدا بەدوای مندا بگەڕێ، تەنها ڕوو لە من بکە و هەوڵ بدە لە پشت هەر دەرگایەکەوە کە لەم گەردوونەدا تەقەی لێدەدیت، تەنیا دەنگی من ببیستیت."

ڕاستە ئەو ڕێبازەی خوا ناچاری کردبوو بیگرێتە بەر، ڕێبازێکی سەخت و گرفتاوی بوو، بەڵام کۆڵێك نەبوو حەزرەتی محەممەد موستەفا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەتوانێت شانی بداتە بەر. چونکە لە سایەی هێز و دەسەڵاتی خواوە کەسێکی زۆر بەهێز بوو، مرۆڤێکی نەبەزی ناوازەی ئەوتۆ بوو بە هەردوو باڵی هەژاری و کۆڵەواری بەرەو پەروەردگاری دەفڕی.

گەشتەکەی تائیفیش یەکێکی ترە لەو بەسەرهاتانەی کە بێوەفایی هۆکارە ڕواڵەتییەکان دەردەخات.[1] ئەو (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بەو ئومێدەوە چوو بۆ تائیف کە پەیامەکەی پێشکەش بە دڵانێکی پاکیزە بکات، کەچی بە حاڵێکەوە گەڕایەوە کە خوێن لە سەرتاپای جەستەی پیرۆزی دەچۆڕا.. پاشان دیداری یەکەمین شەش کەس -لە ڕیوایەتێکدا حەوت- لە عەقەبە.. ئەو شەش کەسە، ئەسعەدی کوڕی زورارە و هاوەڵەکانی بوون. دەستی پێغەمبەری خوایان گووشی و گەڕانەوە بۆ "یەثریب". ساڵی دواتریش بە دوازدە کەسەوە و، ساڵێك دوای ئەویش بە حەفتا و دوو کەسەوە کە دووانیان ئافرەت بوون، هاتنەوە

---

١. ابن كثير، البداية و النهاية ٣/١٣٦.

خزمەت سەروەرمان.[1] ئەو دوو ئافرەتە مەزنەش؛ نوسەیبەی مازنی (ئەو ئافرەتە بێهاوتایەی کە مێژووی ئیسلام هەمیشە بە شانازییەوە یادی دەکاتەوە و نازناوەکەی ئوم عەممارمیە)، ئەوەی تریشیان ئەسمای کچی عەمر بوو.[2]

ئەو دوو ئافرەتە مەزنە لەو ڕۆژە بەدواوە چ لە گەشت بێت یان لەناو شار، لە سەروەرمان (صَلَوَاتُاللهِوَسَلَامُهُعَلَيهِ) جیا نەبوونەوە. ئوم عەممارە یەکێك بوو لە بەشداربووانی جەنگی پاشگەزبووەکان، بە دیاریکراوی جەنگی یەمامە. تەنانەت ئەو دەمەی حەبیبی کوڕی شەهیدبوو، ئەو هێشتا هەر شمشێری بەدەستەوە بوو و، بەوێنەی ئەو تابلۆی پاڵەوانێتییەی لە ئوحوددا نواندی، لەسەر ڕاپەڕاندنی ئەرکی خۆی بەردەوام بوو.[3] ئیدی سەرداری بوونەوەران لەلایەن ئەم دەستە پێشەنگەوە بانگهێشتکرا بۆ مەدینە...

تا ئەو ساتە نە بە زوبان، وە نەبە کردار ئازاری کەسی نەداوە. بگرە ئەگەر چەقۆی بدایە بەدەست کەسێکەوە، دەمە تیژەکەی ڕوو دەکردە خۆی و بە دەسکەکەی دەیدا بە بەرامبەرەکەی، نەبادا بسڵەمێتەوە. بەڵێ، لە مامەڵە و ڕەفتاریدا تا ئەو ئاستە ورد و ناسك بوو. تا ئەو ڕۆژەش لە ژیانیدا کەسی نەڕەنجاندبوو. کەچی لەولاوە شەمشەمەکوێرە تاریکزەدەکان لەبەرامبەر بڵاوکردنەوەی حەق و حەقیقەت و شەکانەوەی بەیداخی قورئان لە سەرانسەری زەویدا، سەغڵەت دەبوون و کۆسپ و لەمپەریان دروست دەکرد. بەدڵنیاییەوە ئەو "خاوەن شمشێر"ەش شمشێری لەڕوودا هەڵدەکێشان و پێی دەوتن "ئەی شەمشەمەکوێرەکان! چیدی ناتوانن بەر بە ڕووناکی بگرن، ژیانێکی تاریك

---

١. إبن كثير، السيرة النبوية ٢/٢٧٦-٢٩٢.

٢. إبن كثير، السيرة النبوية ٢/٢٩٠.

٣. إبن حجر، الإصابة ٨/ ٢٦٥-٢٦٦؛ إبن عبدالبر، الإستعاب ٤/١٩٤٨-١٩٤٩.

بەشتانە. کەواتە لەبەرچاو ون ببن و لەبەردەم سوارچاکان و سوپای ڕووناکیدا مەوەستن.“ هەر بەڕاستیش وتی...

پێشەوا لەناو شوێنکەوتووانیدا بوو و لە جەنگیشدا وەك فەرماندە لەپێشیانەوە دەوەستا. سەرەتا لە کێشە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەستی پێکرد. هەستا برایەتی خستە نێوان هاوەڵانییەوە، پاشان ئەهلی کیتابی بەرەو خۆی کێشکرد. ئاشتەوایی لەگەڵ سازکردن و، بە ئامادەکردنی دەستووریش متمانە و دڵنیایی بە هەموو لایەك بەخشی.

پاشان ڕووی کردە مەیدانی سەربازی. لە سەرەتادا چەند یەکەیەکی سەربازی بچووکی پێکهێنا. ئەوجا کەوتە بڵاوەپێکردنیان بە ناوچەکانی دەوروبەردا. یەکەکان کە بەشێوەیەکی گشتی ژمارەیان لە دە کەس کەمتر دەبوو، ئەرکیان کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاری و گەیاندنی بوو بە ناوەند، واتە مەدینە.

چەند یەکەیەکی تریش هەبوون کە لەڕووی ژمارەوە لەوانەی سەرەوە زۆرتر بوون. مەشقپێکراو و چەکدار بوون. هەمیشە لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بوون. بە زمانی ئەمڕۆ "تیمی تایبەت" بوون. ئەم تیمانە جارجار بە ئەرکی کۆکردنەوەی زانیاریی هەواڵگریش هەڵدەستان. بەڵام ئەگەر پێویستی بکردایە زۆرچاك مافی بەرەنگاربوونەوەیان دەدا. خودی پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چوار جار سەرکردایەتی ئەم تیمانە ی کردووە. جاری وا دەبوو ژمارەی ئەو یەکانە دەگەیشتە دووسەد چەکدار. زۆرتر ئەرکیان ئەوەبوو دوژمن بترسێنن و سام و لەرزە بخەنە دڵیانەوە.

## ٦. ئامانجی یەکە سەربازییەکان

باوەڕداران ئامادەیی تەواویان تێدا بوو بۆ هەموو چەشنە تێکۆشان و ڕووبەڕووبوونەوەیەك. موشریکەکانیش لەلایەن خۆیانەوە بە هەموو هێز و توانایانەوە موسڵمانانیان ناچاری ڕووبەڕووبوونەوەیەکی لەوجۆرە دەکرد. بەر لە سیازدە ساڵ وەحی دەستی بە دابەزین کردبوو و پێی نابووە ساڵی چواردەیەمینیەوە. ئەوانەش کە ڕۆشنایی ئیمان تەنگی پێ هەڵچنیبوون، تێدەکۆشان بۆ کوژاندنەوەی و لە هەموو جێگەیەکدا بەرهەڵستی بانگەوازی قورئانیان دەکرد. لە هەر سات و شوێنێکدا باوەڕدارێکیان دەست بکەوتایە، بێدووڵی دەیانکوشت.

ئێمە ئەمڕۆ کە یادی ستەمکارییەکانی بولگار و ڕووس و هیندۆسەکان دەکەینەوە، هەست دەکەین بەلای کەمەوە کەسانێك هەن ئەو کارە نامرۆڤانانە شەرمەزار بکەن. بەڵام لەو سەردەمەدا کەسێك نەبوو ئەو ستەمانە شەرمەزار بکات کە دووچاری موسڵمانان دەبووەوە، یان هەر هیچ نەبێت لەسەریان بێتە دەنگ. قوڕەیش هەرچییەکی بکردایە بەلای خەڵکەوە پەسەند بوو. ئاخر دواجار ئەوان گەورە و سەرداری مەککە بوون و چییان بویستایە دەیانکرد. ئەرکی ڕووخاندنی ئەو ڕژێمە زۆردارەش دیسانەوە دەکەوتەوە ئەستۆی سەروەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). بۆیە چەندین یەکەی سەربازی ڕێکخست و بە هەموو لایەکدا ڕەوانەی کردن. لەو ڕێیەشەوە دەیویست چەند ئامانجێك بپێکێت، لەوانە:

## أ. دەرخستنی کیانی ئیسلامی

یەکێك لە ئامانجەکان ئەوەبوو هەموو لایەك هەست بە بوونی قەوارەی موسڵمانان بکەن و ئەوە بسەلمێنن کە قورەیشییەکان بە وەدەرنانی باوەڕداران لە زێدی خۆیان، نەیتوانیوە نووری ئیسلام خامۆش بکات.

﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴾

(الصف: ٨)

"ئەوانە دەیانەوێت بە فووی دەم نووری خوا خامۆش بکەن! (خەیاڵیان خاوە) خوا نووری خۆی، ئایینی خۆی تەواو دەکات و دەیچەسپێنێت، هەرچەندە بێبڕوایان پێی سەغڵەت بن و پێشیان ناخۆش بێت."

کەواتە پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) دەیویست بۆیان بسەلمێنێت کە چیدی تاریکستانی نەفامی، لەو بیابانە چۆڵ و ترسناکەدا ناتوانێت ڕێبازی خوا لەناو ببات.

## ب. هێز لە حەقدایە

یەکێکی دیکە لە ئامانجەکان چەسپاندنی ئەو ڕاستییە بوو کە فەرمانڕەوایی و دەسەڵات تەنها بۆ قورەیش و بتپەرستانی مەککە نییە.. بەڵکو ئەوانەش کە نمایندەی حەق و ڕاستین، پشکی خۆیان هەیە لەو خاوەندارێتییە.. ڕۆژێکیش دێت "هێز" بە هەموو چەکەکانیەوە مل کەچ دەکات بۆ "حەق" و تەسلیمی دەبێت. ئیتر ئەوکات لەسەرزەویدا قسە تەنها قسەی حەق دەبێت و، سەروەریی یاساش بۆ هەموو لایەك دەردەکەوێت.

حەزرەت زۆرباش دەیزانی قورەیش لەسەر حەق نییە. بەڵام لەبەرئەوەی خاوەن هێز بوون، جاروبار و بەشێوەیەکی کاتی بەسەر حەقدا زاڵ دەبوون. لەبەر ئەم هۆیە دەبووایە پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَالسَّلَامُ) هێزی حەق و ڕاستی بۆ هەموو لایەك دەربخستایە. لەم سۆنگەیەوە، پێکهێنانی یەکەسەربازییەکان پەیامێکی ڕوون و ڕەوان بوو بۆ سەرجەم خاوەن هێز و دەسەڵاتدارانی ناوچەکە. واتە بەکردەیی ڕایدەگەیاند کە کەسانی وەك ئەبوسوفیان و ئەبوجەهل و عوتبە و شەیبە و کوڕی ئەبومو‌عیت و وەلید و ... هتد هیچ مافێکیان نییە بەسەر مرۆڤایەتییەوە. بگرە بەپێچەوانەوە، مافی مرۆڤایەتییان زەوتکردووە و قۆرخیان کردووە بۆ بەرژەوەندی و پاوانخوازیی خۆیان.

## ج. زەمینەسازی بۆ بانگەواز

مەبەستێکی دیکە لە ڕێکخستنی یەکەسەربازییەکان لادانی ئەو کۆسپانە بوو کە دەهاتنە سەرڕێی بانگەواز. بەڵێ، لە سایەی ئەو یەکە سەربازیانەدا کە لێرە و لەوێ دەسووڕانەوە و بە ئەرکی پاسەوانی هەڵدەستان، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) توانی جڵەوی یاسا و ئاسایش بگرێتە دەست و، هەڵگرانی پەیامەکەی بە هەموو لایەکدا بنێرێت و، گەرەنتی سووڕانەوەیان بکات بەناو شار و لادێکاندا و ژینگەیەکی ئارامیان بۆ بڕەخسێنێت.

بۆ ئەم مەبەستە بەردەوام یەکەی دەنارد بۆ ناوچەکانی دەوروبەری مەدینە. تەنها لەدوای کۆچەوە تاوەکو بەرپابوونی جەنگی بەدر، حەڤدە جار یەکەی ڕەوانەی ناوچە سنوورییەکانی مەدینە کردووە. تەنها لە ماوەی ئەو چەند مانگەدا حەڤدە یەکەی سەربازی ڕەوانەی سنوورەکانی مەککە کردووە و ترس

و بیمیان خستووەتە دڵی دوژمنەوە. واتە سەرەتا لە پەلوپۆی خستن، ئەوجا هەنگاو بە هەنگاو بەرەو بەدری مەزن پەلکێشی کردن.

## د. چەسپاندنی ئاسایش

لەو سەردەمەدا بیابان ژینگەی جەردەیی و تالانکاری بوو. کێ بەهێز بووایە حەق لای ئەو بوو. لاواز و ژێردەستەکان بێبەش بوون لە مافی ژیان. ئەوەی هێزی بەدەست بووایە ئەوانی تری دەهاڕی. لەو بارودۆخەدا پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) نەخشەسازی ئەوەی کرد یەکەسەربازییەکان بە هەموو لایەکدا بڵاوە پێ بکات، بێنەوەی دەستی خراپە بۆ هیچ کەس درێژ بکەن، یاخود زیان بە سامان و شکۆیان بگەیەنن. بەڵێ. کەسانی چەکدار بە بەردەم ماڵی هاوڵاتیاندا گوزەریان دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کەس تووشی ئازار و زیان نەدەبوو. چۆن وا نەبێت، لەکاتێکدا ئەوان شاگردی "الأمين" بوون و کۆتەڵی ئارامی و سەقامگیری بوون! بەم شێوەیە ئەوە پیشانی هەمووان درا کە دەکرێت بیابان جگە لە تالانی، دیمەنی جیاوازتریش بەخۆیەوە ببینێت. ئەمەش بۆ هیچ کەسێکی تر مەیسەر نەدەبوو جگە لەو حەزرەتی محەممەد موستەفایەی کە هەر لە سەرەتاوە جەنگی دژی دزی و دزێوی ڕاگەیاندبوو.

بەمجۆرە بۆ هەمووان دەرکەوت کە بیابان چیتر بەتەنها موڵکی قوڕەیش و ملهوڕانی مەککە نییە. بەڵکو پێغەمبەری ئیسلامیش (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) ماف و پشکی خۆی هەیە. بە تێپەڕبوونی ڕۆژگاریش ئەو مافە زیاد دەکات و، هاوشێوەی بڵاوبوونەوەی تیشکی ڕووناکی، ئەویش تەشەنە دەسێنێت تاکو لە تەواوی خانە و ویژدان و بیر و هۆشەکاندا جێی خۆی دەکاتەوە. مێژوو شاهیدە کە هەر بەڕاستیش جێی خۆی کردووەتەوە...

## ٧. یەکە سەربازییەکان

### أ. یەکەمین یەکەی سەربازی و حەزرەتی حەمزە

هەر ئەوەندەی پێغەمبەر (عَلَیهِ أفضَلُ صَلاةٍ وَسَلَام) گەیشتە مەدینە، دەستبەجێ هەستا بە پێکهێنانی یەکەیەکی سەربازی کە لە سەد کەس پێکهاتبوو و ،حەزرەتی حەمزە سەرکردایەتی دەکرد. تۆڕە هەواڵگرییەکەی خۆشەویستمان بە ئەندازەیەك چڕ و فراوان بوو، لەکاتی خۆیدا لە ورد و درشتی پێشهاتەکان ئاگادار دەبووەوە. لەو ڕۆژانەدا کاروانێکی بازرگانیی قوڕەیش بە نزیك مەدینەدا و بە بەرچاوی موسڵمانانەوە گوزەری دەکرد. کاروانەکە بریتی بوو لە ماڵ و سامانی زەوتکراوی موهاجیران. لەڕاستیدا ئەمە وەك مەیدانگیرییەك وابوو بۆ موسڵمانان. حەزرەتی حەمزەش بەخۆی و یەکەکەیەوە بە چەشنێکی تەواو جیاواز بەرەو ڕوویان ڕۆیشتن. کەس زیانی پێ نەگەیشت، بەڵام بە چەشنێك زەندەقیان چوو، بێنەوەی ئاوڕ بدەنەوە خۆیان کۆکردەوە و هەڵهاتن..[1] خەڵك تەماشای ئەم دیمەنەیان دەکرد و لە دڵی خۆیاندا بەمجۆرە بیریان دەکردەوە: کەوابێت لەمەودوا سەرانی مەککە ئەو ڕاستییە قبووڵ دەکەن کە جگە لەوان هێزی تریش هاتووەتە مەیدان.

وێناکردنی ئەو بارە دەروونییەش کە ڕووداوەکە لە ناخی خەڵکیدا بەجێی هێشت، لای هەمووان ئاشکرایە. مەککەییەکان لە زۆربەی ئەو جموجوڵە سەربازییانەدا چارەیان لە هەڵهاتندا دەبینییەوە. سەرەنجام دانیشتووانی ناوچەکانی دەوروبەریش سەنگی موسڵمانانیان لە هاوکێشەی هێزدا بۆ دەردەکەوت و بە چاوێکی جیاوازترەوە لێیان دەڕوانین.

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٣/١٤٠-١٤٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٣/٢٤١-٢٤٦.

بەڵێ. حەزرەتی محەممەد موستەفا (صَلَّىاللهُعَلَيْهِوَسَلَّم) وەك سەركردەیەكی سەربازیی ناوازە، دوژمنانی ڕاودەنا و، بەو واتا و ڕۆحییەتە هەمووانی دەخستە ژێر كاریگەرییە نەفسووناوییەكەی خۆیەوە. ڕۆژ دوای ڕۆژیش دڵەكان نەرم دەبوون بۆ ئیسلام و، تیرە و هۆزەكان پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئایینی تازەوە. ئاساییش گەڕایەوە بۆ ڕێگەوبانەكان و ئیسلام هێز و برەوی خۆی دەرخست. كاتێكیش ئیسلام بووە نوێنەری حەق، ئەو مەچەك و بازووەی نمایشكرد كە پاراستنی حەق داخوازی بوو. ئیتر مرۆڤەكان بە جۆرێكی جیاواز لە جاران بیریان دەكردەوە.

## ب. دووەمین یەكەی سەربازی

پاش ماوەیەك یەكەی دووەمی ڕێكخست. لەو هەڵمەتەشدا هیچ پێكدادانێك ڕووی نەدا. چونكە مەبەست ئەوەبوو هێزێك بنێردرێت بۆ شوێنێكی دیاریكراو. تا ئەوانەی بە ئۆژیكی هێز دەدوان، تێبگەن كە هاوكێشەكان گۆڕانكارییان بەسەردا هاتووە و مەرج نییە هێزی ئەوان لە هەموو شوێنێكدا قسەی كۆتایی بكات.

واتە، هێزێك كە مل نانێت بەرەو زۆردارى و داپڵۆسین. بەڵكو هەمیشە لەپاڵ مافپارێزی و دادگەریدایە. تا ئەو ئاستەی ئەگەر ئەو خاوەن هێزانە پێویستییان بە كەمێك شیر ببووایە، داوای مۆڵەتیان لە خاوەنەكەی دەكرد و لەبەرامبەریشدا پارەیان دەدایە. ئەم هەڵسوكەوتەی موسڵمانان شتێكی تازە و نامۆ بوو بۆ دەشتەكییەكانی بیابان. كاتێك ئەو دیمەنانەیان دەبینی، سەراسیمە دەپرسكان و دەیانوت "تۆ بڵێیت ئەمانە ئەو فریشتانە بن كە ئیبراهیم

پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَام) هەواڵی دابەزینی دابوون لە ئاسمانەوە؟" ئای ئەوە چ گومان و بیرکردنەوەیەکی شیرین بوو!

## ج. یەکەی سەربازیی عوبەیدەی کوڕی حاریث

عوبەیدە، کوڕی حاریثی مامی پێغەمبەر و نەوەی عەبدولموتەللیب بوو. کاتێك لە بەدردا لەنێو خەڵتانی خوێندا بە قاچی بڕاوەوە هێنایانە خزمەت پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ)، بەدەم گیانەڵاوە پرسی "ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا من شەهیدم؟"[1] ئەویش فەرمووی "بەڵێ"...

ئەو یەکەیەی عوبەیدەی کوڕی حاریث سەرکردەی بوو، تا ناوەڕاستی دۆڵی "رابغ" پێشڕەوی کرد، پاش ئەوەی ترسی خستە دڵی دوژمنەوە گەڕایەوە.[2] دیارە ئەوەیش شتێکی لەناکاوی پێوانەیی و چاوەڕواننەکراو بوو بۆ هەریەکە لە قورەیش و سیخوڕ و سەرقافڵەی کاروانەکانی. قورەیش بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە پەشۆکاویی ئەم هەڵمەتە ڕزگاری نەبوو.

## د. خۆی فەرماندە بوو

یەکە تایبەتەکان یەك لەدوای یەك هەڵمەتیان دەبرد. پاش ماوەیەك پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە سەرکردایەتی خۆی یەکەیەکی دووسەد کەسی بە مەبەستی چاوترساندنی کاروانێکی قورەیش کە بەرەو شام دەڕۆیشت، خستە جوڵە. زۆر بە وردی نەخشە و پلانی بۆ هەمووشتێك داڕشت و سەرجەم

---

١. الطبري، تاريخ الأمم و الملوك ٣٢/٢؛ الحاكم، المستدرك ٢٠٨/٣.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ١٣٦/٣؛ الحاكم، المستدرك ٢٠٧/٣.

ڕێگاکانی خستە ژێر چاودێرییەوە. بەجۆرێك ئەگەر ڕێگەی بە تێپەڕبوونی کاروانەکە نەدایە، هەرگیز نەیاندەتوانی تێبپەڕن.

جێی باسە ئەم هەنگاوە هەڕەشەیەکی هێندە کاریگەر بوو، قورەیشی بەجارێك هەراسان کرد. بێهیچ پێکدادانێکیش پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و یارانی گەڕانەوە.[1]

دواتر یەکەیەکی تری بە هێزێکی بچووکترەوە بۆ هەمان ئامانج ڕێکخست و گەیشتنە "بواط"، لەوێ دوژمنانی خوایان ترساند و گەڕانەوە. بەهەمان شێوە ڕووبەڕووی نەیارانی عوشەیرەش بوونەوە.[2]

هەموو ئەو جموجوڵانە بەئاگاهێنانەوەی هۆز و دەستڕۆیشتووەکانی ناوچەکە بوو سەبارەت بەو ڕاستییەی کە هێزی موسڵمانان زامنی پاراستنی ئارامی و ئاسایشی بیابانە لەبەرامبەر جەردە و تاڵانخوازاندا.[3]

## هـ. یەکەی سەربازیی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش

دوایین یەکەی سەربازی کە پێکی هێنا بە سەرکردایەتی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش بوو کە پورزای خۆی بوو. وەك دەبینن خزمە نزیکەکانی هەڵدەبژارد بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکە سەختەکان. خزمایەتی بیروباوەڕی بە خزمایەتی خوێنەوە گرێ دەدا و توندوتۆڵتری دەکرد. چونکە تا ئەو کاتە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ڕاستەقینە لەنێوان سەبازگەی کوفر و ئیماندا ڕووی نەدابوو. جەنگان لەگەڵ

---

١. إبن كثير، البداية و النهاية ٣/٢٤٦-٢٤٧.

٢. إبن كثير، البداية و النهاية ٣/٢٤٦.

٣. إبن كثير، البداية و النهاية ٣/٢٤٣.

خزم و کوشتاریان شتێك بوو بیابان و یاساکانی بیابانی سەروژێر دەکرد. لەم ڕووەوە جەنگی بەدر گرنگییەکی تایبەتی هەبوو. ڕێگەی بەدریش بەم یەکەسەربازییانەدا تێدەپەڕی. بۆ ئەم یەکە سەربازییانەش کە گوزەرگەی بەدری گەورە بوون، کەسانی وەك حەمزە و عوبەیدە و سەعد و عەبدوڵلای کوڕی جەحشی دەکردە سەرکردە، چونکە دەیویست ئەو بەرپرسیارێتییە قورس و ئەرکە گرانە بدات بەسەر شانی خزمانی خۆیدا. ئەمەش خۆی لە خۆیدا پێچەوانەی لۆژیکی بیابان و باوی خێڵەکی بوو. لەم نێوەندەشدا خۆی بەشداری سێ چوارێك لە یەکەکانی دەکرد.

عەبدوڵلای کوڕی جەحش پورزای پێغەمبەر بوو. لەدواییدا بووە شۆڕەسواری ئوحود. ئەم هاوەڵە بەرێزە بەدەست چاوکزییەوە دەیناڵاند، کەمێك تارمایی نەبێت هیچی دیکەی نەدەبینی. وێڕای ئەوەش لە هیچکام لە جەنگەکان دوا نەدەکەوت، لە بەدریشدا دلێرانە بەرگری کرد. ڕۆژی ئوحودیش کە بینی موسڵمانان تووشی شکست هاتوون، خۆی پێنەگیرا و مەردانە بەرەو ڕووی مەرگ شاڵاوی برد.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەگێڕێتەوە "عەبدوڵلای کوڕی جەحش ڕۆژی ئوحود پێی وتم: ئەوە بۆ نایەیت لە خوا بپاڕێینەوە؟ (بەڕاستی خزمایەتی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەر لە خۆت جوانە.. ڕۆحت شادبێت و مەنزڵت فیردەوسی بڵند بێت.. تۆ ئەو ڕێگایەت نیشاندایین کە دەبووایە بمانگرتایەتە بەر! تۆ ئەو کەسە بوویت کە فێرت کردین مردنی سەربەرزانە لە ژینی سەرشۆڕانە باشترە. تۆ بە بەخشینی گیانی خۆت، ئەو وانەیەت فێرکردین کە لە شوێنێکدا باس لە مردنی پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بکرێت، ژیان لەو شوێنەدا بێ واتایە. ڕۆحت شادبێت!) دەڵێت: هەردووکمان کەنارمان

گرت، سەرەتا سەعد دوعای کرد "خوایە ئەگەر بەیانی ڕووبەڕووی دوژمن بووینەوە، تووشم بکە بە تووشی کەسێکی زۆر ئازا و توندوتیژەوە، منیش لەپێناوی تۆدا بیکوژم و چەك و تفاقەکەی لێ بسێنم." عەبدوڵڵاش وتی "ئامین." ئەوجا عەبدوڵڵا کەوتە پاڕانەوە ئەو عەبدوڵڵایەی جگە لە دوا ڕۆژ و پەروەردگار بیری لەهیچ شتێکی دی نەدەکردەوە.چاوی لە دەستکەوتی کەم بڕی بوو، ڕووی وەرچەرخاندبوو بۆ دەسکەوتی زۆر لە خەلقەوە بەرەو حەق و لە بەرەو وەحدەت ئاڕاستەی گۆڕیبوو "خوایە سبەینێ کابرایەکی بەزەبری توندوتیژم بەنسیب بکەیت، لەڕێی تۆدا لەگەڵیدا بجەنگم. پاشان ئەو بمکوژێت و لاشەکەم ببات و لوت و گوێم ببڕێت (چونکە بۆمن ئیدی ژیان هیچ واتایەکی نیە. چونکە گەر پێغەمبەری خوا شەهیدبووبێت ئیدی ژیان بۆ لێرە شتێکی پوچ و بێنرخە.) جا کە هاتمە حزووری دیوانت تۆ لێم بپرسی: ئەی عەبدوڵڵا لە پێناوی چیدا لوت و گوێت بڕاوە؟ منیش بڵێم: لە پێناوی تۆ و پێغەمبەرەکەتدا. وەك بڵێیت بیەوێت بڵێت پەروەردگارە! من شەرمم کرد لەوەی ئەندامە گوناهبارەکانی جەستەمت بۆ بهێنمەوە، بۆیە کاتێك لەڕێی خۆشەویستەکەتدا دەجەنگام فڕێم دان و پاشان هاتمە لات. تۆش بفەرموویت: ڕاستت وت."

سەعد دەڵێت "دوعاکەی عەبدوڵڵا لە دوعاکەی من چاکتر بوو. بەچاوی خۆم بینیم دەمەوئێوارە لوت و گوێی بە دەزوویەکەوە هەڵواسرابوو."[1]

ئیتر ئا ئەوەیە عەبدوڵڵای کوڕی جەحش، سەرکردەی یەکەی نەخلە، کە سەروەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەگەڵ دوازدە لە هاوەڵانی ناردبوونی بۆ شوێنێك

---

١. أبو نعيم، حلية الأولياء ١٠٩/١؛ إبن الأثير، أسود الغابة ١٩٥/٣؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ٣٠١/٩؛ إبن حجر، الإصابة ٣٥/٤-٣٦.

کە پێی دەوترا نەخلە و (٥٠٠ کیلۆمەتر) لە مەدینەوە دوور بوو. ئەو جێگەیە لە مەککەوە زۆر نزیك بوو. دەبووایە ئەو یەکەیە بڕۆیشتایە بۆ ئەوێ و پاش چاودێری و وردبینی، هەواڵ و زانیاری ببردایەتەوە بۆ مەدینە. جا ئەگەر کەسێك چەند جارێك مەرگی لەبەرچاو نەگرتایە، ئەستەم بوو بە کارێکی لەوجۆرە هەڵبستێت. بۆیە دەتوانین بڵێین پێغەمبەری خوا (صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّمْ) لەو هەڵبژاردنەدا جارێکی تر فەتانەتی بیرێنەی خۆی سەلماندەوە. چونکە کەسێکی وەهای دەستنیشانکرد لە ئاست بەرپرسیارێتیی ئەرکەکەدا بێت. زۆر پێویست بوو ئەو کەسەی هەڵی دەبژارد یەکێك بووایە گاڵتەی بە ژیان بهاتایە و مەرگ لە دەستی هەڵبهاتایە. عەبدوڵلای کوڕی جەحشیش مەردی ئەو مەیدانە بوو.

پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَیهِ) نامەیەکی دا بە عەبدوڵلا. نامەکە ئەو فەرمانانەی تێدا بوو کە دەبووایە یەکەکە بەجێی بگەیەنێت. داوای لێکرد نامەکە نەکاتەوە تا ئەو کاتەی دەگەنە شوێنی مەبەست. هاوکات ئامۆژگاری کرد زۆر لە کەس نەکات بۆ بەشداریکردن، بەڵکو تەنها ئەو کەسانە هەڵبژێرێت کە خۆبەخشن. ئەوەبوو هەر لە سەرەتاوە یەکێکیان پۆزشی هێنایەوە و پاشگەزبووەوە. بەڵام ئەوانی تر فەرمانیان بەجێگەیاند و بەڕێکەوتن تا گەیشتنە نەخلە. بە گەیشتنیان نامەکەی پێغەمبەریان کردەوە و دەستیانکرد بە خوێندنەوەی. فەرمانەکانیان وەك خۆی جێبەجێکرد. بەڵام لەو نێوەندەدا پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراو بەرۆکی گرتن. ئەوەبوو بێباوەڕێکیان کوشت و دەستیشیان گرت بەسەر سامانی ئەوانەدا کە هەڵهاتن. ئەمە ڕووداوێکی کتوپڕ بوو، ئاخر پێغەمبەر (عَلَیهِ اَفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) فەرمانی جەنگی پێ نەکردبوون. خەڵکی مەککەش ئەم ڕووداوەیان قۆستەوە و کردیان بە هەرا و وتیان "محەممەد و

هاوەڵانی لە مانگی حەرامدا شەڕیان حەڵاڵکردووە و خوێنیان ڕشتووە و ماڵ و سامانیان زەوتکردووە!“ دواتر چەند ئایەتێك سەبارەت بەم بابەتە دابەزین[1] و ئەوەیان ڕوونکردەوە کە ئەو ئاشووبەی ئەوان هەڵیان گیرساندووە، زۆر لەوە خراپترە کە لە مانگە حەرامەکاندا خوێن بڕژێت.[2]

١. سورەتی البقرة، ئایەتی ٢١٧.

٢. إبن هشام، السیرة النبویة ٣/ ١٤٦-١٤٧؛ إبن کثیر، البدایة و النهایة ٣/٢٤٨-٢٥٢.

## ٨. دەرەنجامی یەکە سەربازییەکان

### أ. باڵادەستی لە ناوچەکەدا

هەرکە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە مەدینە جێگیر بوو، دەستبەجێ دەستی کرد بە ڕێکخستنی جموجوڵێکی سەربازیی وەها کە دوژمنەکانی ناچارکرد خۆیان بخزێننە پەناوە و ترس و لەرز بڵاوبێتەوە بەناویاندا. لە ئاکامی ئەمەشدا سەرچاوە ئابوورییەکانیان کەوتە مەترسییەوە و تووشی چەندەها قەیرانی دارایی بوون. لەو ڕێگەیەشەوە سەروەرمان پێشهاتەکانی ئاڕاستەی "بەدری مەزن" دەکرد.

لەو میانەشدا تۆڕێکی هەواڵگری فراوانی ڕێکخست. قورەیشیەکان ئەوەندە پەشۆکابوون، تەنانەت ترسی ئەوەیان هەبوو پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بزانێت لەناو ماڵەکانیاندا چی دەگوزەرێت. (ئەو بابەتەی بووبووە مقۆمقۆی هەموو جێیەك، ئەمە بوو: ئەو کەسەی تۆڕێکی هەواڵگری لەم شێوەی دامەزراندووە تەنانەت ڕێ بە تێپەربوونی مێشولەیەکیش نادات بێ هەواڵی خۆی و ئاگاداری هەر کارێك دەبێت کە دوژمنانی ئەنجامی دەدەن. هەر بۆیە سەختە بتوانرێت ڕەهەندەکانی ئەو ترس و دڵەڕاوکێیە بخەمڵێنرێت کە لەدڵی دوژمناندا دروست بووبوو). بیرم دێت لەکاتی خزمەتی سەربازیدا پێیان دەوتین کە "محاربة" واتە "مخابرة". واتە جەنگ بریتییە لە هەواڵگری. ئەگەر تۆ دەزگایەکی هەواڵگری چالاك و سیستەمێکی ئاڵوگۆڕی زانیاری تۆکمەت هەبێت، ئەوا مانای وایە کە نیوەی سەرکەوتنت مسۆگەرکردووە. ئەمە بەو مەرجەی هەواڵەکانت دزە نەکەن بۆ دوژمن و تۆش ئاگاداری سات بە ساتی

ئەوان بیت و زانیارییەکان ڕاستەوخۆ ئاڕاستەی ناوەند بکەیت. ئەگەرچی لەم سەردەمەدا تەکنۆلۆژیا زۆریش پێشکەوتووە، کەچی هێشتا زەحمەتە هەواڵێکت پێبگات و بەرامبەرەکەت پێی نەزانێت. ئەمە لەکاتێکدا پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) توانی لەو هەلومەرجە سەرەتاییەدا تۆڕێکی تۆکمەی وەها دابمەزرێنێت کە لە توانایدا بێت بە خێراییەکی لەڕادەبەدەر و لە کەشێکی پڕ متمانە و ئارامدا یەك بەیەکی هەواڵەکانی پێ بگات. وەك چۆن لە ڕێگەی فریشتەیەکی پایەبەرزی ئەمینی وەك حەزرەتی جوبرەئیلەوە بەوپەڕی پارێزراوی و متمانەوە نیگای خوایی بۆ دەهات،[1] تۆڕە هەواڵگرییەکەشی بەهەمان متمانە و ئەمانەتەوە کاری دەکرد.

کۆمەڵە سەرکردەیەك هەن کە خۆرئاوا بە بلیمەت و هەڵکەوتوویان دادەنێت. لە نموونەی ئەوانە: "قەیسەر، هانیباڵ، ناپلیۆن و هیتلەر"، بەڵام مێژوو گەواهیدەری ئەو ڕاستییەیە کە هیچ کام لەوان لە بواری هەواڵگریدا نەگەیشتوونەتەوە بە ئاستی پێغەمبەری خاوەن فەتانەتی مەزن (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ).

بەسەرهاتێك شك نابەین تێیدا باسی دزەکردنی هەواڵێکی پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّٰهِ عَلَيْهِ) بکات بۆ نەیارەکانی. ئەگینا چۆن دەیتوانی بە مشتێك باوەڕدارەوە بەسەر ئەو هەموو خوانەناسەدا سەربکەوێت. لەنێوەندی بازنەی هۆکارەکاندا (چاودێری و سەرخستنی خوایی)، پایەیەکی بنەڕەتیی (کارزانی و وریایی) پێك دەهێنن. لە بازنەی توانستیشدا کارزانی و وریایی ئامرازی بەتیی سەرخستنی خواییین. جا لەبەرئەوەی ئەو لە پێگەی ڕابەرێتی و پێشەنگیی ئوممەتدا بووە، بۆیە بەگوێرەی داخوازیی بازنەی هۆکارەکان هەنگاوی دەنا.

---

١. سورەتی التکویر، ئایەتی ٢١ (مُطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ).

با بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان: لە میانەی جەنگە جیهانییەکاندا بینیمان ئەگەر کەناراو و سنوورە بازرگانییەکانی وڵاتێك بکەونە بەر هەڕەشە و گورزی گەمارۆ، ئەوا وەك ئەوە وایە دەستخرابێتە بینەقاقای خەڵکی ئەو وڵاتە و هیوای سەرکەوتنیان لێ سەنرابێت. دیارە ئەوەش شێوازێکی کاریگەری هونەری جەنگە. بێگومان کاتێك دەست دەدەیتە تێکۆشان و بەرخۆدان دژی ئەو دوژمنانەی ئاواتیانە خوێنت بمژن، سەرەتا پێویستە جموجوڵیان پەك بخەیت.

بۆیە دەبینین یەکێك لە ئامانجەکانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) لە ڕێکخستنی تیم و یەکە سەربازییەکان، تێکشکاندنی پەلوپۆی دوژمنانی بوو. مەککە چیدی لەوە زیاتر ئاسایش و ئارامی نەمابوو، بابای دەشتەکی لە دڵی خۆیدا دەیوت ”ئیتر سەرانی مەککە ناتوانن بمانپارێزن و ببنە سەرچاوەی سەلامەتیمان. وا دیارە چارەنووسمان کەوتووەتە دەستی کەسانی دی. کەوابێت هیچ شتێك لەوە باشتر نییە هەرچی زووترە ئێمەش خۆمان بدەینە پاڵ ئەوان.“ بەڵێ، بەوجۆرە بیریان دەکردەوە. بۆیە ڕچەیان شکاند و دەستە دەستە هاتن بۆ خزمەت پێشەوای مرۆڤایەتی و موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند.

کاروانە بازرگانییەکان بەردەوام لەژێر هەڕەشەدا بوون، وێڕای ئەوەش هیچ کامیان زیانیان پێ نەگەیشت لەلایەن موسڵمانانەوە. بەدەر لەو تاکە ڕووداوەی نەخلە کە بێباوەڕێکی تێدا کوژرا.

## ب. بیابان؛ هەرێمێك لە دڵنیایی

لەگەڵ ناردنی یەکەکاندا پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) کەوتە چنینەوەی بەرهەمی پلانە ستراتیژییەکانی. ئەوەتا ئێستا دەسەڵاتێکی نوێ

لە نیمچە دورگەی عەرەبیدا دەرکەوتووە و بوون و کیانی خۆی سەلماندووە. لەبەرامبەر پاوانخوازی و زۆرداریی قورەیشدا. حەزرەتی محەممەد (صَلَوات‌اللهِ عَلَیه) و کۆمەڵەکەی وەستابوونەوە. سەرباری بەزاندنی دز و جەردە و ئەوانەی هێز مەستی کردبوون، کەچی ئەوان هیچکات هێز و دەسەڵاتی خۆیان نەکردە ئامرازی زوڵم و زۆرداری. لەکاتێکدا بەرەی بەرامبەر پشت ئەستوور بە هێز و دەسەڵاتیان، مافی لاوازیان زەوت دەکرد و، شەوکوتیان دەکردە سەر ماڵی خەڵك و بێپشتیوانیان دەچەوساندەوە.

هەرچی ئەم هێزە نوێیە هێزێکی تەواو جیاواز بوو. دەتوت لە ئاسمانەوە دابەزیوە. لەگەڵ ئەوەدا کە زەبری دەسەڵاتیشی بەدەستەوە بوو، کەچی لە ئاست حەقدا دەستەنەزەر دەوەستا و تا بڵێیت ڕێزی لە یاسا دەگرت. بەڵێ، لە مێژووی مرۆڤایەتیدا حەق یەکەمجاری بوو ئەو هەموو ڕێزە بەخۆیەوە ببینێت، ئەویش لەسەر دەستی مامۆستای مرۆڤایەتی هاتە دی. کەچی ئەوانی دی هەرڕۆژە و یاسایەکیان دادەنا کە لەگەڵ بەرژەوندیی خۆیاندا بگونجایە و، بەجۆرێکیش نمایشیان دەکرد دەتوت هەرخۆیان نوێنەری یاسان. ئەولاشەوە حەزرەتی محەممەد (صَلَّى‌اللهُ‌عَلَيهِ‌وَسَلَّم) هەردەم بەڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵ سەروەریی ئەو یاسا و ڕێسایانەدا دەکرد کە خواوەند دایبنابوون و پەنجەی بۆ بچووکترین یاساغ درێژ نەدەکرد.

بیابانشینان سەرجەم ئەو دیمەنانەیان بەچاوی خۆیان دەدی. یەکە سەربازییەکان بە بەردەم دەوارەکاندا دەهاتن و دەچوون، بەڵام بە هیچ کلۆجێك بیریان لەوە نەدەکردەوە دەستدرێژی بکەنە سەر ناموس و موڵکی ئەو خەڵکە.

لەڕاستیدا ئامانجی مامۆستای مرۆڤایەتی (صَلَّى‌اللهُ‌عَلَيهِ‌وَسَلَّم) ئەوەبوو

خەڵکی ئەوە ببینن. بۆیە وردە وردە متمانە مەککەی جێدەهێشت و ڕووی لە مەدینە دەکرد و لە ئاسۆی موسڵماناندا هەڵدەهات. ئاخر چونکە "متمانەپێکراو" لەوێ بوو. متمانەپێکراو ئەو "ئەمین"ە بوو کە خەڵکی مەککە قەدریان نەزانی و، سەرفرازی پەسنی "مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّه صادِقُ الوَعْدِ الأَمِينُ" بوو. هەنووکەش ئەو (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تەشریفی وا لە مەدینە. ئێمە دەزانین کە متمانە لای کەسی متمانەپێکراوە. خێڵ و هۆزە دەشتەکییەکان وەها بیریان دەکردەوە، بۆیە دەستیان دایە ڕۆیشتن بەرەو مەدینە.

بەتایبەت لەو دواییەدا قورەیش بەجارێك پەکی کەوتبوو و لەو ئاستەدا نەمابوو ببێتە جێی متمانە. نەك هەر ئەوە، بگرە دەستەوەستان بوو لە دابینکردنی ئاسایشی کاروانەکانی خۆی. ئەمەش ڕاستەوخۆ لەبەریەك هەڵوەشان و ترازانی لە ڕیزی بێباوەڕاندا لێ دەکەوتەوە. سەردارانی مەککەش بە بینینی ئەو دیمەنانە ئەوەندەی تر ڕق ئەستوور دەبوون و تووڕەییان تاوی دەسەند.

## ج. گرنگیی جوڵەی پێشوەخت

ورووژاندن و تەنگ پێ هەڵچنینی دوژمن، واتە ناچارکردنی بەوەی زووتر و لە ناوەختدا بکەوێتە جموجوڵ. لەم ڕوانگەیەوە پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّهِ عَلَيْهِ) دەیویست بەو جموجوڵە سەربازییانە نەیارەکانی شپرزە بکات. ئەوەبوو لەناو خۆیاندا کەوتبوونە قسە و قسەڵۆکی ئەوەی "ئەوەتا کاروانەکانمان لە مەترسیدان، محەممەد و هاوەڵانیشی بەئاشکرا هەڕەشە لە ژیانی ئابووریمان دەکەن. هەرچی دەسەڵاتی بیابانیشە وردە وردە دەکەوێتە دەستی ئەو. هیچ

چارە نییە جگە لەوەی بچینە بەدر و سنوورێکی بۆ دابنێین.“ بەڵێ، ئەبوجەهل(شەیتانەکەی سەردەمی نەفامی) وای پێ دەوتن. تەنانەت کاتێك هەندێکیان ویستیان لە نیوەی ڕێگادا بگەڕێنەوە، ئەو زیاتر هانی دان ”سوێند بێت ناگەڕێینەوە تا نەگەینە بەدر و سێ شەو لەوێ نەمێنینەوە. دەبێت لەوێ وشتر سەربڕین و شەراب بخۆینەوە و سەما و مۆسیقامان بۆ لێ بدرێت و عەرەب هەواڵی هاتن و هێزمان ببیستن، تاکو بۆ هەمیشە لێمان بترسن و سام و هەیبەتمان لە دڵیاندا بمێنێت، دەی بەڕێ بکەون!“ جا خۆ مەبەستی پێغەمبەری خواش هەر ئەوە بوو. قورئانیش هەر ئەوەی فێر دەکرد:

﴿ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِىٓ أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴾

(الأنفال: ٤٤)

"کاتێکیش بەیەکگەیشتن لە مەیدانی جەنگدا، لەبەرچاوی ئێوە خوا ئەوانی بە کەم نیشان دەدان و ژمارەی ئێوەشی لەبەرچاوی ئەوان بەکەم دەنواند. بۆئەوەی هەر ئەوە بێتەدی کە خوا بڕیاری لەسەر داوە. سەرەنجامی هەموو کار و کردەوەیەك هەر بۆلای خوا دەگەڕێتەوە."

خوای گەورە ژمارەی ئێوەی لەبەرچاوی ئەوان و ئەوانیشی لەبەرچاوی ئێوە کەم پیشاندا. تاکو لە جێیەکدا دیمەن و ڕووداوێك بێنێتە مەیدان کە بەلای هەمووتانەوە چاوەڕوانەکراو بوو. خوا خۆی بڕیاری دەرکردبوو، هەر دەبوو ئەنجام بدرایە. لەم ڕووەوە، ئەو چارەنووسەی بەسەریاندا دەهات مسۆگەر بوو، قوتاربوونیان بۆ نەبوو. نەیارەکانیی بەرەو ئەو ڕاپێچ دەکرد. ڕۆژێکیش دەهات لەناکاو لە بەدری گەورەدا خۆیان لەبەردەم موسڵماناندا دەبینییەوە.

چونکه هێشتا بێناگابوون له شێوازی جه‌نگیی پێغه‌مبه‌ر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).
خۆ هه‌ر ئه‌وان دووریان خستبووه‌وه و له شاره‌که‌ی خۆی ده‌ربه‌ده‌ریان کردبوو. که‌چی وا ئێستا له‌به‌رده‌میدا وه‌ستاون و ده‌له‌رزن.. وا دیاربوو له ماوه‌ی چه‌ند کاتژمێری داهاتوودا حاڵی ده‌بوون ئه‌و که‌سه‌ی که ساڵێکی ڕه‌به‌ق بوو خه‌ریکی چه‌سپاندنی حه‌ق بوو، یه‌که‌ی سه‌ربازی ڕێك ده‌خست تاکو ئه‌و مافانه‌یان لێ بسێنێته‌وه که زه‌وتیان کردبوو و وره‌ی ده‌ڕووخاندن، چ سوپاسالارێکی بێ هاوتا بوو. به‌ڵام ئه‌م حاڵیبوونه‌یان هیچ سوودێکی پێ نه‌ده‌گه‌یاندن. به‌ڵێ، له به‌دردا خۆیان له‌به‌رده‌م سه‌رکرده‌یه‌کی وه‌هادا بینییه‌وه که سه‌ریان له ستراتیژه سه‌ربازییه‌کانی ده‌رنه‌ده‌کرد. ئه‌وه‌نده‌ی نه‌برد وه‌ك گه‌ڵای پاییز هه‌ڵوه‌رین...

## د. هه‌موو پێشهاته‌کان ئاماده‌سازی بوون بۆ به‌در

ئه‌وان ئێستا له‌به‌دری گه‌وره‌دان.. به‌ڵام پێغه‌مبه‌ر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) وه‌ك مرۆڤێکی ئاسایی، یاخود به‌وێنه‌ی هه‌ر سه‌رکرده‌یه‌کی تری جه‌نگ نه‌چوو بۆ به‌در. ئه‌و زۆر چاك ده‌یزانی به‌ره‌و کوێ ده‌ڕوات. کاتێك هات بۆ ئه‌وێ، ده‌یزانی کاتژمێری سفر له‌گه‌ڵ دوژمنانیدا نزیکه و واده‌ی زۆران هاتووه. بۆیه هه‌تا گه‌یشته به‌در له‌ڕێی ١٧ یه‌که‌ی سه‌ربازییه‌وه دڵی دوژمنی خستبووه مشتیانه‌وه و زراوی تۆقاندبوون. به‌و نمایش و مانۆڕه سه‌ربازییانه‌ش که ئه‌نجامی ده‌دان، له هه‌موو خانه و کووچه و کۆڵانێکدا وره‌ی په‌ککه‌وتبوون و تووشی شۆکی کردبوون، کار گه‌یشتبووه ئه‌وه‌ی که‌وتبوونه گومان له هێز و توانای خۆیان. ناچاری کردبوون بڵێن "به‌ڕاستی مه‌ککه و ده‌وروبه‌ری ئاسایشی تێدا نه‌ماوه و جێی متمانه نییه." به‌و جۆره ڕای گشتی عه‌ره‌بی ده‌شته‌کی وه‌رچه‌رخا به‌لای ئه‌ودا و ئارامی و ئاسایش که‌وته ده‌ستی "ئه‌مین."

ئەم قەناعەتەش لای هەمووان دروست بووبوو، مەگەر هەر ئەوان نەبوون لە نەفامیدا نازناوی "محەممەدی ئەمین"یان لێنابوو و بە تاکە نوێنەری متمانە و دڵنیایی ئاوزەدیان کردبوو؟ ئەو لە زەمین و لە ئاسمانیش هەر ئەمین بوو. ڕۆژێکیان وەك گوزارشت لە خەڵاتی خوایی و وەك وەبیرهێنانەوەیەك، ئەم چەند وشەیە لە زاری پیرۆزی هاتەدەر "جا ئەگەر من ئەمین نەبم ئیتر کێ ئەمینە. من لە ئاسمان و لە زەویشدا ئەمینم."[1]

ئیدی خەڵکی بیابان بەڕوونی تێگەیشتبوون لەوەی کێ جێی متمانەیە و سەرچاوەی ئارامی و ئاسایشیش کوێیە. بەڵێ، ئەمین لە مەدینە بوو، واتە لە شاری دڵنیایی و ئارامی. دەسەڵاتیش لە دەستی قورەیشەوە کەوتبووە دەستی سەرداری قورەیش لە مەدینە. ئەو، سەرداری قورەیش و بەنی هاشم و تێکڕای مرۆڤایەتی و بوونەوەرانیش بوو... بەدیهێنانی ئەو مەبەست و ئامانجی بوون بوو. وە لەسەرو هەموو شتێکەوە ئەو بەهرەمەندی ستایشی "لَوْلَاكَ مَا خَلَقْتُ الأَفْلَاكَ (ئەگەر تۆ نەبوویتایە بوونەوەرانم بەدی نەدەهێنا.)"[2] بوو.

ئەگەرچی ئەم وتەیە لە ڕوانگەی پێوەرەکانی زانستی فەرموودەوە مۆڵەت وەرناگرێت و مافی هاتوچۆی پێ نادرێت، بەڵام لە ڕێگەی ئەو ڕوخسەتەوە کە تەبایی نێوان واتا و حەقیقەت پێی دەبەخشێت، دەتوانێت هەمووکات بە سەربەستی لە هەرێمی پەیڤدا هاتوچۆ بکات.

بەڵێ، ئەگەر ئەو نەبووایە واتای گەردوون وەك مەتەڵێك دەمایەوە و نەماندەتوانی بە حەقیقەتی شتاندا ڕۆبچین. هەروەها بێبەش دەبووین لە دەرککردن بە ڕاستییەکانی سەر بە دنیا و دوارۆژ و ویژدان و ئینسان. ژیانی

---

١. صحيح البخاري، المغازي ٦١؛ صحيح مسلم، الزكاة ١٤٤.

٢. العجلوني، كشف الخفاء ٢/٢١٤.

دنیاشمان هاوشێوەی ماتەمینگایەك دەهاتە پێش چاو. لەگەڵ هەر تەرمێکدا ئێمەش نوقمی پەژارە دەبووین و، هەر ڕووداوێکی ناسۆریش هەناسەی سوار دەکردین. لەوەوە فێربووین چۆن خۆمان لە تاریکایی ڕزگار بکەین و چاومان لە جیهانی نووردا هەڵبێنین. لە سایەی ئەودا سیمای دۆزەخینی دنیا -لەو ڕووەوە کە دەڕوانێت بەسەر خودی دنیادا و ئاوێنەیەك نییە بۆ دەرخستنی جوانی و کەماڵی بەدیهێنەر- گۆڕا و بوو بە بەهەشتی ڕازاوە بۆمان. لە وتە پرشنگدارەکانی ئەوەوە فێربووین کە ئیمان هەر لە دنیادا بەهەشت بۆ خاوەنەکەی دەسازێنێت. هەر لەوەوە فێربووین کە باوەڕدار تۆوی بەهەشتی لە ناخیدا هەڵگرتووە و دنیاکەشی بەهەشتێکە بۆخۆی. لەڕێی ئەوەوە گەیشتین بەو ڕاستییەی کە سەروەت و ئاسوودەیی دڵان بە یادی خوا دەبێت:

﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ (الرعد: ٢٨)

"ئاگاداربن! دڵەکان هەر بە یادی خوا خۆشنوود دەبن و دەحەوێنەوە."

بەڵێ، "بەختەوەری" تەنیا بە زۆری سامان و بوونی کۆشك و تەلار و خۆشگوزەرانی بەدەست نایەت، بەڵکو ئەوە باوەڕ و گوشادیی دڵ و دەروون و دەستگرتن بە بەها باڵا مرۆییەکانەوەیە کە ڕۆحی مرۆڤ لە کەنارەکانی ئاسوودەیی نزیك دەخەنەوە و حەز و ئارەزووەکانی هێور دەکەنەوە و بەدەم خواستەکانییەوە دێن.

ئەگینا گەر تەواوی دنیا بدرێت بە مرۆڤ، هێشتا خەم و ناسۆرەکانی کۆتاییان نایەت. لە سەرجەم ئەم بابەتانە و هاوشێوەکانیدا تاکە مامۆستا و فێرکارمان ئەو زاتەیە. هەروەك شاعیر دەڵێت:

قەرزاربارى ئەوە، چ كۆمەڵگە چ ئەفرادى

مەعصومێكە، قەرزاريەتى بەشەريەت بەيەكجارى

خوايە لە مەحشەريشدا لەسەر ئەم شايەتييە حەشرمان بكەى!

كاتێك هاوەڵان لەگەڵيدا بەرەو بەدر هەنگاويان دەنا، دڵيان بە تاسەى بەهەشتەوە هاتبووە جۆش. هەروەك ئەوەى قەدپاڵ و مێرگەكانى ببينن وەهابوو. چاك خۆيان سازدابوو، بۆيە كە گەيشتنە بەدر، لە باشترين دۆخى ڕەزامەندى و ئاسوودەييدا بوون. سەرجەم ويژدانەكان كەمەندكێش و ڕوو لەو بوون. مرۆڤەكان ئاوات و ونبووى خۆيان لە هەرێمەكەى حەزرەتى محەممەد موستەفادا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دۆزيبووەوە. ئيدى سەردەمى ئارامى بەخش و دڵنيايى پەخشى "ئەمين" دەستى پێكردبوو.

ڕۆژێكيان بە عەدى كوڕى حاتەمى فەرموو "ئەى عەدى! ئايا "حيرە"ت ديوە؟" وەڵامى دايەوە "نەمديوە، بەڵام بۆم باسكراوە." دەفەرمووێت "ئەگەر تەمەنت درێژ بێت دەبينيت كەژاوەى ئافرەت لە حيرەوە دێت بۆ مەككە و تەوافى كەعبە دەكات، لە خواش نەبێت لە كەسى تر ناترسێت. (گەرچى ئێستا سكاڵا لەدەست تەنينەوەى هەموو جێيەك بە دزو جەردە و كردارى پەستى ئەوان دەكەن)"[1]

لەڕاستيدا ئەو سەردەمەى سەروەرمان باسى دەكرد و مژدەى هاتنى دەدا، هەر لەوكاتەوە دەستى پێكردبوو. ئەو جموجوڵە سەربازييە زۆرانەى ئەنجامى دابوون، سەرەتا ئاسايش و ئارامى ناوخۆيان تۆكمە كرد، پاشان بناغەيان بۆ جەنگى بەدر داڕشت.

---

١. صحيح البخاري، المناقب ٢٥؛ سنن الترمذي، تفسير ١.

دەتوانین بڵێین لە کۆی هەڵمەتەکاندا کەسێك نەبووە زیانی لێ بکەوێت، یان دەستدرێژی بکرێتە سەر. ئەگەرچی یەکەکان لێرە و لەوێ بە خێرایی بروسکە دەردەکەوتن و بوونی خۆیان دەسەلماند، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵك لێیان دڵنیابوو، چونکە سەربازەکانی ئەو یەکانە تاقمی ڕاووڕووت و تالآنی نەبوون، بەڵکو سەربازی دەست و دڵ پاکی حەزرەتی محەممەدی ئەمین (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بوون و دژی بەدبەختی و بەدبەختان بوون. بە هەر کوێدا گوزەریان بکردایە، جگە لە هێمنی و ئارامی هیچ شوێنەوارێکی تریان بەجێ نەدەهێشت. تەنانەت هەمووان بە سەرسامییەوە دەیانپرسی "ئەم ڕەحمەتە لەکوێوە هاتووە؟"...

دیارە ئەو میهرە لە پەڵە هەورەکانی ئاسمانی حەقیقەتی ئەو زاتەوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) سەرچاوەی گرتبوو کە وەك ڕەحمەت بۆ تێکڕای جیهانیان نێررابوو. ئەو یەکە سەربازییانەش هەورەگرمە و هەورەبروسکەی وەشت و بارانی ئەو بوون. ئەو تروسکە و ڕووناکییەش کە لێیانەوە دەردەچوو، ئاوی ئەویان لە ئاسۆدا دەنەخشاند.

# ب. پێغەمبەر و جەنگەکانی

## ١. جەنگی بەدر و هۆکارەکانی

لەنێو شکۆمەندییەکی ئاسمانیی لەوجۆرەدا گەیشتنە بەدر..

ئیدی وادەی وەشاندنی گورزی کەمەرشکێن هاتبوو لەوانەی بەربەستیان دروست دەکرد لەبەردەم بانگەواز بۆلای خوا و بەرزکردنەوەی "کلمة الله"دا. هەروەها پەیامێك بوو بۆ دوژمنانی خوا تاکو پێیان بڵێت "لە ئێستا بەدواوە ناتوانن ببنە ڕێگر لە شەکانەوەی بەیداخی پەیامی خوایی و، زەوتکردنی ئازادیی ئەو دەروونانەی بە سروەی یادی ئەو دەشنێنەوە."

بەڵێ، دەبێت ناوی پیرۆزی زاتی پەروەردگار قەتیسی جێگەیەکی دیاریکراو نەبێت. بەڵکو دەبێت ڕێی بۆ خۆش بکرێت بچێتە ناو هەموو سینەیەکەوە و، سەرجەم گیانەکان بە ئاسوودەیی ئاشنا بکات. بە مەبەستی لادانی کۆسپەکانی سەر ڕێی "بەرزکردنەوەی ناوی خوا" و ڕزگارکردنی لە دیلی و پێشکەشکردنی ئەو چەمکە بە مرۆڤایەتی وەك ئەرك و فەرمانبەرییەکی سەرشانی.. هەروەها بە مەبەستی کردنەوەی ئەو ڕێگایانەی دەچنەوە سەر ئازادیی بیروباوەڕ، حەزرەتی محەممەد دوا گورزی خۆی لە ستەمکارە سەرکەشەکانی مەککە دەسرەواند.

لەلایەکی دیکەوە، موسڵمانان هەرچی ماڵ و سامانیان هەیە لەدەستیان دابوو. چونکە کاتێك لە مەککەوە کۆچیان کرد، نەیانتوانی شتێکی ئەوتۆ لەگەڵ خۆیان ببەن، چییان هەبوو لە مەککە جێیان هێشتبوو. مەککەییەکانیش

ماڵ و حاڵی موسڵمانانیان باری وشتر دەکرد و بە بەرچاویانەوە دەیانبرد تا لە شام یان یەمەن بیانفرۆشن و مامەڵەیان پێوە بکەن. باری ئەو کاروانەی بە نزیک مەدینەدا گوزەری دەکرد، موڵکی موسڵمانان بوو، بۆیە هەرچۆنێک بوو دەبووایە دەستیان بخستایەتەوە.

دیسانەوە پێویست بوو سزای ئەوانە بدرێت کە باوەڕدارانیان شاربەدەر دەکرد و ئازاریان دەدان. تەنانەت هەندێکیان بە نێزە سکی موسڵمانیان کوناودەر دەکرد و دەیانکوشتن. دەبووایە گورزێکی جەرگبڕیان ئاراستە بکرێت و پێیان بوترێت "هێز لە چنگی ئەواندا نەماوە، بەڵکو ئێستا لە دەستی مافپارێزی حەقدایە. خوای باڵادەستیش هێز بەو لایەنە دەبەخشێت کە ملکەچی حەق و ڕاستییە. گەر ئەمڕۆش نەبێت ئەوا سبەی هەموو هێزەکان لە بەرەی حەقدا کۆدەبنەوە و حەق قسەی سەرەتا و کۆتایی دەکات. ڕۆژگارێکیش دێتە پێش تیایدا هێزی حەقویستی دەبێتە فەرمانڕەوای دڵان و، هەمووان ڕێز لە مرۆڤ و ئەو واتا بەرزانە دەگرن کە هاودەم لەگەڵ مرۆڤدا هاتوون." حەزرەتی محەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) جەنگی ئەمەی دەکرد.

لەم نێوەندەشدا چەند هۆز و تیرەیەک مابوون خۆیان یەکلا نەکردبووەوە بچن بۆ لای چ لایەک. هەندێکیان حەزیان دەکرد موسڵمان ببن، بەڵام لە ستەم و داپڵۆسینی قوڕەیش دەترسان. بۆیە بە دوودڵی و سەرسامی مابوونەوە. ئەمانە لەوجۆرە بوون کە پێیان هەڵدەهێنا بەڵام نەیاندەتوانی هەنگاو بنێن.

کاتی ئەوە هاتبوو هەنگاو بەو جۆرە خەڵکەش بنرێت. پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت دەسەڵات لە دەستی پێغەمبەردایە و تەرازووی هێزیش ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە و لە بەرژەوەندی مەدینەدایە، ئیتر بەوە ئاسوودە بوون و توانییان

ئەو هەنگاوە بنێن. وەك ئەوە وابوو سەردارمان پێیان بڵێت "مەترسن، دڵگران مەبن، خوای گەورە دەرووتان لێ دەکاتەوە. ئەگەر ئێوە ئیمانتان هەبێت، ئەوا خوا دەرگا و پەنجەرەکانتان بۆ دەخاتە سەرپشت تاکو بگەن بە ئارامی و ئاسوودەیی."

پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بەو شێوازە دەیدواندن، بەڵام ئەوانەی دوودڵ بوون تا کۆتایی جەنگی بەدر یەکلا نەبوونەوە. ئیدی دەرکەوت کە تەرازووی هێز جێی گۆڕیوە. بێباوەڕانی مەککەش توانای ئەوەیان نەمابوو دەستی بە ئازاریان بۆ درێژ بکەن. بۆیە پەنایان بردە بەر مەدینەی پایتەختی مەدەنییەت و حەزرەتی محەممەد (ئەو مرۆڤە مەزنەی هێزی مەدەنیەتی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو) بەدەم وتنی "لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّه مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّه"وە بەرەوڕووی حەقیقەتێکی نوێدا بێدار دەبوونەوە.

## أ. هێزەکانی بەدر

لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی "ژیاننامە و غەزاکان"دا هاتووە کە پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لەگەڵ (٣٠٥) کەس لە هاوەڵانی بەرەو بەدر کەوتە ڕێ. هەندێك سەرچاوەش دەڵێن ژمارەیان (٣١٣) کەس بووە.[1] هەندێکی تریش پێیان وایە ئەو ژمارەیە، هاوتای ژمارەی ئەو جەنگاوەرانەیە کە بە یاوەری حەزرەتی داود (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بەرەنگاری جالوت بوونەتەوە.

بەڵێ، لەو دوو سەردەمەدا هەڵمەتی گۆڕینی چارەنووسی مرۆڤایەتی بەرپاکراوە و، لەشکری نوور دژی تاریکی وەستاوەتەوە. جا لەبەرئەوەی هەردوو

١. ابن هشام، السيرة النبوية ٢٦١/٣؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٢٦٨/٣.

باڵەکە لە حەقیقەتی حەنەفییەتدا یەکدەگرنەوە، واتە یەکێکیان نمایندەی لوتکەی ئیسحاقە و، ئەوی دیکەشیان نمایندەی لوتکەی ئیسماعیل، بۆیە سرووشتییە ژمارەی هەردوو سوپاکە (٣١٣) بووبێت.[1]

بەڵێ، هەروەك موحیەددینی عەرەبی لە پەڕاوی "فصوص الحكم"دا ئاماژەی بۆ دەکات، سەرکردەی یەکێك لە دوو سوپاکە حەزرەتی داود پێغەمبەر بووە (عَلَيهِ السَّلَام)، کە نوێنەری خەلافەت بووە. سەرکردەی دووەمیشیان نوێنەری شەفاعەتی مەزن و مەقامی فەردییەت؛ تاقانەی ناوازە، حەزرەتی محەممەد موستەفا (عَلَيهِ أَفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) بووە.

سوپای بەدر خاوەنی دوو ئەسپسوار و سی بۆ چل وشتر بوو. لەبەرامبەردا بتپەرستان (٢٠٠) ئەسپیان پێبوو. واتە بەرامبەر هەر ئەسپێکی موسڵمانان ئەوان خاوەنی سەد ئەسپ بوون. ئەمەش مانای وایە بۆ هەر ئەسپسوارێك سەد ئەسپسوار هەبووە. بەرامبەر بە (٣١٠) موسڵمانیش، بتپەرستان نزیکەی (١٠٠٠) کەس دەبوون.[2] واتە هەر موسڵمانێك سێ تا چوار کەسی بەردەکەوت.

جگە لەوە، قورەیش بە سوپایەکی پڕچەکی تیر و تەسەڵەوە هاتبوو، کە بە باشترین کەرەستەی جەنگیی ئەو سەردەمە ئامادەکرابوو. کەچی سوپاکەی پێغەمبەر بەنۆرە سواری ئەو چەند وشترە دەبوون کە پێیان بوو. (٢٠٠) کیلۆمەتریشیان بەو شێوەیە بڕی...

وای بۆ دەچم زانینی ئەم شتانە بیرۆکەیەکی دروستمان بدەنێ سەبارەت بەو هەلومەرجەی جەنگەکە تێیدا ڕوویداوە. بیابان بوو.. لە گڕەی هاویندا

١. الطبري، جامع البيان ٦٣١/٢؛ الشوكاني، فتح القدير ٢٦٨/١.

٢. إبن كثير، البداية و النهاية ٢٦٠/٣.

بوو.. مانگی ڕەمەزان بوو و موسڵمانان بەڕۆژوو بوون.. دەشبوایە ماوەی دووسەد کیلۆمەتر ببڕن.. ئایا دەزانن بیابان چییە؟ یان بەدر لەکوێیە؟ ئەوانەی حەجی ماڵی خوایان کردووە کەم تا زۆر دەزانن. لە ئێستادا لەسەر ئەو ڕێگەیە چەند وێستگەیەکی سووتەمەنی لێیە. خۆ ئەگەر وا دابنێین ئەو چەند وێستگە و مێرگەی لێ نەبێت -کە لە ڕاستیدا ئەوانیش زۆر تازەن- ئەوا جگە لە لم و بیابانێکی پان و بەرین شتێکی دیکە نابینیت. جارجاریش گەردەلوولی لمی و گێژەڵوکە لێرە و لەوێ هەڵدەکەن و هەڕەشەت لێ دەکەن. جا ئیتر بیهێننە پێشچاوی خۆتان؛ دوو مانگەڕێ لە چەند ڕۆژێکدا کورت کراوەرتەوە.. ئەویش بە پیادە!

دیوێکی تری باسەکەش ئەوەیە کە لە بنەڕەتدا موسڵمانان بە مەبەستی چاوترساندنی کاروانەکەی قورەیش دەرچووبوون. بەڵام ئەوەندە هەبوو ویستی خوایی شتێکی تر بوو و ئەوانی بە ئاڕاستەیەکی دیکەدا ڕاپێچ دەکرد. خوای باڵادەست لە سورەتی "ئەنفال"دا ویستی سوبحانیی خۆیمان بەمجۆرە بۆ ڕوون دەکاتەوە:

﴿ وَإِذْ يَعِدُكُمُ اللَّهُ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ الشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ اللَّهُ أَن يُحِقَّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَيَقْطَعَ دَابِرَ الْكَافِرِينَ ﴿٧﴾ لِيُحِقَّ الْحَقَّ وَيُبْطِلَ الْبَاطِلَ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ ﴾

(الأنفال: ٧-٨)

"یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە خوا بەڵێنی پێدابوون یەکێك لەو دوو دەستەیە بەڕاستی بۆ ئێوە دەبێت (یان کاروانەکە، یان سەرکەوتن بەسەر لەشکرەکەدا)، ئێوەش بەڕاستی ئاواتەخوازن و حەز دەکەن کاروانە بێ چەك و ئاسانەکە بۆ

ئێوه بێت. خواش دەیەویت حەق و ڕاستی بە فەرمانەکانی خۆی بچەسپێنێت و، کافرانیش بنەبڕ و ڕیشەکەن بکات."

## ب. ڕووبەڕووبوونەوە

هەرچەندە موسڵمانان نیازی شتێکی تریان هەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی خوای گەورە ویستی وابوو، بۆیە ڕووی وەرچەرخاندن تا لەگەڵ سوپای بتپەرستان ڕووبەڕوو ببنەوە نەک کاروانەکە. موسڵمانان حەزیان دەکرد شوێن کاروانەکە بکەون و ماڵ و داراییان وەدەست بهێننەوە. کەچی خوای کارجوان بەوکارە دەروازەکانی سەردەمێکی نوێی بۆ خستنە سەرپشت. سەردەمێک کە بۆ هەتا هەتایە ڕێ نەدەن کەس ماڵ و سەروەرییان زەوت بکات. بەڵێ، موسڵمانان گورزێکی وەها بەزەبریان لە بێباوەڕان دەوەشاند، کە نەتوانن جارێکی تر بێنەوە هۆش خۆیان و ڕاست ببنەوە.

وەک دەرەوشانەوەیەکی ناوەڕۆکی: الحَقُّ يَعْلُو وَلَا يُعْلَى عَلَيه (هەمیشە حەق و ڕاستی سەردەکەوێت و هیچ شتێکی بەسەردا زاڵ نابێت)، لەوە بەدوا سەرکەوتن و بڵندی بۆ حەق دەبوو و هیچ شتێک لەو بڵندتر نەدەبوو. ئاخر خوا ویستی وابوو: مَا شَاءَ اللّهُ كانَ وَمَا لَمْ يَشأْ لَمْ يَكُنْ (خوا ویستی لەسەر چی بێت هەر ئەوە دەبێت. ویستی لەسەر چیش نەبێت نابێت.)[1]؛ ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾[2] (هەتا خوای پەروەردگاری جیهانیان ویستی لەسەر نەبێت، ویستی ئێوە نایەتە دی). ویستی خوا ئەوە بوو ڕووبکەنە بەدر، پێغەمبەرەکەشی پێشبینی ئەوەی کردبوو.

---

١. سنن أبي داود، الأدب ١٠٠.

٢. سورەتی الإنسان، ئایەتی ٣٠؛ سورەتی التكوير، ئایەتی ٢٩.

ئەو ڕۆژە ئاسمان بە ڕەنگێکی جیاوازتر دەبینرا. ئاسمانی ئەو ڕۆژە پیرۆزە کە تیایدا مانگی ڕەمەزان وردە وردە لە شەوی قەدر نزیک دەبووەوە. بزەی زەمینیش بزەیەکی تر بوو. تەنانەت ئەو کاتەی گەیشتنە بەدر، لە چوارچێوەی سنووری خۆیاندا نمەی بارانی 'ئارامی'یان بەسەردا باری. ئەوەش بۆخۆی واتایەکی تایبەتی دەگەیاند. تەپوتۆز نەما و لمی زەوییەکەش خۆی گرت، بیرەکانیش پڕبوون لە ئاو. وەك ئەوەی فریشتەکانیش لەگەڵ دڵۆپەی بارانەکەدا دابەزن وەهابوو. جا خۆ هەر بەڕاستیش فریشتەکانی ئاسمان دابەزین و شێوە و شکڵی موسڵمانانییان وەرگرت و نیشانەی ئەوانیان لەخۆیان نا تا لەوان بچن. دروشمی موسڵمانانیش لەو ڕۆژەدا: (أَحَدٌ..أَحَدْ!) بوو.[1] هەموویان وەك شێر هاواریان دەکرد "تاك و بێهاوتایە خوا!" جلەکانیان سپی بوو، هەروەکو کفن. چونکە کاتێك دەرچوون نەیاندەزانی کەی بە دوژمن دەگەن و کەی دەستە و یەخە دەبن لەگەڵ دوژمن. بۆیە خۆیان ئامادەکردبوو بۆ پێشوازی حۆری و غیلمانەکان. هاوشێوەی ئیحرامی حاجییەکانی ڕۆژی عەرەفە، سەرتاپا سپییان پۆشیبوو. بەڕاستی دیمەنێك بوو شایانی ئەوەبوو دابنیشیت تێر سەیری بکەیت...

لەو سەروبەندەدا کەسانێك پەژارە دایگرتبوون بەهۆی ئەوەی نەیانتوانی بوو بەشداری ئەو سەفەرە پیرۆزە بکەن. ئەنەسی کوڕی نەضر، ئەو هاوەڵە بەڕێزەی کە تەنانەت بە خەویش بیری لەوە نەکردووەتەوە لە پێغەمبەری ئازیز (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) داببڕێت، یەکێك بوو لەوانە. ئەنەس نەیتوانی ئامادەبێت. ساڵێکی ڕەبەقیش بەو ئاسۆر و ئازارەوە تلایەوە. (ئەگەر ئێوەش دەخوازن ئەوا دوعاتان بۆ دەکەم کە خوا ئەوجۆرە خەفەتە بە نسیبی ئێوەش بکات. دەسا خوا خەم و هیجرانی لەوجۆرە بپرژێنێتە دڵ و زیهنتانەوە و خەو لە چاوانتان بتۆرێنێت!)

---

[1] ابن هشام، السيرة النبوية ٣/١٨٢؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٣/٢٧٤.

بەڵێ، تلانەوە بە ئازارەکانی ئەم ئوممەتە دەربەدەرەوە و بیرکردنەوە لە حاڵی پەرێشان و ملی کەچی، پاڕانەوەیەکی هێندە مەزن و بێهاوتایە، ئەگەر بێت و لە کەعبەی پیرۆزدا دوای هەزار ڕکات نوێژ و هەزار جار تەوافیش دەست بەرز بکەیتەوە و بپاڕێیتەوە، هێشتا ناگاتەوە بەو دوعا و پاڕانەوەیەی کە بە زمانی ناچاری و کۆڵەواری پێشکەشی دیوانی میهری خوایی دەکرێت. بەڵێ، ڕەنگە دەستت بەرز نەکردبێتەوە و بە زوبان نەتوتبێت "ئەی خوایە!" بەڵام تا بەیانی لەناو جێگەکەتدا تلت داوە و خەو لە چاوت تۆراوە و هەر بیرت لە حاڵی ئەم ئوممەتە کردووەتەوە و هەناسەی قووڵت بۆ ئازارەکانی هەڵکێشاوە: ئای بۆ حاڵی براکانم لە ئەفغانستان و تورکستان و شیشان و فەلەستین و کشمیر و...هتد! کێ دەزانێت ئێستا چەند دەستی بێویژدان درێژبووبن بۆ حیجابی خوشکێکم؟ کێ دەزانێت ئێستا ئابڕووی کام دایك و خوشکم ئەتك بکرێت و خوێنی چ بێتاوانێك بڕێژرێت؟...

بەڵێ، هەستکردن بە ئازار و مەینەتیی ئوممەت لە ناخی دڵەوە، نزایەکی ئەوەندە کاریگەر و گەورەیە، هەر ئەوەندەی ڕووت لە بارەگای پەروەردگار کرد ئاسمانئشینان بەجارێك "ئامین"ی بۆ دەکەن. ئەوە ئەو چرکەساتەیە کە تیایدا باوەڕدار دەگاتە پلەیەك مەزندەی ئاوەزی ئادەمی تێپەڕ دەکات. خۆ ئەگەر بێت و دوعای زارەکیشی لەگەڵ بێت، ئیتر ئەوە هەر مەپرسە. ئەوە ئەو ساتەیە کە ئیماندار لەناوا هەست بە ژانەسەر دەکات و لە خەم و خەفەتدا دەست دەخاتە سەر کەلەکەی. چونکە لەو ساتەوەختەدا ئەو لەگەڵ برایانی ئایینی و هاوبیرانیدایە. لە ڕاستیدا بوونی ئێمەش هەر لەبەر ئەو مەبەستەیە. جا ئەگەر نەتوانین بەوەندەش هەستین، ئیدی چ مانایەك دەمێنێتەوە بۆ ژیان؟ ژینی ژێرگڵ زۆر لەوە باشترە بە سەرشۆڕی بژین و هیچمان لەدەست نەیەت بۆ برا ستەمدیدەکانمان.

هەر ئەم تێگەیشتنە بوو وای کرد هاوەڵان بەدەم خەندەوە بەرەو بەدر برۆن. چونکە بەهەشت لەپێشیانەوە بوو و چاوەڕێی دەکردن. ئەویێ مەنزڵی جاویدانی و جێی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگار بوو. لەو ڕۆژەدا فریشتەکان ئەوەندە شادومان بوون، لەوکاتەی موسڵمانان "ئەحەد.. ئەحەد"یان دەوتەوە، ئەوان لە ئاسمانەوە پۆل پۆل دادەبەزین. وەك ئەوەی بیانەوێت پێش ڕوودانی جەنگەکە ئەوان پیرۆزبایی سەرکەوتنیان لێ بکەن و بکەونە ئاهەنگگێڕان لەگەڵیان. کەسانی خاوەن بینایی دەیانبینین کە مێزەری سپییان بەسەرەوەیە و جبەی سپیشیان داوە بەسەر شانیاندا. بۆچی جبەی سپی؟ چونکە کە هاوەڵانیش هاتن بۆ بەدر جبەی سپییان لەبەردابوو. پەرلەی سەر زاریشیان "ئەحەد.. ئەحەد" بوو. بەڵێ، بەو چەشنە ڕووبەرووی ڕەشپۆشە ڕۆح ڕەشەکانی مەککە بوونەوە.

یەکێك لەو هاوەڵانەی بە دڵێکی خۆشەوە هاتبوو بۆ بەدر، لەژێر درەختێکدا دانیشتبوو و خورمای دەخوارد. هەر کە گوێی لە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) بوو مزگێنی دەدات و دەفەرمووێت "سوێند بەو خوایەی گیانی محەممەدی بەدەستە، هەرکەسێك ئەمڕۆ لەگەڵ دوژمندا بجەنگێت و خۆڕاگر بێت و بەتەمای پاداشتی خوا بێت، گەر بکوژرێت خوا دەیخاتە بەهەشتەوە." هاوەڵەکە وتی "واتە نێوانی من و چوونە بەهەشت ئەوەیە ئەوان بمکوژن؟" خێرا خورماکانی مشتی فڕێ دەدات و بە شمشێرەکەیەوە خۆی دەکات بەناو ڕیزەکانی دوژمندا. بەڵێ، لەو ڕۆژەدا ئەو هاوەڵە بە ئاواتی خۆی شادبوو.[1]

ئەوە ئاوات و ئارەزووی هاوبەشی هەموویان بوو. بۆیە بە شەوق و تاسەوە هاتبوون بۆ بەدر. ئەوە هێز و وزەیەکی بزوێنەری وەها بوو لە توانای هیچ هێزێکدا نەبوو زاڵ ببێت بەسەریدا.

---

١. صحيح البخاري، المغازي ١٧؛ صحيح مسلم، الإمارة ١٤٥.

هاوەڵان بەو ڕۆحییەتەوە ئامادەکرابوون، بۆیە شەڕکردن لەگەڵیان مەحاڵ .. ئاخر ئەوان ژیانی دنیایان بەسووک دەزانی و، جگە لە پاشەڕۆژ و ڕامەندیی پەروەردگار، چاویان نەبڕیبووە هیچ شتێکی تر. جا ئیتر چۆن شەڕ لەگەڵ کۆمەڵی وەهادا دەکرا!..

## ج. سوپای نیزامی

یەکێك لە سوودەکانی بەدر ئەوە بوو بۆ یەکەمجار کۆچەر و دەشتەکییان ئاشنابوون بە سوپایەکی ڕێکخراو. ئیدی جێگەیەك نەمایەوە بۆ پەلاماری باندەکانی چەتەیی و تاڵانی، چونکە سەرکردەی ئەو سوپایە کەسێك بوو یاسا و دادگەریی بۆ مرۆڤایەتی هێنابوو.

﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ﴿٧﴾ أَلَّا تَطْغَوْا۟ فِى ٱلْمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلْوَزْنَ بِٱلْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا۟ ٱلْمِيزَانَ ﴾

(الرحمن: ٧-٩)

"ئاسمانیشی بەرز و بڵند کردووەتەوە (بێ کۆڵەکە و بێ ستوون) و تەرازوو و پێوەری بۆ هەموو شتێك داناوە. ئێوەش ئەی ئەوەی ئادەم، با تەرازوو و پێوەرتان ڕێکوپێك بێت و ستەم لەیەکتر مەکەن. دادپەروەر بن لە کێشان و پێوانەدا، تەرازووبازی مەکەن و کەمفرۆشی ئەنجام مەدەن."

جێی تێڕامانە لە ئایەتەکەی سەرەوەدا وشەی "میزان" سێ جار هاتووە. کەوابێت چ شتێك لەوە سرووشتیترە خوای گەورە حەزرەتی محەممەدی خاوەن هاوسەنگی و پێوەر بکات بە سەرکردەی سوپایەکی ڕێکخراو، ئەوجا بینێرێت بۆ بەدر!

لە داهێنانەکانی پێغەمبەری خوا (صلوات الله وسلامه علیه) ئەو یەکە هەواڵگرییانە بوو کە بۆ عەرەبی تافی نەفامی تا بڵێیت شتێکی تازە بوو. کادری ئەو یەکانە کەسانێکی بەئەزموون و شارەزا بوون، مەحاڵ بوو هاوشێوەیانت بەرچاو بکەوێت.

لە دەرەنجامی ئەو هەڵمەتە یەك لەدوا یەکانەی کە یەکەکان پێی هەڵدەستان، بست بە بستی بیابان شارەزا بووبوون. بەدەر لەوە، مەبەست لەو هەڵمەتانە تەنها مەشق و ڕاهێنان نەبوو، بەڵکو بەکردەیی بەرەنگاری دوژمن دەبوونەوە و ئەزموونی ڕاستەقینەیان بەدەست دەهێنا. پێکدادانی ڕاستەوخۆ.. دزەکردنە ناو خاڵە هەستیارەکانی دوژمن و چاودێریکردنی کۆبوونەوەکانیان.. هەموو ئەوانە بەجۆرێك برەوی بە تواناکانیان دابوو، گەر کەسێك هەمان ئەزموونی ئەوانی نەبووایە زەحمەت بوو لەگەڵیان هەڵبکات. زانیاری هەستیاریان هەبوو سەبارەت بە جوڵە و چالاکییەکانی بەرەی بەرامبەر؛ کاروانەکان لەکوێوە تێدەپەڕن. سیخوڕانی دوژمن لەکوێن. سەلامەتیی ڕێگاوبان لە چ ئاستێکدایە؟ دورگەی عەرەبی یەکەمجاری بوو شتی وا بەخۆیەوە ببینێت، ئەویش لە سایەی حەزرەتی محەممەدەوە.

ئایا دەپرسن چۆن؟ بڕوانن، کەسێك کە لە بواری سەربازی و هەواڵگریدا ئەزموونێکی ئەوتۆی نەبووە، سوپایەك ئامادە دەکات و بەڕێی دەخات. ئەوجا ئاسایشی ڕێگە و دەروازەکان دەستەبەر دەکات و بێنەوەی ڕووبەڕووی کۆسپێك ببێتەوە، دووسەد کیلۆمەتر بە پیادە و سواری وشتر دەبڕێت. پێموایە ئەمە لەوپەڕی گرنگیدایە.

## د. بەرەو شوێنی بیرەکان

سەر بیرەکانی بەدر خاڵی جێگیربوونی سوپا دەبوو. قورەیشیش هەوڵی دەدا ئەو جێگەیە بگرێت. بە دووسەد ئەسپەوە بەرەو ئەوێ پەلەیان دەکرد. بەڵام کارزانیی باوەڕداران و خێرایی بێوێنەیان وای کرد دەستپێشخەر بن و زووتر دەست بگرن بەسەر بیرەکاندا و دوژمنی لێ بێبەش بکەن. قورەیش دەستەوسان مابوو، چونکە بەدر تاکە شوێن بوو لەوناوەدا کە ئاوی تێدا بوو.

لەو نێوەندەشدا تیمەکانی پشکنین بەوردی شوێن کاروانەکە کەوتبوون. گەر ئەو ئیشەی ئێرەیان بە سەرکەوتوویی ئەنجام بدایە، بەنیاز بوون خۆیان فریای کاروانەکەش بخەن. چونکە ئەو سامانەی لە مەککە بەجێیان هێشتبوو لەناو کاروانەکەدا بوو، هەرچۆنێك بووایە دەبوو مافی خۆیان بسێننەوە.

باوەڕداران بەو نیازەوە پلانیان دادەنا، کەچی ویستی خوای کارجوان شتێکی تر بوو. دەبووایە گورزێکی جەرگبڕ لە سەربازگەی کوفر بسرەوێنرێت، تاکو هاوسەنگییان لەدەست بدەن و جارێکی تر نەتوانن بەهۆش خۆیاندا بێنەوە.

سەرداری بوونەوەران (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) هەستا بە دابەشکردنی سوپاکەی بەسەر چەند قۆڵێکدا: ڕاست و چەپ و ناوەند. ئەوەش لەو سەروەختەدا ڕێکارێکی لەوەپێشتر نەبینراو بوو. بەرەی ناوەند پێکهاتبوو لە موهاجیران و سەردارانی "ئەنصار"، کەسانێك بوون بەیعەتی مەرگیان بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دابوو. ئەگەر بەس خۆشیان لە مەیداندا بمانایەتەوە، لە پەیمانەکەیان پاشگەز نەدەبوونەوە.

سەرکردایەتیی ئەم بەرەیە سپێررا بە هەردوو فەرماندەی خاوەن ئەزموون

و لێهاتن: حەزرەتی عەلی و سەعدی کوڕی موعاز. یەکێکیان سەرکردەی موهاجیران و ئەوی تریشیان سەرکردەی ئەنصارەکان بوو.[1]

حەزرەتی عەلی ئەو کەسە بوو کە لە ڕوانگەی فەزیلەتی تایبەتییەوە سەرگەورەی هاوەڵان بوو. ڕاستە کۆدەنگی هەیە لەسەر ئەوەی کە لەڕووی فەزیلەتی گشتییەوە سێ جێنشینەکەی پێش خۆی لەو لەپێشترن. بەڵام پایە تایبەتییەکەی و.. خزمایەتییەکەی لەگەڵ پێغەمبەردا و.. ئاگاداربوونی لە هەندێك ڕازی ئەو خانەیە و.. بەردەوامیی وەچەی پێغەمبەر لەوەوە و.. ئەوەش کە تاجی سەری تێکڕای پیاوچاکان و دۆستانی خوایە.. بەڵێ هەموو ئەوانە ئاماژەیان بۆ بێهاوتایی ئەو زاتە دەکرد. لە تەمەنی حەوت ساڵیدا بە ئیسلام شادبووبوو. واتە تۆزی بتپەرستی بەر داوێنی نەکەوتبوو. هێشتا نۆ ساڵان بوو ئەو دەمەی پێغەمبەری ئازیز (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بانگی سەرانی قورەیشی کرد و پێی وتن "کێ هەیە لەناوتاندا پشتیوانیم بکات؟" ئەو گۆزەکەی دەستی دانا و مەردانە دەستی خستە سەر سنگی و وتی "من هەم ئەی پێغەمبەری خوا!"[2]

کە تەمەنیشی گەیشتە حەڤدە ساڵان، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە شەوی هیجرەتدا ڕایسپارد لە جێگەکەیدا بخەوێت، واتە پێشنیاری مردنی بۆ کرد. کەچی ببینە ئەم لاوە، کە تازەبەتازە خونچەی ژیانی دەپشکوت، بێ دوودڵی قبووڵی کرد.[3] حەزرەتی عەلی هەرگیز لەم جۆرە کارانەدا دوودڵ نەبووە، بۆیە

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ١٥٩/٣؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٢٦٠/٣.

٢. بڕوانە: أحمد بن حنبل، المسند ١٥٩/١؛ الطبري، جامع البيان ١٢٢/١٩؛ البيهقي، دلائل النبوة ١٧٩/٢-١٨٠.

٣. إبن هشام، السيرة النبوية ٨/٣؛ إبن كثير، البداية و النهاية ١٧٦/٣.

ئەو لاوە جوامێر و مەردە لە بەدردا بووە سەرگەورەی موهاجیران. بەفیدات بم ئەی پێغەمبەری خوا، چەندە دەست کارامە بوویت لە دەستنیشانکردنی پیاواندا!

سەعدی کوڕی موعازیش نموونەیەکی دیکەی چاکی و سەرڕاستی بوو. دڵسۆزییەکەی لای هەمووان ئاشکرا بوو. کاتێك لە بەدردا بریندار بوو — هەر بەو برینەشەوە سەری نایەوە- ئەو قسانەی لەسەر جێگەی مەرگ کردنی، باشترین شایەت و بەڵگە بوون لەسەر ئیمانەکەی. چاوی بڕیبووە ئاسمان و دەیفەرموو "پەروەردگارا، ئەگەر دەتوانم بەشداری جیهادێکی تر بکەم لە پێناوی تۆدا، ئەوا بمژیێنە. وەگەرنا دەستبەجێ بمگەڕێنەوە بۆ بارەگای خۆت." [1] سەعد بەهۆی سەختیی برینەکەیەوە کۆچی دوایی کرد. لەکاتی بەخاك سپاردنیدا، پێغەمبەری ئازادار (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەر نووکی پێیەکانی دەڕۆیشت. کاتێك پرسیاری ئەوەیان لێکرد، بەمجۆرە وەڵامی دانەوە "ئەمڕۆ ئەهلی ئاسمان دابەزیون بۆ ئەسپەردەکردنی ئەم تەرمە، شەرم دەکەم پێم لەسەر زەوی دابنێم."

ئەمە چ دەستنیشان کردنێکە! ئەمە چ هەڵبژاردنێکە!

بەمشێوەیە، ناوەند و جەرگەی سوپا لە دەست ئەم قارەمانانەدا بوو. جا ئەگەر سەرکردەیەك مردنی سەربەرزانەی پێ باشتر بێت لە ژیانی ژێردەستەیی، ئیتر چۆن سەربازەکانی لە مەیدان هەڵدێن؟ ئەگەر سەرکردە سەری خۆی فیدا بکات، سەربازەکانی چۆن فیدای ناکەن؟ چ جای ئەگەر سەربازەکان خۆیان تامەزرۆی شەهیدی بن و بە تاسەی ئەوەوە هاتبن! پێغەمبەریش (عَلَيْهِ صَلاةٌ وَسَلَامٌ) لە ناوەندی ئەم قەڵا پارێزراوەدا بوو. واتە بە گۆشت و ئێسکی

---

١. صحيح البخاري، المغازي ٣٠؛ صحيح مسلم، الجهاد ٦٧.

یارانی تەنرابوو. سوێند بەخوا کەس نەیدەتوانی دەستی بگاتە تاڵە موویەکیشی. سەربازە جوامێرەکانی کە هەڵگری مارشی گیانفیدایی بوون، قەڵغانێکیان بۆ دروستکردبوو دوژمن مەحاڵ بوو دەستی بیگاتێ. مەگەر هەنگاویان بەسەر لاشەی ئەواندا هەڵبنایە.

کەواتە خۆی سەرکردایەتی ناوەندی دەکرد. ئاڵاکەی دابوو بەدەست موصعەبی کوڕی عومەیرەوە.[1] ئای ئەمە چ تابلۆ و دەستنیشانکردنێکی ناوازە بوو! ئەو موصعەبەی کاتێك لە جەنگی ئوحوددا بە گورزێك دەستی ڕاستیان پەڕاند، ئاڵاکەی بەدەستی چەپی گرت، کاتێك گورزێکی تر دەستی چەپیشی پەڕاند، ئەبەرخۆیەوە وتی "تەنها قەڵغانەکەم ماوە پێغەمبەری خوای پێ بپارێزم، ها لێی بدە، لەگەڵ ملم، ئەویش بدە!"[2] ئەو خاوەن ڕۆحێك بوو لەسەر ژیانی ئەو دنیا بەرنامەڕێژ کرابوو. موصعەب لەناوەڕاستدا وەستابوو، ئاڵایەکی سپی بەدەستییەوە دەشەکایەوە. هەردوو قۆڵی ڕاست و چەپ جێگەی خۆیان بە ڕێکوپێکی گرتبوو، هێزی پێشەوەش لە ئامادەباشیدا بوون و چاودێری فەرمان بوون. بەدوای ئەوانیشدا ڕیزی یەدەك دەهات بە سەرکردایەتی قەیسی کوڕی ئەبوسەعد. ئەمانە ئەوەندە بەجەرگ و دامەزراو بوون، ئەگەر دانە دانە نینۆکیان هەڵبکەندرایە، کەسیان "ئۆف"یان لێوە نەدەهات...

سوپای موسڵمانان ڕێسادارییەك بەڕێوەی دەبرد کە شارەزایانی مەیدانەکانی جەنگ تا ئەوکاتە نەیانبینیبوو. هەر ئەوەش بوو ماڵی قوڕەیشی کاولکرد. پیادەکردنی ئەو سیستەمە نوێیە، هەر لەسەرەتاوە ڕاگەیاندنی بێکەڵکی و نابوتیی سیستەمە کۆنەکانی ئەوان بوو.

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٣/١٥٩؛ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٣/١٢٠؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٣/٢٦٠.

٢. إبن سعد، الطبقات الكبرى ٣/١٢٠.

بەدەر لەوە، ئامادەیی خودی پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لەناو سوپادا هێز و تینێکی تری پێ دەبەخشین. ئەوان پێشتر پەیمانیان پێدابوو و وتبوویان "سوێند بەو خوایەی تۆی بە حەق ناردووە، خێزانەکانمان چۆن بپارێزین ئاوەهاش تۆ دەپارێزین." زۆر گرنگە پێشەوا بتوانێت گیانی متمانە و دڵنیایی لە دەروونی پەیڕەوانیدا دروست بکات. پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەی بە باشترین شێوە ئەنجامدابوو. لەبەرامبەردا ئەویش پێی وتبوون "ژیانم لەگەڵ ژیانی ئێوە و مەرگیشم لەگەڵ مەرگی ئێوەدایە."[1] لەکاتێکدا فەرمایشتەکانی لە گوێیاندا دەزرنگانەوە، بەناویاندا دەگەڕا و لە ناوەڕاستیاندا دەوەستا. لە هاتنیاندا بەنۆرە سواری وشتر دەبوون. (گیانم فیدای بێت، خۆزگە پێی بنایە بە سەری ئێمەدا). دوو کەسی تر لەگەڵیدا سواری وشترەکەی دەبوون. ئەم حاڵەتە ئەو هاوەڵە بەڕێز و هەست بەرزانەی زۆر دڵگران کرد، دواجار خۆیان بۆ نەگیرا و عەرزیان کرد "نَحْنُ نَمْشِي عَنْكَ (ئێمە لەبری تۆ بەپیادە دەڕۆین. تۆ سواربە)" بەڵام خاوەن بەرزترین هەستی خۆبەکەمزانین بەمجۆرە وەڵامی دانەوە "مَا أَنْتُمْ بِأَقْوَى مِنِّي، وَلَا أَنَا بِأَغْنَى عَنِ الأَجْرِ مِنْكُمْ (لەڕووی هێزەوە ئێوە لە من بەهێزتر نین. لەڕووی ئاتاجیشم بۆ پاداشتی پەروەردگار، لە ئێوە دەوڵەمەندتر نیم)"[2]

بەڵێ، گەورەی پێشەوایان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ئاوەهای دەوت. بەڕادەیەك لەگەڵ خەڵکدا ئاوێتە بووبوو، لەگەڵ ئەواندا هەڵدەستا و دادەنیشت و لێیان جیا نەدەبووەوە. لەگەڵیان دادەنیشت و کەوچکی بەهەمان ئەو خواردنەدا دەژەنی کە ئەوان کەوچکیان تێ دەژەنی و، لە هەموو شتێکدا هاوبەشی دەکردن.

---

١. صحيح مسلم، الجهاد ٨٦؛ أحمد بن حنبل، المسند ٥٣٨/٢.

٢. أحمد بن حنبل، المسند ٤١١/١؛ البيهقي، السنن الكبرى ٢٥٨/٥.

لەپاش هەڵگیرساندنی شۆڕشی فەرەنسا، بەکارهێنانی زاراوەی "یەکسانی" زیاد لە هەرکاتێکی دی برەوسەند. بۆ کەس هەیە لەو "ڕۆژەوە چاوی بە یەکسانی کەوتبێت؟ ئەوە بەس مرۆڤی سەردەمی بەختەوەری بوو کە دەیزانی یەکسانی چییە. ئەویش لە سایەی حەزرەتی محەممەد موستەفاوە.

لە تاریکترین ڕۆژەکانی ژیانیدا ئاسمان دەرگاکانی خۆی بۆ کردەوە و لە ئامێزی گرت، بەڵێ، ئەو میعراجی کرد.. حۆریەکانی بەهەشت وەك دەستەی پێشوازی ڕژانە سەر ڕێگاکەی، فریشتەکان چەشنی شۆستە سەریان لەژێر پێی دانا، هەروەك "نیزامی"ی شاعیر دەڵێت "لەژێر پێی ئەسپەکەیدا بوو بە ناڵ مانگی هیلال." بەهەشت پێی دەوت "مەڕۆ، لێرە بمێنەرەوە!" بەڵام ئەو گەڕایەوە بۆ ناو مرۆڤەکان. خواناسی گەورە "عەبدول قوددوس" ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە و سوێند دەخوات "پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) گەیشتە مەقامێك کەسی پێ نەگەیشتووە. سوێند بەخوا ئەگەر من بەرز ببومایەتەوە بۆ ئەو مەقامانە هەرگیز نەدەگەڕامەوە." خواناسێکی تر ئەم وتەیەی عەبدول قوددوس هەڵدەسەنگێنێت و لەوبارەیەوە دەڵێت "ئەوە ئەو ماوەیەیە کە نێوانی پێغەمبەر و وەلی جیا دەکاتەوە و هیچ کەسێش ناتوانێت بیبڕێت!"

جا بۆ ئەو دوورییە بە کێ دەبڕێت؟ ئەوە حەزرەتی محەممەد موستەفایە وێڕای ئەوەی کە لەلای پەروەردگاری لەو مەنزڵانەدا بوو، کەچی خۆی وەك مرۆڤێکی ئاسایی دەبینی و حەزی دەکرد لەناو خەڵکدا بێت و وەك ئەوان بژی.

مرۆڤایەتی بەهۆی ئەوەوە یەکسانی ناسی. خۆ ئەگەر بڕیاربێت جارێکی تر مرۆڤایەتی بەو بەهایە شاد بێتەوە، ئەوا هەر لە سایەی ئەودا پێی شاد دەبێتەوە. ئەم چاوەڕوانییەش حەقیقەتێکە و لەخودی سروشتی زانستی

یاساناسییەوە هەڵقوڵاوە. عەرەبە دەشتەکییەکان ئا لەم سۆنگەیەوە چاویان بڕیبووە ئەو سوپایە، دیارە ئەمەش سەروەری و شکۆیەکی گەورە بوو بۆ بیابان. ئەو ڕۆژە بیابان سەراپا ناوێزانی جوانی بووبوو.. ئەو ڕۆژە بیابان پایە و نرخی گەیشتە پایە و نرخی باخچە و مێرگەکانی بەهەشت.

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) خۆی هەستا بە ڕێکخستنی سوپاکە و دیاریکردنی شوێنی سەنگەرەکان. ئەوجا لە ناوەڕاستدا چاڵێکی گەورەی هەڵکەند. ئەوەندە ئاویان تێکرد کە تا کۆتایی جەنگ بەشیان بکات. پاش ئەوە سەرجەم بیرەکانی پڕکردەوە.[1] کەواتە دوژمن پێشبینی هەنگاوێکی لەوجۆرە ناکات و پشت ئەستوور بە بیرەکان دێت. ئەوجا کە دەبینن چی بەسەر بیرەکاندا هاتووە، هەست دەکەن پشتیان شکاوە، هەروایش بوو...

هەروەك سیستەمی سوپاکە بێکەموکووڕی بوو، ئاوەهاش شێوازی جموجوڵی جەنگی لەوپەڕی نایابیدا بوو. سەربازەکان باش دەیانزانی لەکوێدا نێزە و، لەکوێدا تیر و لە چ کاتێکیشدا شمشێرەکانیان بەکار دەهێنن و.. کەی لای ڕاست و کەی لای چەپی سوپا دەڕژێتە ناو جەنگەوە.. وە لە چ حاڵەتێکدا هێزی یەدەك بەشداری دەکات.

ئەو شوێنەش کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چادرەکەی خۆی تێدا هەڵدابوو، ئەوەندە بەوردی دیاریکرابوو، هەر لە سەرکردەیەکی مەزنی وەك خۆی دەوەشایەوە. چونکە لە جێیەکدا بوو بە تەواوەتی دەیڕوانی بەسەر گشت باڵەکاندا. هەر لەوێوە فەرماندەیی هەردوو باڵی ڕاست و چەپ و هێزی پشتەوەی دەکرد. جگە لەوە دەرفەتی ئەوەی بۆ دەڕەخسا لەکاتی خۆیدا پەیوەندی بە

---

١. ابن هشام، السيرة النبوية ٣/١٦٨؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٣/٢٦٧.

سەربازەکانییەوە بکات و بەخێرایی فەرمانەکانی بگەیەنێتە لایان و باڵادەستیی تەواوی بەسەر سەرجەم بەرەکاندا هەبێت. ئیدی هەموو شتێك ئامادەبوو و پاش کەمێکی تر جەنگ دەستی پێدەکرد.. موسڵمانانیش زاڵ دەبوون بەسەر دوژمنەکەیاندا کە سێ ئەوەندەی خۆیان زیاتر دەبوو و دووچاری شکستێکی لەبیرنەکراویان دەکرد. بە زیانێکی کەمی خۆیانەوە کە تەنها چواردە شەهید بوو، کۆتایی بە جەنگەکە دەهات. وەك پێشتریش باسمان کرد، پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) دروشمی "ئەحەد.. ئەحەد"ی وەك پەرلەیەك بۆ موسڵمانان دیاریکردبوو. "أَحَد" یەکێك بوو لە ناوە جوانەکانی خوا، کە دروست نییە ئەو ناوە لە هیچ کەسێك بنرێت. چونکە هەر خوا تاك و تەنهایە:

﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ﴾ (الإخلاص: ١)

"أَحَد" لێرەدا ئاماژەیە بۆ تەوحیدی ئولوهیەت و تەوحیدی ڕوبوبییەتیش. تاکێکی وەهایە کە دووەمی نییە. "مُثَنَى"ی "واحِد" بریتیە لە "إِثْنان"، بەڵام "أحد" "مُثَنَى"ی نییە، چونکە ئەحەد ژمارەیەکی دانسقەیە لەنێوان هەموو ژمارەکاندا و دووەم و سێیەمی نییە. بە دەربڕینێکی دیکە؛ خوا ئەحەدە و دووەمی نییە. هەر کە بەو دروشمە هوتاف دەکێشرا، وەك دەنگێك لە پەنهانەوە بێت و پێیان بڵێت "لەبیەیك بەندەکانم" ئاوەهابوو. ئەگەر ئەمە حیکمەتی یەکەمی هەڵبژاردنی ئەو دروشمە بووبێت، ئەوا حیکمەتی دووەمی ئەوەیە کە خەڵکی مەککە تا ئەو کاتە لە چرپنی دروشمیان نەدەزانی. باوەڕدارانیش لەو ڕێیەوە زیاتر هەستیان بە وابەستەیی نێوان خۆیان دەکرد. لەلایەکی تریشەوە ترس و لەرزیان دەخستە دڵی بت پەرستانەوە، بەتایبەت کە ئەم دەنگە لە یەك کاتدا لەلایەن کەسانێکی سپیپۆشەوە دەوترایەوە کە دەتوت کفنیان لەبەردایە. چ

جای ئەوەی باوەڕدارانی خۆیان بە تاسەی شەهیدییەوە هاتبوون، بیر و هۆشیان لای ئەوەبوو کە "داخۆ کەی و لەکوێ دەست بخەینە دەستی مردنەوە؟" بەڵێ، موسڵمانان تەنها ئەمەیان لێك دەدایەوە و بەس.

## هـ. یەکەم ڕووبەڕوو بوونەوە

بەدەر لە فەرماندەیی سوپا، هەرهەنگاوێك لەکاتی خۆیدا لەلایەن پێغەمبەرەوە بڕیاری لەسەر دەدرا و سەرکەوتووانە دەخرایە بواری جێبەجێکردنەوە. لە سەرەتادا سێ کەسی لە ئەنصار دیاریکرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی "کەس بەرامبەر کەس". هەرسێکیشیان لە کەسایەتییە دیارەکانی مەدینە بوون. ئەم مەردانە کە تینووی شەهیدی بوون و هەردەم لەدووی دەگەڕان، نەك ئەو قوڕەیشیانەی کە ئەو ڕۆژە بەرامبەریان وەستابوون، تەنانەت ئەگەر عەنتەرە و هیرەقلیش بەرەنگاریان بووایەتەوە، ئەوان دیسان سڵیان نەدەکردەوە و وەك کێو لەڕوویاندا دەوەستانەوە. کەچی لەولاوە خۆبەزلزانانی قوڕەیش وەك نەریتی هەمیشەییان فیزیان لێ دەدا و دەیانوت "ئێمە لەگەڵ ڕەنجبەر و شوانی مەدینەدا شەڕ ناکەین. ئەی محەممەد! هاوشان و خزمەکانی خۆمان بهێنەرە مەیدان." بەمەش کەوتنە داوی فیز و لووتبەرزییەکی چارەنووس ڕەشەوە.

ڕاستییەکەی پێغەمبەریش (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چاوەڕێی شتێکی وا بوو. ئێمە نازانین، بەڵام دەکرێت ئەوەش یەکێك بووبێت لە تاکتیکەکانی. پەڕاوەکانی سیرە باسی ئەوە ناکەن، بەڵام گومانی تێدا نییە کە لە بیری خۆیدا چەند کەسێکی دانابوو. ئەوەبوو فەرمووی "هەستە حەمزە، هەستە عوبەیدە، هەستە عەلی!" ئەو سێ مەردە کە هاوشانی سوپایەك دەبوون، دووانیان ئامۆزای

و. سێیەمینیشیان مامی بوو. واتە یەکەم دەستە کە ناردنی بۆئەوەی تەقە لە دەرگای مەرگ بدەن، نزیکترینی خزم و پشتی خۆی بوو. لەبەرامبەریشدا سێ کەس هاتنە دەرەوە بۆ زۆران: عوتبە و شەیبە و وەلیدی کوڕی عوتبە. دوژمن لەسەر لێواری شکستێکی گەورەدا بوو. ئەو سیانە لە بەهێزترینی سەرۆک هۆزەکان بوون. هەردوو براکە و کوڕەکەیان لە چەرگەی بەدردا بە زەبری شمشێر کەوتن بە زەویدا و بەوەش ڕیزەکانی دوژمن ورەیان ڕووخا. نیشانەکانی شکست دەرکەوت. هەرچی عوبەیدەشە لە ئەنجامی زۆرانەکەیدا دووچاری برینێکی سەخت بوو. بردیان بۆ لای پێغەمبەری ئامۆزای و لەپاڵ ئەو نازدارەدا گیانی سپارد.[1]

بە کوژرانی عوتەبە و شەیبە و وەلید، ورەی دوژمن تەواو دابەزی. ئاخر زۆرێکیان بەزۆر و لەبەر ڕووگیریی ئەو سیانە هاتبوون. بۆیە مردنیان بوو مایەی ترس و پشێوی لە ڕیزەکانیاندا.

## ئامانجەکان جیاواز بوون

لەناو سوپاکەی قورەیشدا هەریەکە لە ئاوازێك دەیخوێند.. یەکڕیزییان تەواو شلۆق ببوو.. تا دەهات شیرازەیان کەلێنی تێ دەکەوت. ئەمەش وای دەکرد ببنە ئامانجی تیر و شمشێری موسڵمانان. پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيهِ) گورزێکی وای لێدان بە حەپەساوی بە ڕاست و چەپدا سەرگەردان بووبوون و نەیاندەزانی چی بکەن. هەر لە بنەڕەتدا وەنەبێ هاتنەکەیان لەپێناو ئامانجێکی بەرزدا بووبێت. بەڵکو قین و تووڕەیی ئەوانی هێنابوو. بەڵام پێغەمبەر

---

١. ابن هشام، السيرة النبوية ٣/١٧٣؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٣/٢٧٣.

(عَلَيهِ أفضَلُ صَلاةٍ وَسَلَام) له پێناو بیرێکی پیرۆز و ئامانجێکی بەرزدا هاتبوو، کە ئەویش بریتی بوو لە بەرزکردنەوەی ناوی پیرۆزی پەروەردگار لە ئاسۆکانی جیهاندا.

بەڵێ، بیروباوەڕ زۆر گرنگە. ئاخر ئەبوجەهل و شەیبە و عوقبەی کوڕی ئەبوموعیت و ئومەیەی کوڕی خەلەف، نەیاندەزانی لە پێناوی چیدا دەجەنگن. بە ڕقێکی شێتانەوە هاتبوون خوێنی خەڵکی بڕژن. بە بۆچوونی خۆیان بەو کارەیان پایەی کەعبەیان بەرزتر دەکردەوە و خۆشیان پێگەیەکی شیاوتریان لەناو عەرەبدا بەدەست دەهێنا. بەڵام نەیاندەزانی بەراورد بە ڕابردوو هیچ دەستکەوتێکیان نەدەبوو. چونکە وەک وتمان، ئەوەی ئەوانی ڕاپێچی بەدر کردبوو، قین و نەفرین بوو.

بەڵام باوەڕداران لەپێناو هێنانەدی ئامانجێکی بڵنددا هاتبوون. بەرزکردنەوەی ناوی خوا و بڵاوکردنەوەی بە زەویدا، ئامانجی بەدیهێنانیان بوو. ترپەی دڵی هەموویان بەو هەستەوە لێی دەدا و شایانی ئەوەبوو سەر و ماڵی بۆ بەخت بکەن. چونکە لەپێناوی خوای باڵادەستدا شەهید دەبوون و بەرەو دیداری ئەو دەچوون. دیارە هەرکەسیش بە دیداری خوا بگات، هیچی لەکیس ناچێت. بەڵکو دەبووە خاوەنی چەندین دەستکەوت و پاداشتی ئەبڕاوە. باوەڕداران بەو هەست و شعوورەوە دەجەنگان، جگە لەوەش هەموو شتێک بێنەرزش بوو لەلایان. کەچی خوانەناسان پێیان وابوو ژیان گرنگترین شتە، دنیاپەرستی بووبووە خولگەی خەون و خولیایان. هەموو ئاواتێکیان ئەوە بوو ژیانیان درێژ بێت. خۆ ئەگەر لە بەدردا سەربکەوتنایە، ئەوا ئەبوجەهل نەزرەکەی خۆی ئەنجام دەدا، کە بریتی بوو لە: مەی خواردنەوە و سەما و ڕابواردن.[1] کەچی لەبری ئەوە،

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٣/١٦٦؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٣/٢٦٦.

موسڵمانان لەوێدا نوێژیان کرد و. لە خوا پاڕانەوە و، بەدوای ئەو ڕێگایانەدا گەڕان کە لە پەروەردگار نزیکی دەخستنەوە.

ئەوە جیاوازیی نێوان ئەو دوو کۆمەڵەیە بوو؛ یەکێکیان وەك بە ئاسماندا بفڕێت و ئاسودەیی دەورەی دابێت وابوو. ئەوی تریشان وەك ئەوە وابوو تلۆر بووبێتەوە بۆ نشێوترین چاڵی دنیا و لە پەژمووردەییدا گیری خواردبێت.

## ح. فیرعەونی ئوممەت دەگلێت

عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف (رضيَ اللهُ عَنْهُ) بۆمان دەگێڕێتەوە: لە گەرمەی بەدردا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مشتێك خۆڵی هەڵگرت و بەڕووی بێباوەڕاندا وەشاندی و فەرمووی "سا ڕوویان ڕەش هەڵبگەڕێت!" لەو سەروبەندەدا کە کەللەسەر دەچوو بە هەوادا. دوو لاوی خوێنگەرم بە ئەسپایی خۆیان گەیاندە لام -کێ چوزانێت ڕەنگە لەکاتی هاتنیاندا بۆ بەدر لەسەر نووکی پەنجەی پێیەکانیان وەستابن تاکو بەژن و باڵایان بگاتە ئاستێك بتوانن بەشداریی غەزا بکەن- دوو لاوی پازدە شازدە ساڵان یەکێکیان لەلای ڕاستەوە لێم نزیك بووەوە و وتی "مامە گیان دەکرێت ئەبوجەهلم نیشان بدەیت؟" منیش پرسیم "کارت چییە بەسەریەوە؟" وەڵامی دایەوە "بەڵێنم بە خوای گەورە داوە ئەگەر ئەو دوژمنە سەرسەختەی پێغەمبەری خوا ببینم، بیکوژم!" (ئەو خاوەن ڕۆحە تاریکەی کە تا ئەو ساتەوەختە بەربەرەکانێی بڵاوبوونەوەی پرشنگی درەخشانی ئیمانی دەکرد و بووبووە بەربەست لەبەردەم بڵاوبوونەوەی نووری قورئاندا. سوێندم خواردووە ئەگەر بیبینم دەیکوژم.)

ئەوی تریان کە حاڵی خۆی پەنهان کردبوو، چرپاندی بە گوێی چەپمدا و وتی "مامە، ئەبوجەهلم پیشان دەدەیت؟" هەمان پرسیارم لەویش کرد، ئەویش هەمان وەڵامی دامەوە.

لەو قسانەدا بووین لەناکاو ئەبوجەهل کەوتە بەرچاوم، ئاماژەم بۆ کرد، هێشتا بەتەواوی دەستم دانەنەواندبوو، وەك بروسکە خۆیان گەیاندە سەری و بە زەبری چەند گورزە شمشێرێك دایان بەزەویدا. یەکێکیان بە سەختی بریندار بووبوو. ڕاستە ئەو قارەمانە مەزنە بریندار بووبوو، بەڵام ئەوکەسەش کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا نوێنەرایەتی کوفری دەکرد و پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە "فیرعەونی ئوممەت" ناوی بردبوو، لە خوێنی خۆیدا گەوزابوو.[1]

ئەو دوو لاوەش یەکێکیان "عەوفی کوڕی حاریث" و ئەوی تریشیان "مەعازی کوڕی حاریث" بوو. لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە کە هەردووکیان کوڕی عەفرا بوون. خۆ ئەگەر دەشتانەوێت باشتر بیانناسن، ئەوا کوڕی خاتوو سومەییە بوون. ئەو خاتوونە ئەبەردەی کە پاش ڕووداوە خەمئامێز و ئاسۆرەکانی ئوحود، کە تیایدا کوڕەکانی و مێردەکەی و براکەی شەهیدبوون. خۆی دا بەسەر چمکی جبەکەی پێغەمبەری سەروەردا و فەرمووی "كُلُّ مُصِيبَةٍ بَعْدَكَ جَلَلٌ (پاش سەلامەتی و بێوەیی تۆ، هەموو ناڕەحەتی و دەردەسەرییەك ئاسانە!)"[2]

ئەوە دایك و ئەوەش ڕۆڵەکانی! ئەوان هەورازی ئەفامییان تێپەڕاندبوو و گەیشتبوونە لاکەی تر. لە ئوحودیشدا بە ئاواتی خۆیان شادبوون و گەیشتن بە خوا. لەڕاستیدا بەشداریکردنیان لە بەدردا هەر بۆ بەدەستهێنانی ئەو مەبەستە باڵایە بوو.

---

١. ابن هشام، السيرة النبوية ٣/١٨٣؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٣/٢٨٧-٢٨٩.

٢. ابن هشام، السيرة النبوية ٤/٥٠؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٤/ ٤٦-٤٧.

پوختەی قسە: پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) جەنگی دژی ئەوانە بەرپاکرد کە بەدرێژایی تەمەنی بانگەوازەکەی دوژمنایەتییان کرد و بوونە کۆسپ لەبەردەم حەق و حەقیقەت و زانست، بگرە ئیمان و ئیسلامیشدا. هەر هەنگاوێکی دەنا، بەوردی لە ئەندازەی دەدا و پلانی بۆ دادەنا، تا نەکەوێتە ناو شکستێك یان هەڵەیەکەوە. بە چەشنێك پلانەکانی دادەڕشت، دەتوت پەنجا جار هاتووە بۆ بەدر و لەو جێگەیەدا پەنجا جار کردەی سەربازی ئەنجام داوە. چونکە لە بەدردا هیچ هەڵە و کەموکورتییەك ڕووی نەدا و، لە سایەی چاودێری و کۆمەکی پەروەردگاردا بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە.

سەرکەوتن، سەرکەوتن بەدوای خۆیدا دەهێنێت. ئەمەش مانای وایە بازنەیەکی چاکەکێش و بەردار هاتووەتە ئاراوە. هەر خێرێك سەر دەکێشێت بۆ خێری تر. ڕەنگە هەندێك بەم زاراوەیە ئاشنا نەبن. هەموومان زاراوەی "بازنەی بەتاڵ" دەزانین، لە ئێستاشدا زیاتر "بازنەی نەزۆك" بەکار دەهێنرێت. با ئێمەش وەك دژەواتای ئەو دەستەواژەیە، بازنەی خێر و چاکە ناو بنێین "بازنەی بەردار". کە تێیدا چاکە چاکە بەرهەم دەهێنێت. بەڵام لە بازنەی بەتاڵدا خراپە خراپەی لێ دەکەوێتەوە، ئاڵۆزیش دەبێتە هۆی ئاڵۆزی تر، هەڵەکانیش ڕادەستی هەڵەی ترت دەکەن. ئیتر بەوجۆرە درێژە دەکێشێت...

بەڵێ، ئەگەر بەباشی ئامادەسازی بۆ جەنگ کرابێ، لە ئاکامدا چاوەڕێی سەرکەوتن دەکرێ. ئەوەتا گەورەی مرۆڤایەتی فەرموویەتی "إِنَّ الْخَيْرَ لَا يَأْتِي إِلا بِالْخَيْرِ (خێر و چاکە هەر خێر و چاکەی لێ دەکەوێتەوە.)"[1] جەنگی بەدر چاکەیەکی پوختی بێگەرد بوو، چاکەیەکی هێندە بەنرخ بوو کاریگەری لەسەر دڵ و دەروون بەجێهێشت؛ چاکە بوو بۆ دڵ.. چاکە بوو بۆ بیر.. ئەوەتا خواوەند

---

١. صحيح البخاري، الجهاد ٣٧، الرقاق ٧؛ صحيح مسلم، ١٢١-١٢٣.

دەرگای هەزاران چاکەی کردەوە بۆ ئەوانەی گیانیان خستە سەر لەپی دەستیان، وەك ئەوەی پێیان بڵێت "ئارەزووی چ ڕێگەیەك دەکەن بیگرنەبەر، لە ئاکامدا سەرکەوتن هەر بۆ ئێوەیە." بەڕاستیش هەروا بوو...

## خ. ئەوجا شکست

بتپەرستانی مەککە بەو گورزەی لەلایەن پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لێیان درا، پشتیان شکا و تا ماوەیەکی درێژخایەنیش لەژێر هەژموونی ئەوهەستەدا مانەوە. خۆ ئەگەر هەندێك لە لایەنگرانی ئەبوجەهل نەبوونایە کە هەڵسان بە وروژاندن و پڕوپاگەندەی چڕوپڕ لەناو قورەیشدا، ئەوا هەرگیز نەیاندەوێرا لە ئوحود ڕووبەڕووی موسڵمانان بووەستنەوە. لەڕاستیدا دەرچوونی قورەیش بۆ شەڕی ئوحود تەنها دەرەنجامی ئەو هەستی تۆڵە و قینە بوو کە لە ناخیاندا پەنگی خواردبووەوە. ئەوان دەیانوت "هەرچۆنێك بووە دەبێت جارێکی تر لە مەیدانی جەنگدا یەکتر ببینینەوە!" ڕق ئەستووری و سوربوونی هیندی کچی عوتبە نموونەیەکی دیاری ئەمەیە. بە ئەبوسوفیانی دەوت "باوکم و مامم و براکەم کوژراون، کەچی تۆ وەك ژنان لەماڵەوە پاڵت لێداوەتەوە؟ لەبری ئەوەی لەگەڵ ژنێکدا دابنیشم، بچمەوە بۆ ماڵی دایکم باشتر نییە؟!"

هەموو ڕۆژێك ژنان شیوەنیان دەکرد و کراسەکانیان دەدڕاند و قژیان دەرنییەوە و پیاوانیان هەڵدەنا. ئەمەش ساڵێکی تەواوی خایاند، تا ئەوەی زۆرینەیان ناچارکرد ڕێی ئوحود بگرنە بەر و تۆڵەی خۆیان لە موسڵمانان بکەنەوە. دواتر دەگەڕێینەوە سەر ئەم باسە.

بەڵێ، لە بەدردا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گورزێکی بەهێزی دا بە تەوقی

سەریاندا، کە ئیتر جارێکی تر بیرنەکەنەوە لە بەرەنگاربوونەوەی ئیمانداران. بەڵام هیچ شتێك نەبوو بتوانێت ڕق و تووڕەیی دڵیان دابمرکێنێتەوە. دوابەدوای جەنگی بەدر سەروەرمان چاکەیەکی لەگەڵ کردن تاکو دڵە بریندارەکانیان سارێژ بکات و شکۆی ڕوشاویان نۆژەن بکاتەوە. بۆ نموونە، دەیتوانی فەرمان بدات بە پەڕاندنی سەری هەموو ئەو دیلانەی بە کۆتکراوی هێنرابوونە بەردەستی و لە ڕابردوودا ئازار و ئەشکەنجەی زۆری موسڵمانانیان دابوو. بەڵام پێغەمبەری ئازدار (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەو سۆز و بەزەییە قووڵەی دەروونییەوە وای بە پەسەند زانی چاکەیان لەگەڵدا بکات و لێیان ببورێت. بۆیە فەرمووی "با لێیان ببورین!" ئەوەبوو لەبەرامبەر ئازادکردنیاندا، فیدیەی لە هەندێکیان وەرگرت و داواشی لە هەندێکی تریان کرد هەریەکەیان دە منداڵی مەدینە فێری خوێندن و نووسین بکەن. بێگومان ئەم هەڵوێستەی ئازدارمان بێ بەرهەم نەدەبوو...

## و. ئامانجی لێبوردن لە دیلەکان

یەکەم: پێش هەموو شتێك ئەوە چاکەیەك بوو پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) لەگەڵیاندا کردن. داواکردنی فیدیە لەو دیلانەی چاوەڕێی مەرگیان دەکرد، وای کرد بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لە پێشنیارەکە بکەن. خۆ ئەو فیدیەیەش کە دایان، هەر لەبنەڕەتدا بەشێك بوو لە سامانی موسڵمانان کە لە مەککە بەجێیان هێشتبوو و ئەمان دەستیان بەسەردا گرتبوو.

دووەم: تا ئەوکاتە خوێندەواری لە مەدینەدا لە ئاستێکی نزمدا بوو. خەڵکی مەدینەیش پاڵێوراو بوون تاکو ڕۆڵێکی گرنگ ببینن لە گەیاندنی زانست و ئایینداۢ بۆیە ئەوان لە هەموکەس زیاتر پێویستییان بە فێربوونی خوێندنەوە و

نووسین هەبوو. بەوشێوەیە. جیاوازیی ئاستی ڕۆشنبیریی نێوان خەڵکی مەککە و مەدینە لە بەرژەوەندی خەڵکی مەدینە شکایەوە.

سێیەم: ئەو دیلانەی بڕیاربوو لە مەدینە بمێننەوە و منداڵانی مەدینە فێری خوێندەواری بکەن، لەڕاستیدا هەلێکی نموونەییان بۆ ڕەخسابوو تاکو لە نزیکەوە ئیسلام بناسن. کاتێکیش دەگەڕانەوە بۆ مەککە، بۆی هەبوو هەریەکەیان لەناو ماڵ و حاڵی خۆیدا ببێتە بانگخواز بۆلای بەرنامەی خوا. چونکە لە سایەی ئەو ڕێزلێنان و ڕەوشتبەرزییەوە کە سەرورمان (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەگەڵی نواندبوون، پێگەیەکی ناوازەی لە دڵ و دەروونیاندا بەدەستهێنابوو.

تکایە بیهێننە بەرچاوی خۆتان؛ ئیبن هیشامی برای ئەبوجەهل هەتا ئەو ڕۆژەی موسڵمان بوو، لە هیچ جەنگێکدا دژی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەشداری نەکرد. ئەوەندە ڕێز و جوامێری و مرۆڤدۆستی لەو مرۆڤە هەرە کامڵەوە بینیبوو، شەرمی دەکرد چیتر چەک لەڕوویدا هەڵبگرێت. خەریکە بڵێم ئەمە هەستی هاوبەشی هەموویان بوو.

چوارەم: کەسوکاری دیلەکان کە ئومێدبڕاو بووبوون لە ژیان و سەلامەتیی ڕۆڵەکانیان، وەختێ بە ساغ و سەلامەتی پێیان شادبوونەوە، هەستی ئەمەک و پێزانینی ئەو چاکەیەیان تێدا دروست بوو. چونکە زۆر چاک بیریان مابوو پێشتر خۆیان چۆن سزای موسڵمانەکانیان دابوو، بۆیە چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد تۆڵەی هاوشێوەیان لێ بکرێتەوە. کەچی ئەوەتا پێغەمبەری ئیسلام (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە چەشنێك کە شایستەی مرۆڤ بێت، مامەڵە لەگەڵ سەرانی قوڕەیشدا دەکات. ئەو نەرمی و مرۆڤدۆستییەی سەروەرمان بەرامبەریان نواندی، تەنانەت ئەوان لەگەڵ منداڵەکانی خۆشیاندا نەیاندەنواند. بەدڵنیاییەوە ئەم

ئاکاره پێغەمبەرانەیەش بووە هۆکاری ئەوەی دڵی زۆرێك لە خەڵکی مەککە و دراوسێ هاوپەیمانەکانیان فەتح بکات، بەڕادەیەك ئەگەر ئەبوجەهل نەکوژرایە لەو جەنگەدا، ئەوا جگە لە خۆی کەسی تر لە ماڵەکەیدا لەسەر بێباوەڕی نەدەمایەوە. چونکە هەموو ئەندامانی خانەوادەکەی دڵیان نەرم بووبوو. تەنانەت ئەبوسوفیان -کە سەرسەختترین دوژمنی ئیسلام بوو لەناو هۆزی ئومەییەدا- وردە وردە بەنەرمی ڕەفتاری دەکرد، ئەگەرچی مێردی ئەو ئافرەتەش بوو کە باوك و برا و مامی لە بەدردا کوژرابوون. بۆیە دەبینین نەچوو بۆ بەدری دووەم، هەرچەندە لە ئوحوددا بڕیاریشیان لەسەر دابوو. خۆ ئەگەر ئەو هەڵوێستە نەبوایە لەوانەبوو چەندەها دەرەنجامی نەخوازراو بکەوتایەتەوە.

بەڵێ، جەنگی بەدر ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چووەتە ناو بازنەیەکی بەردارەوە. چونکە لەو سەردەمەدا هەرکەس هێزی بەدەست بووایە، ستەمی دەکرد و وەك درندە ئەوانی تری ملکەچی ویستی خۆی دەکرد. ئەوەتا کاتێك هیند بۆی ڕەخسا، جگەری حەزرەتی حەمزەی دەرهێنا و هاوشێوەی مرۆڤی چاخە سەرەتاییەکان کە گۆشتی مرۆڤیان دەخوارد، لەدەمیدا جوی.[1] خۆ ئەگەر لە بەدریشدا ئەوەی بۆ بڕەخسایە ئەوا یەك و دووی لێ نەدەکرد. بەڵام کە ئەم دەرفەتە کەوتە دەستی موسڵمانەکان، موسڵمان ئاسا چەندین نموونەی بەرزیان لەمەڕ چۆنێتی ڕەفتاری مرۆڤانە نیشاندا. لەکاتێکدا کە خەڵکانی تر لەو جۆرە مەیدانەدا دەبوونە ئامانجی چارەڕەشی، کەچی موسڵمانان دڵەکانیان ڕادەگرت، ئەوەش ئاکامی فەتانەتی پێغەمبەری خوا بوو (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ). دیارە ئێمەش کە باس لە ڕەهەندی سەربازیی پێغەمبەر دەکەین، وەك یەکێك لە مەوداکانی ئەو فەتانەتە باسی دەکەین.

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٤٦٣/١؛ إبن أبي شيبة، المصنف ٣٧١/٧.

## ز. هۆکارەکانی سەرکەوتن

ئەگەر لە سۆنگەی هۆکارەکانەوە بڕوانینە سەرکەوتنی سوپای ئیسلام لە بەدردا، ئەوا دەتوانین لەسەر ئەم چەند خاڵەی خوارەوە بوەستین:

سەرەتا دەبێت ئەوە بڵێین کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ئامادەکارییەکی تەواوی سەربازیی کردبوو. بە سوپایەکەوە بەشداری بەدری کرد کە ملکەچی یەك سەرکردە بوو. وە بەگوێرەی یەك فەرمان جوڵەی دەکرد. لەهەمان کاتدا سوپاکە خاوەن گیانێکی مەعنەویی بەرز و باوەڕێکی پتەو بوو. بەهۆی باوەڕی دامەزراویانەوە هەر لە دنیادا باخ و بێستانەکانی بەهەشتیان دەدی. تەنانەت کە بەسەر گردەکاندا بەرەو بەدر دەڕۆیشتن، دڵنیا نەبوون ئایا پێ بەسەر گردەکانی بەدردا دەنێن یاخود گرد و قەدپاڵەکانی بەهەشت!

ئا بەو ئیمانەوە ڕۆیشتن بۆ بەدر. گیانی سەربازەکان شەتەکی گوێڕایەڵی ئەو فەرمانانە بوو کە پێیان دەگەیشت. با بڵێین ئەگەر هەندێکیان سەریشیان بپەڕێنرایە، ئەوانەی تەنیشتیان تاکو فەرمانیان پێ نەکرایە هیچ کاردانەوەیەکیان نەدەبوو. هەمووان چاویان بڕیبووە ئەو فەرمانەی لە پێغەمبەرەوە دەردەچوو.

دیارە دەرچوونی فەرمانیش لە یەك مەڵبەندەوە کاریگەریی مەزنی هەیە لەسەر ڕەوتی جەنگ. هەربۆیە پێغەمبەری سەروەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بنەمای ناوەندی بوونی فەرمانەکانی لەسەر بناغەیەکی پتەو داڕشت. بەدەر لەوە، تۆڕێکی هەواڵگری و پەیوەندیی چالاك و بەکاری پێکهێنابوو. لەناو خێوەتەکەیەوە دەیتوانی سەرپەرشتی هەموو بەرەکان بکات. هەندێکجار دادەبەزی بۆ ناو سەربازەکانی و بەسەری دەکردنەوە. لە هەر جێگەیەکدا چاوی بە لاوازییەك یان کەلێنێك بکەوتایە، ڕاستەوخۆ چارەی دەکرد. حەزرەتی عەلی

دەفەرموێت "وَنَحْنُ نَلُوذُ بِرَسُولِ اللهِ وَهُوَ أَقْرَبُنَا إِلى الْعَدُوِ (لە ڕۆژی بەدردا خۆمان دەدایە پەنای پێغەمبەر، لەکاتێکدا ئەو لە هەموومان زیاتر لە دوژمنەوە نزیک بوو.)"[1]

ڕاستە خۆشەویست (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە دوژمنەوە نزیک بوو، بەڵام با یەکێک لە دوژمن بیوێرایە لێی نزیک ببێتەوە! سوێند بەخوا یەکسەر خۆی لەبەردەم قەڵایەك لە گۆشت و ئێسکدا دەبینییەوە. بەڵێ، بەردەوام بەناو سەربازەکانیدا دەسووڕایەوە و هانی دەدان و وورەی بەرز دەکردنەوە و پێی دەوتن کە خوای ئاسمانەکان و زەوی لەگەڵیاندایە و پشتگیریان دەکات. ئا بەو گیانە بەرز و گوێڕایەڵییە کامڵەوە هەروەك بۆ بەهەشت بڕۆن ئاوەها بوون.

لەلایەکەی تردەوە، بە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی ئەو ڕۆژگارە، سەربازگەی ئیسلام لەوپەڕی ڕێکخراویدا بوو. هەروەها دابەشکرابوو بەسەر چەند بەرەیەکدا، بەرەی: ڕاست، چەپ، ناوەند و یەدەك. هەموو ئەو ڕێکار و تاکتیکانەش کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە جێگە و حاڵەتی تایبەتی خۆیدا پەیڕەوی دەکرد، بە پوختەی زانستی سەربازی ئەو سەردەمە دادەنرا. بۆ نموونە، لە بواری گوێڕایەڵیدا: دیارە سەربازی سەرتاپا گوێڕایەڵییە. لە پێشەکیی ئەو شتانەشەوەیە کە تازە سەرباز لە ڕیزی سوپادا فێری دەبێت، چونکە زۆر گرنگە. ئەگەر بە سەرباز بوترێت "بکەوە سەرزەوی!" یەکسەر خۆی دەدات بەزەویدا!.. ئەگەر فەرمانی پێ بکرێت: "هەستە!" هەڵدەستێت. بەر لە جەنگ پێغەمبەری سەروەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هاوەڵانی لەسەر گوێڕایەڵی ڕاهێنابوو. خێوەتی لەسەر گردۆڵکەیەك هەڵدابوو کە بەسەر هەموو لایەکدا دەیڕوانی. ئەو فەرمانی دەکرد و ئەوانیش بەجێیان دەهێنا.

---

[1] أحمد بن حنبل، المسند ٨٦/١؛ الطبراني، المعجم الأوسط ٣٧٢/٣.

ئەمە سەربارى ئەوەى لە دڵى سەربازەکانیدا باوەڕێکى وەهاى چەسپاندبوو کە بەهیچ شتێك نەلەرزێت. بۆیە دەتوانین بڵێین هەر لە بنەڕەتدا ئەو جەنگە جەنگى نێوان ئەوانە بوو کە ژیانیان بە هیچ دەزانى، لەگەڵ ئەوانەى گیرۆدەى داوەکەى بووبوون.

یەکێکیان دەیویست لە باخچەى گوڵان گوڵ گوڵ لێبکاتەوە، ئەوەى دیکەشیان دەیویست گوڵ بەخێو بکات با خوێنى خۆیشى بڕژێت. یەکێکیان دەیوت "ئیتر بەسە بارهەڵگرى و کۆڵدارىى دنیا، دەبێت کەى بێت دەرگاکانى بەهەشت بکرێنەوە تا بچمە ناویەوە و لە مێرگەکانیدا پشوو بدەم؟" بەڵام ئەوى تریان دەیوت "ئاى خۆزگە بەسەلامەتى دەگەڕامەوە، تاکو خۆم سەرمەست بکەم و سەماى سەماکەران ببینم و چێژ و خۆشیەکانى ئەم ژینە بچێژم!" بەڵێ، جەنگ لەنێوان ئەو دوو کۆمەڵەیەدا بوو؛ کۆمەڵێکیان دنیاى بێبایەخ دەبینى و ئەوى تریان دەیپەرست. لەهەمان کاتدا جەنگ بوو لەنێوان کۆمەڵێکى ڕێکخراو، لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکى ناڕێکى بێبەرنامە. ناکامى جەنگیش هەر لە سەرەتاوە دیار بوو. چونکە لەنێوان "یاسا و ئاژاوە"دا بوو.

وەك عەرزم کردن، ئەگەر لە ڕیزى موسڵماناندا کەلێنێك دروست ببوایە، سەردارى مرۆڤایەتى (عَلَيهِ أَفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) یەکسەر دەهاتە ناوەوە و پڕى دەکردەوە. هاوەڵانیش بە بینینى گڕوتینى سەرکردەکەیان، ئەوەندەى تر وورەیان بەرز دەبووە و دەهاتنە جۆش.

بیرمان نەچێت یەکێك لە خەسڵەتەکانى پەیامداران ئەوەیە بەردەوام پلان و ستراتیژى جێگرەوەیان هەبێت و ئاڵوگۆڕ لە تاکتیکەکانیاندا بکەن. ئەوەتا شێوازى هاتنى بۆ بەدر شێوازێکى تەواو جیاواز بوو. ئەوەى لێرەدا سەرنجمان

ڕادەکێشێت ئەوەیە کە زۆرێك لەو تاکتیکانە تۆمار نەدەکران. چونکە لە هەموو ئان و ساتێکدا ئەگەری ئەوە لە ئارادا بوو دوژمن زەفەریان پێ بەرێت.

پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە بیری خۆیدا ئەوەندە وردبینانە نەخشەی دادەڕێژا، هیچ وردەکارییەکی فەرامۆش نەدەکرد. ئەو پلانە سەربازییانەی ئەمڕۆ لەسەر نەخشە و ئامرازی جۆراوجۆر نیشان دەدرێت، ئەو لە مێشکی خۆیدا دایدەڕشت، کە وەختیشی دەهات وەك خۆی جێبەجێی دەکردن. پلانێکی وەهای دانابوو، دوژمن دەیهێنا و دەیبرد سەری لێ دەرنەدەکرد. جگە لە هاوەڵە نزیکەکانی خۆیشی، هەتا کۆتایی جەنگ کەسی تر شێواز و چۆنیەتی جموجوڵ و هەنگاوەکانی نەدەزانی. بەپێچەوانەوە، بێباوەڕان بە شێوازێکی هەڕەمەکی دەجەنگان. سوپاکەی پێغەمبەر بەرچاوڕوون بوو لە کوێدا تیر دەهاوێت.. کەی ڕم دەوەشێنێت، بە ئەوپەڕی زانیاری و بەرچاوڕۆشنییەوە هەنگاوی دەنا.

بەڵێ، ستراتیژ و پلانداری تا بڵێیت پێویستە. بەدەر لە هەندێك تایبەتمەندیی سەردەمیانە و دەگمەنی ئەم چاخە، پێم وایە سەرەڕای ئەو پێشکەوتنە بەرچاوەی بەدەست هاتووە، هێشتا ماومانە بگەینەوە بەو ئاستە باڵایە لە ستراتیژ و پلانداری.

## ی. هەڵهاتن لە باوەڕدار ناوەشێتەوە

خاڵێکی دیکە کە جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەین، ئەوەیە کە هیچ سەربازێك سەربەخۆ ڕەفتاری نەدەکرد و بەگوێرەی ویستی خۆی نەدەجولایەوە. هەتا لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانێك نەهاتایە. ئەوان لە

شوێنی خۆیان نەدەجوڵان، ئەگەرچی سەریشیان دابنایە یاخود تووشی شکستیش ببوونایە. مەگەر قورئانیش هەمان فەرمانی پێ نەدەکردن؟! ئەوەتا دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحۡفٗا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ ﴾

(الأنفال: ١٥)

"ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! لە سەرووەختی لەشکرکێشیدا کاتێك بەرەنگاری ئەوانە بوونەوە کە بێباوەڕن، پشتیان تێ مەکەن و ڕامەکەن."

لە باوەڕدار ناوەشێتەوە لە مەیدانی جەنگ هەڵبێت. پارچە پارچەش بکرێت ئەو هەڵهاتن بەخۆی ڕەوا نابینێت. مێژوو پڕیەتی لە هەزاران نموونەی لەوجۆرە. دڵنیێت هەریەك لەو نموونانەش شێرەکانی بەدریان کردووەتە سەرمەشق و چاویان لەوان کردووە. ئەمەش بۆخۆی دیوێکی تری ئەو سەنگەیە کە جەنگی بەدر هەیەتی لە یادەوەری موسڵمانانندا!.

لە جەنگی "یەرموك"دا بیست هەزار پاڵەوان بەرامبەر سوپای دووسەد هەزار سەربازیی بیزەنتی وەستانەوە. ئەویش هاوشێوەی جەنگی بەدر بوو. ئاڵای ئەم سەرکەوتنەش دیسانەوە لەسەر دەستی ئەو کەسانە شەکایەوە کە هەڵگری هەمان هەست و ڕۆحیەت بوون. لە حاڵی پاڵەوانێکی وەك عەییاشی کوڕی قەیس بڕوانن! لە قرچەی نیوەڕۆدا قاچی بە گورزی شمشێر پەڕیبوو، کەچی هەتاوەکو عەسر هەستی پێ نەکردبوو. دوای کۆتایی هاتنی جەنگ و بەدەستهێنانی سەرکەوتن، ویستی وەك جاران لە ئەسپەکەی دابەزێت. کاتێك ویستی قاچی دابنێت، گلا و کەوتە سەرزەوی. کە ویستی هەستێتەوە، ئەوسا زانی چی لێقەوماوە. قاچێکی پێش خۆی چووبوو بۆ بەهەشت. پاش چەندین

ساڵ لەو بەسەرهاتە، کاتێك نەوەکەی ویستی خۆی بە پێشەوا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (رضيَ اللهُ عَنهُ) بناسێنێت، وتی "ئەی پێشەوای باوەڕداران! من نەوەی ئەو کەسەم کە لە قرچەی نیوەڕۆدا قاچی پەڕیبوو، کەچی هەتا عەسر پێی نەزانیبوو!"[1]

هەڵهاتن لە بەرەی جەنگ تاوانێکی گەورەیە. خوای باڵادەست لەوبارەیەوە پێوەرێکی دیاریکراوی داناوە، کشانەوەش تەنها لە چوارچێوەی ئەو پێوەرەدا مۆڵەتدراوە. هیچ کەسیش مافی ئەوەی نییە لە ئەنجامی لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی سەربەخۆ و کەسیی خۆیەوە بڕیارێکی لەوجۆرە بدات. ئەم ئایەتە پیرۆزەش ئەو پێوەرەمان بۆ دیاری دەکات:

﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾

(الأنفال: ١٦)

"هەرکەس لەو ڕۆژەدا ڕابکاتە دواوە و پشتیان تێبکات. ئەوا بەڕاستی لەگەڵ خەشم و قینی خوادا گەڕاوەتەوە و سەرەنجام جێ و ڕێگەی دۆزەخە. کە ناخۆشترین جێگە و سەرەنجامە. مەگەر مەبەستی بەکارهێنانی هونەری جەنگ بێت. یاخود مەبەستی جێگۆڕکێ بێت بۆلای دەستەیەکی تر."

ئەودەمەی پاڵەوانانی جەنگی "موئتە" گەڕانەوە بۆ مەدینە، لەشەرمدا ڕوویان نەدەهات بچنە دیداری سەروەری مرۆڤایەتی. خۆیان بە هەڵهاتووی جەنگ دەبینی، بۆیە خۆیان لەبەرچاوان ون دەکرد. بەڵام پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيهِ) دڵنەوایی کردن و ئامێزی بۆ کردنەوە و ئەو ئایەتە پیرۆزەی

١. البلاذري، فتوح البلدان ١٤٢/١-١٤٣؛ ابن عساكر، تاريخ دمشق ٣٧٧/١٥؛ ابن حجر، الإصابة ١٨٧/٢، تبصير المنتبه ٣٩٧/١.

پێشووی بۆ خوێندنەوە. ئەوجا فەرمووی "ئێوە هەڵنەهاتوون، بەڵکو پەناتان بۆلای من هێناوە؛ خۆتان کۆدەکەنەوە و سەرلەنوێ دەگەڕێنەوە."[1] بەڵێ، ئەگەر بڕیاربووایە بکشێنەوە، ئەوسا دەبوو بە فەرماندە بێت و لەو چوارچێوەیەدا پەنایان بۆ ببردایە.

لایەنێکی تری گرنگ ئەوەیە کە دەبێت سەرکردە لەناو سەربازەکانیدا بێت. مێژوو شایەتی دەدا کە هەرکات خودی پێشەوای دەوڵەتانی ئیسلامی سەرکردایەتی سوپایان کردبێت، ئەو سوپایە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا سەرکەوتووبووە. هەرکاتێکیش لەناو کۆشك و تەلارەکانیاندا دانیشتبن، شپرزەیی و خۆدزینەوە و پاشەکشە چارەنووسیان بووە.

تاکو ئێرە هەوڵماندا شرۆڤەی ئەو سەرکەوتنانە بکەین کە لە جەنگی بەدر و جەنگەکانی تردا بەدەستهاتوون. دیارە هەمووشیان دەرئەنجامی پشت بەستن بە خوا و گرتنەبەری هۆکارەکان بوون. بەڵێ، پاش ئەوەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەموو دوعا کردارییەکانی ئەنجامدا، ئەوجا دەستی هەڵبڕی و بەکوڵ لە پەروەردگاری پاڕایەوە. کە ئەو دوو دوعایەش یەکیان گرت، خوای گەورە سەرکەوتنێکی گەورەی خەڵاتکردن.

لە بڕگەکانی سەرەوەدا هەوڵماندا لە سۆنگەی سەرچاوەکانی سیرەوە تیشکێك بخەینە سەر جەنگی بەدر. بۆمان دەرکەوت کە ئەو سەروەرە سەرکردەیەکی سەربازیی ناوازە بووە. چونکە بێ ئەوەی دووچاری هیچ هەڵەیەك یان کەمتەرخەمییەك ببێتەوە، توانیویەتی بە مشتێك قارەمانی نەبەردەوە بگاتە ئەو ئامانجەی کە پەروەردگاری بۆی دیاریکردووە. ئێمەش لەلای خۆمانەوە

---

١. سنن أبي داود، الجهاد ١٠٦؛ سنن الترمذي، الجهاد ٣٦.

لەنێوچاوانی سەروەرییەکانیدا هەمیشە ئەوە دەخوێنینەوە کە "محەممەد پێغەمبەری خوایە." ئەی هۆکاری سەرکەوتنەکانی چی بوو؟ هۆکارەکەی ئەوەبوو ئەو (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) پێغەمبەر و نێرراوی بەدیهێنەری جیهانیان بوو. سەرکردەیەکی سەربازیی ناوازە بوو، چونکە خوا پەروەردەی کردبوو. فەرمانبەرییەکەی وای دەخواست وانەکانی لە پەروەردگارەوە وەربگرێت. فەتانەتەکەی گەورەترینی ئەو بەخششانە بوو کە خوا خەڵاتی کردبوو. چونکە بەوهۆیەوە بەوپەڕی وردی لە فەرمانەکانی خواوەند تێدەگەیشت و وەك خۆی جێبەجێی دەکرد. فەتانەت ئەو ئەقڵە کامڵە سەرسووڕهێنەرە بوو کە بێ کەموکورتی و دوور لە هەموو چەشنە شێواندنێك، لە مەبەستە خواییەکان تێدەگەیشت و چۆن بوون ئاوەها دەیگەیاندن.

بەڵێ، ئەو شانازی مرۆڤایەتییە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تاکە مرۆڤ بوو کە توانی ڕاستییەکانی دووتوێی قورئان (پێڕستی فەرمانە ئیلاهییەکان) و. ڕێسا بەکارەکانی ناو پەڕاوی گەردوون لەتەك یەکدا موتاڵا بکات و یەکیان بخات. قورئان چی بوتبایە پەڕاوی گەردوونیش، کە پێشتر بەگوێرەی زانستی خوا نووسراوە و بە ویستی ئەوزاتە هێنراوەتە گۆڕەپانی بوون و بەرگی وجودی بەبەردا کراوە، هەمان شتی دەوت. کەسێکی تر نییە هاوشێوەی پێغەمبەری نازدار (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بێت لە یەکخستن و گونجاندن - دروستتر بڵێین- لە تێگەیشتن و بەکردەکردنی ئەو تەبایی و گونجانەی کە لەنێوان ئەو دوو پەڕاوەدا بوونی هەیە.

## ٢. ئوحود؛ هەورازە سەختەکە

با ئێستا بگەڕێینەوە سەر باسی جەنگی ئوحود و لە سۆنگەی ئەو جەنگەوە بڕوانینە فەتانەتی بێهاوتای ئەو سەرکردە ناوازە و مرۆڤە مەزنە. ئوحود، ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەی کە تێیدا باوەڕدار لە دووڕوو و.. وەفادار لە بێوەفا و.. مەرد لە نامەرد و.. شەیدایانی پێغەمبەر لە ناحەزانی جیابوونەوە، هەمیشە ناخی دڵی بێداران دەهەژێنێت.

جارێکیان پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بەلای چیای ئوحوددا تێپەڕ بوو، دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر تەماشای کرد. ئەوجا فەرمووی "أُحُدٌ جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ. (ئوحود چیایەکە ئێمەی خۆشدەوێت و ئێمەش ئەومان خۆشدەوێت.)"[١]

ئەم وتەیە، وەك بڵێیت بەرگرییەکی تەمەن چواردە سەدەییە لە ئوحود، بەرامبەر بەوانەی کە هێشتا زویرییەك لە دڵیاندا ماوە. لێرەدا پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) هەڵدەستێت بە فێنککردنەوەی ناخەکان و دواندنی دڵڕەنجاوان و پیشاندانی هۆکاری دیکە، نەبادا بەدفەڕییەك یان بێوەفاییەك بدرێتە پاڵ ئەو چیایە.

بەڵێ. لە سەردەمی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە هیچ جەنگێکدا موسڵمانان وەك جەنگی ئوحود شکۆیان بریندار نەبووە. ئەوە ڕاستە، بەڵام خۆ هۆکارەکەی چیای ئوحود نەبوو! نەك هەر ئەو نەبوو. بگرە ئەو بووە پەناگە و داڵدەیان لەوکاتەدا کە شپرزەیی و شڵەژان زۆری بۆ هێنابوون. لە بازنەی هۆکارەکاندا پەنایان بۆ ئەو برد و لە شکستێکی ڕەها ڕزگاریان بوو.

لە بنەڕەتدا هۆکاری ڕاستەقینەی ئەو شکستە کاتییەی موسڵمانان گرفتاری

---

١. صحيح البخاري، الزكاة ٥٤؛ صحيح مسلم، الفضائل ١١.

بوون، لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هەر لەسەرەتاوە ژمارەیەك لە دووڕووان لە سوپا کشانەوە و لەپشتەوە گورزیان لە موسڵمانان وەشاند. بێگومان ئەوەش شوێنەوارێکی ئەرێنی لەسەر هێزی مەعنەویی موسڵمانان دروستکرد. ئەمە سەرباری ئەوەی هەندێك لە هاوەڵان ڕەچاوی ئەو هەستیارییە چاوەڕوانکراوەیان نەکرد کە دەبووایە لە ملکەچی بۆ فەرمانەکانی حەزرەت بیاننواندایە و، کەوتنە شوێن ئارەزووی کۆکردنەوەی دەستکەوتی جەنگ.

هۆکارەکەی هەرچییەك بێت، لەکۆتاییدا موسڵمانان لە ئوحوددا تووشی لەرزەیەکی بچووك هاتن. بەڵام هەرگیز دروست نییە ئەو دەرەنجامە بدرێتە پاڵ ئوحود. بۆیە پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) خۆشەویستیی خۆی بۆ ئوحود دەربڕی، تاکو ئەو گومان و ئەندێشەیە لە مێشکی باوەڕداراندا بڕەوێنێتەوە.

ئێستاش با باسی ئەوە بکەین کە چی ڕوویدا و چۆن هاتن بۆ ئوحود و هۆکارەکانی چی بوون. ئایا دەکرا خۆیان بپاراستایە لە پێکدادان؟ با یەکەمجار توێژینەوەیەکی شەڕەکە بکەین، تاکو ڕوون ببێتەوە کە پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) تەنانەت لەو جەنگەشدا کە ناکامەکەی لە بەرژەوەندی باوەڕداران نەبووە، چ سەرکردەیەکی سەربازیی بێوێنە و نایاب بووە.

بتپەرستانی مەککە بەهۆی شکستیان لە جەنگی بەدردا، ڕق و قینێکی زۆریان لە ناخیاندا مەڵاس دابوو، ئەخاسمە ئەوانەیان کە خزم و کەسوکاریان بووبوونە سووتەمەنی سەرکەشییەکەی قوڕەیش. ئەمانە بەردەوام هانی خەڵکی مەککەیان دەدا و دەیان وروژاندن تاکو تۆڵەی خۆیان لە موسڵمانان بسێننەوە.

هەوڵەکان تەنها سنوورداری مەککە نەبوون، بەڵکو لە مەدینەش لەڕێی کەعبی کوڕی ئەشرەفەوە بەهەمان ئاراستە کار دەکرا. ناوبراو یەکێك بوو

لە هۆزانڤانانی جولەکە. هەوڵی دەدا بە هۆنراوەکانی تۆمەت و بوختان بۆ ئافرەتانی موسڵمانان دروست بکات و دووبەرەکی و ئاژاوە بخاتە نێوانیانەوە. تەنانەت سڵی نەدەکردەوە لەوەی زمانی چەپەڵی بۆ خودی پێغەمبەریش درێژ بکات. لەگەڵ ئەوەشدا کە موسڵمانان زۆر نیگەران بوون لەو دۆخە، کەچی بەردەوام دووربینی و کارزانیی سەروەر هێوری دەکردنەوە.

بتپەرستانیش دەستیان کرد بە ڕێکخستنی یەکەی سەربازی، لەڕێی ئەو هەڵمەتی بەتاڵانبردن و شاڵاوە سەربازییانەوە کە ئەنجامیان دەدا، هەوڵی لاوازکردنی گیانی مەعنەویی خەڵکی مەدینەیان دەدا، جارجاریش لەوەدا سەرکەوتوو دەبوون.

دوای جەنگی بەدر و بەدرێژایی ساڵێك بەوشێوەیە خەریکی زەمینەسازی بوون. وەك چۆن میکرۆبی زیانبەخش تەنگ بە لاشە هەڵدەچنێت، مەککەییەکانیش بەوجۆرە دەستیان دایە تەنگهەڵچنین بە خەڵکی مەدینە. بۆیە زۆر پێویست بوو ئەو شارە هێمنەی کە پاڵێوراوی ئەوە بوو ببێتە لانکەی شارستانییەت، لە هەموو چەشنە میکرۆبێکی زیانبەخش بپارێزرێت.. پێغەمبەریش (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەو کارە هەستا.

لەو ماوەیەدا کەعبی کوڕی ئەشرەف کە لە نەیارە سەرسەختەکانی ئیسلام بوو کوژرا. چونکە سەرکردایەتی تۆڕێکی ناپاکی دەکرد و کردارەکانی ئەوەیان دەخواست بکوژرێت. محەممەدی کوڕی مەسلەمە بەو ئەرکە هەستا.[1]

لەولاشەوە جولەکەکانی هۆزی "قەینقاع" ژێر بەژێر دەستیان دابووە ئاژاوەگێڕی، سەرەڕێیان بە ئافرەتێکی موسڵمان گرتبوو و بێڕێزییان بەرامبەری نواندبوو.

---

١. صحيح البخاري، المغازي ١٦،١٥؛ صحيح مسلم، الجهاد ١١٩؛ إبن هشام، السيرة النبوية ١٢١/٣.

ئەوەش وازیان نەهێنا. بەڵکو لەبەرئەوەی متمانەیان بە قەڵا تۆکمەکانیان هەبوو، بە پێغەمبەریان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) دەوت "ئەی محەممەد! بەوە لەخۆت بایی مەبی کە لەگەڵ خەڵکێك جەنگاویت هیچ لەبارەی جەنگەوە نازانن و تۆش لێت بردوونەتەوە. خۆ ئەگەر ئێمە جەنگت لەگەڵدا بکەین، ئەوسا دەزانیت ئێمە کێین!"

پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) ڕووبەڕووی ئەو کەسە نامەردانە بوویەوە کە لە کەمیندا بوون بۆ هێرشکردنە سەر موسوڵمانان و هەردەم پلانی هێرش و ناپاکی گەورەتریان دادەڕشت. جولەکەکان پەشیمانبوونەوە لەو کارانەیان و ناچاربوون خۆیان بدەن بەدەستەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی بە هیچ جۆرێك جێی متمانە نەبوون، بۆیە لە مەدینە دووری خستنەوە.[1]

ئیدی مەدینە هێدی هێدی دەبووەوە بە شارە ئارامەکە. لەو نێوەندەشدا مەککە دەکوڵا؛ ئەبوسوفیان سوێندی خواردبوو هیچ بۆنێکی خۆش بەکار نەهێنێت تا تۆڵە لە موسڵمانان نەکاتەوە. تەنانەت جارێکیان بەدزییەوە هاتبوو بۆ ئەو گەڕەکەی کە نشینگەی جولەکەکانی "هۆزی نەضیر" بوو، و ئاگری بەردابووە ماڵێك یان دوو ماڵی موسڵمانان... کاتێکیش هەواڵی هاتنی موسوڵمانەکانی بیستبوو هەڵهاتبووەوە بەرەو مەککە.

ئەو تۆڕی هەواڵگرییەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) دایمەزراندبوو، بە بەردەوامی و یەك بەیەك هەواڵەکانیان بۆ دەهێنا. یەکێك لە هەواڵەکان ئەوەبوو کە قوڕەیش بە ژن و پیاو و وردودرشتیانەوە، هاودەم لەگەڵ پاڵپشتی هەندێك لە هۆزە هاوپەیمانەکانیان بەرەو مەدینە کەوتبوونە.

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٣/ ٣١١-٣١٣؛ إبن كثير البداية و النهاية ٤/ ٣-٥.

دەستبەجێ پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) گەورەپیاوو کارەکانی کۆکردەوە و کەوتە پرس و ڕا لەگەڵیان. بۆچوونی خۆی وەهابوو لەناو مەدینەدا بمێننەوە و جەنگی بەرگری بکەن. وەك چۆن قورەیش لە بەدردا خۆی لەبەرامبەر ستراتیژییەتێکی تەواو جیاوازدا بینیەوە کە پێی ڕانەهاتبوو، دەبوو ئەمجارەش ڕووبەڕووی شێوازێکی جەنگی نەزانراو ببێتەوە. چونکە بە سوودوەرگرتن لە ئەزموونی بەدر، قورەیش ئەمجارە خۆی بۆ جەنگێکی مەیدانی ساز دەکرد. بۆیە ئەگەر موسڵمانان لەناو مەدینەدا بمێننەوە و بەرگری بکەن، ئەوسا قورەیش ناتوانێت گەمارۆیەکی درێژخایەن بەسەر مەدینەدا بسەپێنێت. لەبەرئەوە ناچار دەبن پاش چاوەڕوانییەکی بێئومێدانە، پاشەکشە بکەن. بەکورتی ڕای پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەبوو کە ئافرەت و منداڵەکان لە جێگایەکی متمانەپێکراودا نیشتەجێ بکرێن. دواتر لە گەڕەکەکانی دەوروبەری مەدینە ڕووبەڕووی قورەیش ببنەوە و بەرگری بکەن.[1]

هەڵبژاردنی ئەم شێوازە لەسەر بنەمای ئەم چەند خاڵەی خوارەوە بووە:

أ. لەبنەڕەتدا جەنگ ئامانجی سەرەکیی موسڵمان نییە. چونکە ئەوان نوێنەری ئاشتی و سەقامگیرین.

ب. بەڵام ئەگەر لایەنێك ویستی لەمپەر لەبەردەم بڵاوکردنەوەی حەق و حەقیقەتدا دروست بکات، ئەوا بۆ لادانی ئەو کۆسپە هەموو قوربانییەك دەدرێت.

ج. کاتێك موسڵمانان هێرشیان دەکرێتەسەر، دیارە لەبەرئەوە دەجەنگێن تاکو

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٣/٣٥١؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٨-٩؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/١١.

بەرگری لە ئایین و ناموس و شەرەفیان بکەن. خۆ ئەگەر پێویستی کرد ئەوا لە پێناو ئەو مەبەستەدا دەشکوژن و دەشکوژرێن. ئەوەش مافێکی ڕەوای خۆیانە.

دیارە زۆر گرنگ بوو هەڵوێست و دامەزراوییەکی لەوجۆرە پیشانی ئەو خەڵکە سەرسامەی دەوروبەر بدرێ کە چاودێریی پێشهاتەکانیان دەکرد. لەبەرئەوە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جەنگی بەرگری پێ باش بوو...

## أ. ڕاوێژی پێش ئوحود

پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیویست جەنگی بەرگری بکات.. لەوماوەیەدا خەوێکی بینی، بە یارانی فەرموو "بەخوا خەوێکی خێرم دیوە؛ مانگایەکم بینی، دەمی شمشێرەکەشم کەلێکی تێکەوتبوو، بینیم دەستم چووە بەناو قەڵغانێکی تۆکمەدا. وا لێکم دایەوە کە مەدینەیە."

ئەوەبوو بەمشێوەیە لێکدانەوەی بۆ کرد "بینینی مانگاکە ئاماژەیە بۆ شەهیدبوونی چەند هاوەڵێکم. کەلی شمشێرەکەشم پیاوێکە لە خزمە نزیکەکانم شەهیددەبێت. قەڵغانەکەش مەدینەیە." بۆیە حەزی دەکرد لە مەدینە بمێنێتەوە.

بەڵێ، خوای باڵادەست پێغەمبەرەکەی ئاگادارکردەوە و زەنگ و ئاماژەیەکی پێدا تاکو جەنگی بەرگری بکات. کەلی شمشێرەکەشی ئاماژە بوو بۆ شەهیدبوونی حەمزە(شێری خوا).[1]

جگە لەوە، کۆمەڵێك لە هاوەڵان لە جەنگی بەدردا بەشدارییان نەکردبوو،

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٨؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/١١-١٢.

بەردەوام لە خوا دەپاڕانەوە شەهیدبوونیان خەڵات بکات، خوا نزای ئەوانیشی گیرا دەکرد.

بۆ نموونە؛ ئەنەسی کوڕی نەضر دەیوت "لە یەکەم جەنگدا لە خزمەت پێغەمبەردا نەبووم. جا ئەگەر خوا بەهرەمەندم بکات لە خزمەتیدا بەشداری جەنگ بکەم، ئەوا هەر خۆی دەزانێت چی دەکەم!" ئەنەس و هاوشێوەکانی هەمیشە بەم تێبینییەوە هەڵدەستان و دادەنیشتن کە داخۆ ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێکە و ناوی چییە کە تێیدا شەهید دەبن و شەربەتی شەهادەت دەنۆشین، بەخوێنی شەهیدی دەستنوێژ دەشۆین و پاشان دەچینە خزمەتی پەروەردگار بەدرێژایی ساڵێك ئاوەها دەپاڕانەوە. گومانی تێدا نییە دوعایەکی لەوجۆرە ڕەت نەدەکرایەوە.. لەڕاستیشدا ڕەت نەکرایەوە.[1]

مەگەر هەر خوا بزانێت چەندی دیکەی وەك ئەوان بەهەمان ئاوات و تاسەوە سووتابن و. دەستەودوعا پاڕابێتنەوە و داوای دەرفەتی شەهیدبوونیان لە پەروەردگار کردبێت!

عەبدوڵڵای کوڕی جەحش و عەمری کوڕی جەموح و سەعدی کوڕی ڕەبیع، لەو هاوەڵە ئاخیرەتویستانە بوون کە چاوەڕێی شەهیدبوونیان دەکرد. لەبیرمان نەچێت کە خاتوو سومەییە و کوڕەکانیشی لەوانە بوون کە بە تاسەوە چاوەڕوانی شەهیدی بوون. شەهیدی بووبووە خولیا و خەونی شەوانیان. ئیتر ئەو ڕۆژە نەمانە تای تەرازووی ڕاوێژیان بەلای خۆیاندا شکاندەوە.

پێغەمبەری ئازیز (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لەڕێی ڕاوێژەوە وای دەکرد کە خەڵکی بابەتەکان بە هی خۆیان بزانن. دەبوو بەوجۆرە ڕەفتار بکات تاکو

---

١. صحيح مسلم، الإمارة ١٤٨.

هەموو کەسێك وا هەست بکات کە ئەوە کێشەی خۆیەتی و پێویستە بە هەموو توانایەوە پشتگیری لێ بکات. ئەوەی ئەم بۆچوونەش دەچەسپێنێت ئەوەیە کە خۆی لە تەواوی هەنگاوەکانی بڕیارداندا بەشداربووە. ڕاستە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەلایەن نیگای ئاسمانەوە پشتی دەگیرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕاوێژی بە هاوەڵانی کرد، تاکو دواتر هیچ کەسێك ڕەخنە لە قەدەر نەگرێت و نەڵێت ئەگەر ئێمە وامان بکردایە ئەوا ئەنجامەکەی وەها دەبوو. بۆیە سەرەتا ڕاوێژی دەکرد و ئیجتیهادەکانی خۆی دەردەبڕی.

بەڵام ئەو لاوە خوێنگەرمانەی بەشداری بەدریان نەکردبوو، دەیانوت "ئەی پێغەمبەری خوا، با وەك بەدر بکەین؛ با بڕۆینە مەیدانەوە، با دەستەویەخە لەگەڵیان بجەنگین. ئێمە لەو ڕوویەڕووبوونەوە پیرۆز و شەرەفمەندانەیە بێبەش مەکە!"[1]

بەڵێ، ئەوان بەدریان دەکردە نموونە و دەیانویست بەهەمان شێوە بجەنگن. پێغەمبەریش (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) لەگەڵ ئەوەدا نەبوو ستراتیژێك دووبارە بکاتەوە کە پێشتر لە جەنگێکی تردا بەکاری هێناوە. دەبوو هەرجارە و دوژمن خۆی لەبەرامبەر شێوازێکی نوێدا ببینێتەوە. ئەوەندە هەبوو گەنجەکان لەسەر ڕای خۆیان سووربوون. تا گەورە هاوەڵان ئاگاداری بابەتەکە بوونەوە، دەمێك بوو پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بەرگی جەنگی پۆشیبوو و شمشێری لە خۆی بەستبوو. چوونیان بۆ خزمەت پێغەمبەر و هەواڵپێدانی بەوەی گەنجەکان لە پێداگرییەکەیان پاشگەزبوونەتەوە، چیدی هیچی لە بابەتەکە نەدەگۆڕی. چونکە ئەوکات چەندین بۆچوونی جودا و گرفتی دیکە دەهاتە ئاراوە.

بەر لە هەموو شتێك پاشگەزبوونەوە لە بڕیار وا دەکات ئەوانی دیکەش

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٩/٤؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/١١-١٢.

لەسەر بۆچوونەکانی خۆیان پێداگری بکەن و فشار دروست بکەن. کە ئەمەش بۆخۆی بەواتای چوونە ناو بازنەی بەتاڵ دێت. ئەمە وێڕای ئەوەی بڕیارگۆڕینی بەردەوام بەگوێرەی هەست و بیرکردنەوەی کەسەکان هەڵەیەکە تەنانەت سەرکردەیەکی سادەش پێی هەڵناسێت. چ جای ئەگەر ئەو سەرکردەیە، سەرداری سەرکردەکان و مایەی شانازیی هەموو بوونەوەران بێت!

لەلایەکی دیکەوە ئەگەر بهاتایە و لە جەنگی بەرگریدا کۆمەڵە گرفتێك بهاتایەتە پێش، ئەودەم ئەگەری ئەوە لەئارادابوو ئەوانەی لەسەرەتاوە لەگەڵ بیرۆکەی بەرگریدا نەبوون، دەنگی ناڕەزایی و گلەیی بەرز بکەنەوە. هەر هیچ نەبێت دەرگای ئەگەر لەبەردەم بیرکردنەوەیەکی لەوجۆرەدا هەمیشە کراوەیە.

پاشانیش ئەو سەرکەوتن و ناوبانگ و دەستکەوتەی لە جەنگی بەرگریدا بەدەستدێت، هەرگیز بەراورد ناکرێت بەوەی لە پێکدادانی مەیدانیدا وەدەستدێت. بۆیە دەکرا ئەم لایەنەش لەلایەن ئەوانەوە بقۆزرێتەوە کە ناڕازی بوون.

جا لەبەر ئەم هۆکارانە و چەندانی تری وەك ئەمانە، پێغەمبەر (عَلَيهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) فەرمووی ''هەر پێغەمبەرێك بەرگی جەنگی پۆشی، ئیتر بۆی نییە دایبکەنێت هەتاوەکو خوا بڕیاری خۆی دەدات.''[1] چونکە خوا لەڕێی قورئانی پیرۆزەوە فەرمانی پێ کرد:

﴿ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ ﴾ (آل عمران: ١٥٩)

"(دوای مەشوەرەت و پرس و ڕا) ئەگەر بڕیارت دا (کارێك ئەنجام بدەیت. ئەوا ئەنجامی بدە و) پشت بەخوا ببەستە."

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٣/٣٥١.

بەڵێ، هەر دوودڵییەك ڕاستەوخۆ دڵەڕاوكێ و ترس و نیگەرانی دەخاتە دڵی شوێنكەوتووانەوە. هەر جموجوڵێكی تازەش دەبێتە مایەی بێشیرازەیی بۆچوونەكان و، كۆمەڵانی خەڵك بەرەو چەندین بیروڕای جیاواز ڕادەكێشێت. ئەوەش دەبێتە هۆكاری هەڵوەشان و پارچەپارچەبوونی كۆمەڵگە.

ڕاستە تێڕوانینی پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وابوو لەناو مەدینەدا بمێنێتەوە و جەنگی بەرگری بكات، بەڵام كاتێك لە ئەنجامی ڕاوێژكردنەوە تای جەنگی مەیدانی قورس بوو، بڕیاری دا ئەوە جێبەجێ بكات كە ئەنجامی ڕاوێژەكەی لەسەر چەسپاوە. دەرەنجامەكەشی هەر چۆنێك بووایە ئەو تازە نەدەگەڕایە دواوە. خۆ ئەگەر لەپێناو چەسپاندنی بنەمایەكی گرنگی وەكو ڕاوێژ لە ژیانی گەل و دەوڵەتدا، نەك حەفتا كەس، بگرە حەفتا هەزار كەسیشی لەدەست بدایە، ئەو دیسانەوە دوودڵ نەدەبوو لە گرتنەبەری ئەو ڕێگەیە...

جەنگی بەدر فەتحێكی ڕاستەوخۆ بوو، ئوحودیش بەلای كەمەوە هێندەی بەدر فەتح بوو.

## ب. بەرەو ئوحود

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) فەرمانێكی خێرای دەركرد بەرەو ئوحود بكەونە ڕێ. تاكو سەربازەكانی جێگەی خۆیان لە ئوحود بگرن و نەهێڵن دوژمن هێرش بكاتە سەر مەدینە. ئافرەتان و منداڵان لە جێیەكی پارێزراودا نیشتەجێكران. ئەگەر دوژمن لەپشتەوە هەوڵی هاتنە ناوەوەی بدایە، گەمارۆ دەدرا و تێك دەشكێنرا. ڕاستە بڕیارەكە كتوپڕ بوو، بەڵام پلانی جێگرەوەش ئامادەكرابوو..

لە بناری ئوحود سەنگەریان گرت. ژمارەی موسڵمانان حەوت سەد کەس دەبوو. سەرکردەی دووڕووەکان، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی ئەگەرچی بۆ بەشداریکردن لە جەنگ هاتبووە دەرەوە، کەچی لە ڕێگەدا بە خۆی و پیاوەکانییەوە کە ژمارەیان سێ سەد کەس دەبوو، بەو بیانووەی ڕای وەرنەگیراوە، کشایەوە.[1] ژمارەی ئەو موسڵمانانەی زرێیان پۆشیبوو سەد کەس دەبوو، ئاڵابەدەستەکەیان هاوەڵی پایەبەرز؛ موصعەبی کوڕی عومەیر بوو.[2] زوبەیری کوڕی عەووامیش فەرماندەی ئەسپسوارەکان بوو. حەزرەتی حەمزەش فەرماندەی پیادەکان بوو.

ئنجا تیرهاوێژەکان لە جێگەیەکی گرنگ و هەستیاردا جێگیرکران، تاوەکو نەهێڵن دوژمن پێچ بکاتەوە و لەپشتەوە زەفەریان پێ ببات. عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیریش وەك سەرکردەیان دەستنیشانکرا. پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ڕاشکاوانە فەرمانی پێکردن "ئێوە لە پشتەوە پارێزگاری لە ئێمە بکەن و بە هیچ شێوەیەك جێگەی خۆتان بەجێ مەهێڵن. تەنانەت ئەگەر بینیشتان دەستکەوت دابەش دەکەین، ئێوە جێگەی خۆتان چۆڵ مەکەن. تەنانەت ئەگەر بە چاوی خۆشتان بینیتان لاشەی ئێمە بە دەمی هەڵۆکانەوەیە، دیسانەوە هەر چۆڵی مەکەن و لە جێگەی خۆتاندا دامەزراو بمێننەوە!"[3]

ئەوەی پێویست بوو پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەبێ کەموکورتی بەجێی گەیاند. جێی سەرنجە ئەمجارەیان سوپاکەی لەسەرشێوەی ڕیز ڕێك نەخست، بەڵکو لەشێوەی چەماوەی کەواندا خستنیە ڕێگە بۆ بنارەکانی ئوحود

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٩-١٠؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/١٣-١٤.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/١٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/١٥.

٣. صحيح البخاري، الجهاد ١٦٤؛ سنن أبي داود، جهاد ١١٦؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/٢٥.

تاكو دەوری دوژمن بدەن و تیرهاوێژەكانیش لەولاوە تیرבارانیان بكەن. ئەوجا لەناوەڕاستەوە بە شێرە تینووەكانی شەهادەت، هاوشێوەی: عەبدوڵڵای كوڕی جەحش و موصعەبی كوڕی عومەیر و ئەبودوجانە و شێری شێران؛ حەزرەتی حەمزە -خوا لە هەموویان ڕازی بێت- بدات بەسەر ناوجەرگەی لەشكری دوژمندا.

لە ڕۆژی بەدردا دروشمی موسڵمانان "أَحَدٌ.. أَحَدٌ" بوو. بەڵام لە ئوحوددا "أَمِتْ.. أَمِتْ" واتە، (بكوژە.. بكوژە) بوو.[1] وەك دەبینن چ دروشم و چ تەكتیكی جەنگیش گۆڕابوو. موسڵمانەكان لەپێناو خوا و پێغەمبەرەكەیدا پارێزگارییان لە خۆیان دەكرد و دوژمنیشیان لەناو دەبرد.

پلانی جەنگ چۆن نەخشەی بۆ كێشرابوو ئاوەها جێبەجێكرا.. سەروەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَالسَّلَامِ) شمشێرەكەی دەستی بەرزكردەوەو فەرمووی "كێ مافی ئەم شمشێرە دەدات؟" بە بیستنی ئەم وتەیە شەپۆلێك لە جۆش و دڵگەرمی ناخی موسڵمانانی تەنی. هەریەكەیان ئاواتی دەخواست خۆی شمشێرەكە وەربگرێت. بەڵام پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كە هەریەكەیانی لە خۆیان چاكتر دەناسی، چاوی دەگێڕا تا خاوەنە ڕاستەقینەكەی بدۆزێتەوە. دواجار خاوەنی ڕاستەقینەی شمشێرەكە، ئەبودوجانە هاتە گۆ و پرسی "مافەكەی چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟" فەرمووی "بەم شمشێرە ئەوەندە بدەیت لە دوژمن تا خوار دەبێتەوە." ئەبودوجانە وتی "ئەی پێغەمبەری خوا، من وەری دەگرم و حەقی دەدەم!" ئەویش شمشێرەكەی دایە دەستی. ئیدی جامانەی مەرگی لە سەری بەست و خۆی كرد بەناو ڕیزەكانی دوژمندا.

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ١٥/٤.

ئەبودوجانە پیاوێکی زۆر ئازا بوو، ئەنصارەکان ئەبودوجانەیان زۆر چاك دەناسی. جامانەیەکی سووری هەبوو سەری پێ دەپێچا و بەوە دەناسرایەوە. هەرکات بیپێچایە، ئیتر دەیانزانی بەرەو پیری مەرگ دەڕوات. کە شمشێرەکەی لە پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەرگرت. جامانەکەی دەرهێنا و بەستی. ئیتر کێ دەیتوانی لەبەردەمیدا بوەستێت؟ هەر بەوجۆرەش بوو.. هیچ کەس لەبەردەمیدا خۆی پێ نەدەگیرا. ئێمە هەر ئەوەندە لەو گفتوگۆیەی سەرەوە دەزانین کە لەنێوان پێغەمبەر و ئەبودوجانەدا ڕوویداوە،[1] کەچی بە کۆتایی هاتنی جەنگ دەبینین کە چەندین قارەمانی دیکەی وەك ئەبودوجانە لە ڕیزی سوپای ئیسلامدا هەبوون.

عەبدوڵڵای کوڕی جەحش لە خوا دەپاڕایەوە دوژمنێکی ڕووبەڕووبکاتەوە کە شەهیدی بکات. هاوار بۆ ڕەحمی خوا! ئەو تاسە قیامەتییە چی بوو کە لە دڵی ئەو پاڵەوانانەدا کڵپەی سەندبوو! لەولاشەوە ترکە و ئەعرەتەی حەمزە ترس و لەرزی دەخستە دڵی شێرەکانیشەوە. چوونە مەیدانی ئەو فیداکارانە پلانێك بوو هەرگیز قوڕەیشییەکان چاوەڕێی شتی وایان نەدەکرد. ئەبوسوفیان چاوەڕێی ڕۆژێکی وەك بەدری دەکرد، کەچی بەرەوڕووی شتێکی تازە بووەوە کە لە بەدردا نەیدیبوو. جا با ئەو سەدای "بکوژە.. بکوژە"ی باوەڕداران لەولاوە بوەستێت کە هێز و پێزی لە بتپەرستان بڕیبوو.

بەڵێ، بتپەرستان چاوەڕێی ئەوەیان نەدەکرد، بۆیە خێرا تێکشکان. ئەوەش گەڕی یەکەمی ئوحود بوو. لەم گەڕەدا پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سوپاکەی لەنێوان مەدینە و چیای ئوحوددا جێگیرکردبوو. واتە سەربازەکانی دابەشکردبوو بەسەر بنارەکانی ئوحوددا و، چیاکەی خستبووە پشت خۆیەوە

---

١. صحيح مسلم، فضائل الصحابة ١٢٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٢٣/٣؛ إبن كثير، البداية و النهاية ١٥/٤.

و تیرهاوێژەکانیشی لە جێگەیەکی گونجاودا دامەزراندبوو. ئەوجا فەرمانی پێدان "وریا بن لە جێی خۆتان نەجوڵێن!" ئەمجار شێرەکانی نارد بۆ گیانی دوژمن و هەرزوو تێکوپێکیان شکاندن. قورەیش ئەوەندە خراپ شکستی هێنابوو، ئەوەندەیان زانی خۆیان لە خێوەتی ژنەکانیاندا بینییەوە. لەو سەروبەندەشدا ئەبودوجانە توانی بگاتە ناوجەرگەی سوپای دوژمن. هێندی ژنی ئەبوسوفیان لەوێ بوو، گوایە شوێنێکی پارێزراوە، ئەبودوجانە هەڵمەتێکی بۆ برد و شمشێرەکەی بۆ داهێنایەوە، بەڵام کە بینی ئافرەتە، وتی "ڕێزم لە شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا گرت و ئافرەتم پێ نەکوشت."[1]

هاوەڵە بەڕێزەکان بەسەرکەوتوویی ئەو ئەرکانەیان بەجێگەیاند کە پێیان سپێررابوو. سورەتی "آل عمران" باسی ئەو خەبات و تێکۆشانەیان دەکات و ئەو داستانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە تۆماریان کردووە. بە خستنە بەرچاوی نموونەی پێغەمبەرانی پێشین (عَلَيْهِمُ السَّلَام) و وێناکردنی ئەو قارەمانانەی لەگەڵیاندا بوون، چەندین ئاماژەی ستایشئامێز بۆ یارانی ئازیزمان دەکات و دەفەرمووێت:

﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسْتَكَانُواْ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾

(آل عمران: ١٤٦-١٤٧)

---

١. البزار، المسند ٣/١٩٣-١٩٤.

"چەندەها پێغەمبەر هەبوون کە خواناس و پیاوچاکانی زۆر لەگەڵیدا بوون و دژ بە دوژمنان جەنگاون. جا ئەوانە هیچ کات سستی و بێزاری ڕووی تێ نەکردوون بەهۆی ئەوەی کە تووشیان هاتووە لەپێناو ڕێبازی خوادا. لاواز و بێهێز و سەرشۆڕیش نەبوون بۆ دوژمنان. خوای گەورەش ئەو ئارامگر و خۆڕاگرانەی خۆشدەوێت. ئەوکاتە گوفتاریان تەنها ئەمە بووە کە وتوویانە: پەروەردگارا لە گوناهـ و هەڵەکانمان ببورە و لە زیادەڕەویی کاروبارمان خۆش ببە، دامەزراومان بکە، سەرمان بخە بەسەر ئەم گەلە بێباوەڕەدا. ئەوسا ئیتر خوا پاداشتی دنیای پێبەخشین (بەسەرکەوتن و پایەداریی) پاداشتی چاکی قیامەتیشی بۆ مسۆگەر کردن و خوا ئەو چاکەکارانەی خۆش دەوێت."

ئایەتەکە باسی گرۆی ڕەببانییان دەکات. بەڵام ئەگەر لە سۆنگەی دووبارەبوونەوەی مێژووەوە بۆی بڕوانین، ئەوا ئاماژە بۆ ئەوانە دەکات کە لە ئوحوددا جەنگان. ئاشکراشە ئایەتەکان بەبۆنەی جەنگی ئوحودەوە دابەزیون.

## ج. قۆناغەکانی ئوحود

لە غەزای ئوحوددا سێ تابلۆ بەرچاو دەکەوێت:

تابلۆی یەکەم:

ئەو تابلۆیەیە کە سەرکەوتوویی بڕیارە کتوپڕەکانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) نیشان دەدات. ڕاستە هەندێك لە هاوەڵان لەو قۆناغەدا شەهید بوون، بەڵام پاڵەوانەکانی وەك حەزرەتی حەمزە و ئەبودوجانە و عەبدوڵای کوڕی جەحش، درۆزنەی بتپەرستانیان کردبوو. سەرکەوتنێکی ئاشکراش بەدەستهاتبوو و بت

پەرستانیش تێکشکابوون. تەنانەت ئافرەتانی قورەیش هەوڵیان دەدا بەر بە هەڵهاتنی پیاوەکان بگرن، باوەشیان دەکرد بە قاچیاندا و دەیانقیژاند و لێیان دەپاڕانەوە ڕانەکەن، چونکە ڕاکردن شوورەییە بۆیان. بەڵام ئەو هاتوهاوارە بەس نەبوو بۆ ڕاگرتنی شاڵاوی پاشەکشێی جەنگاوەرانی مەککە.

سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی مێژوو باس لەوە دەکەن کە ژمارەی موسڵمانان لە ئوحوددا پاش کشانەوەی دووڕووەکان، حەوت سەد جەنگاوەر بووە. کەچی سوپای دوژمن نزیکەی سێ هەزار جەنگاوەر بووە، واتە ئەوان پێنج ئەوەندەی موسڵمانان دەبوون. بەوپێیە دەبوو هەر موسڵمانێك لەگەڵ پێنج کەسدا بەشەڕ بێت. ئەمە سەرباری ئەوەی قورەیش ژن و منداڵیشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، دەفیان بۆ لێدەدان و وورەی جەنگاوەرانیان بەرز دەکردەوە. ئامادەباشی و ئازوقەی سوپای دوژمن تێر و تەواو بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەوێنەی بەدر شکستیان هێنا. تا ئەوساتەوەختەدا هەڵەیەکی گەورە ڕوویدا، ئەویش گوێڕایەڵی نەکردنی فەرمان بوو، کە ئێمە بە "زەللە"، واتە پێ هەڵخلیسکان یاخود سەرسمدان ناوی دەبەین. ئاخر ئەوان لە دۆستان و نزیکانی خوا بوون و لە پێگەیەکدا بوون وەك ئەوەی بیبینن ئاوەها باوەڕیان پێی بوو.

ئێمەومانان مرۆڤی بازنەی ئیسلام و ئیمانین. باوەڕمان هێناوە و ئیسلاممان کردووەتە بەرنامەی ژیانمان، لەوەش بترازێت زۆر دەرکی ڕەهەندەکانی دیکە ناکەین. هەرچی ئەوانە، بە چەشنێك پەرستشیان ئەنجام دەدا هەروەك ئەوەی ئەو زاتە ببینن. بینینی ئەوان جیاواز بوو لە بینینی ئێمە. بۆیە بەلەبەرچاوگرتنی پایە و نزیکییان، لەوانەبوو بەرپرسیار بن لەو خەیاڵ و ختوورانەش کە بە دڵ و مێشکیاندا دەهات.

بەڵێ. تەنانەت ئوحودیش بە سەرکەوتن هەژمار دەکرێت بۆ موسڵمانان. گەرنا وەك هەندێك لە مێژوونووسان دەڵێن ئوحود بە شکست دانانرێت. وشەی "شکست" بە وشەیەکی قورس و بریندارکەر دەزانم، وام پێ باشە لەو بارەیەوە بڵێم: ئەوەی لە ئوحوددا ڕوویدا لەرزەیەکی کاتی بوو.

تابلۆی دووەم:

دوژمن دووچاری شکست بوو، بە هەڕەمەکی و پەلەپڕوزە هەڵدەهاتن. موسڵمانانیش جەنگی بەدریان بیرهاتەوە، ئەو ڕۆژەش دوژمن هەر بەوشێوەیەی ئەمڕۆ هەڵدەهاتن. لەبەرئەوە پێیان وابوو ئەم جەنگەش وەك بەدر لە بەرژەوندیی خۆیان شکاوەتەوە. بۆیە نۆرەی کۆکردنەوەی دەستکەوتەکان هاتبوو. پاش هەڵهاتنی دوژمن و بەجێهێشتنی سامانەکانیان. ئەسپ و وشترەکانیان چاوەڕێی موسڵمانان بوون. بۆیە تیرهاوێژەکانیش لە کۆکردنەوەی دەستکەوتەکاندا بەشدارییان کرد. هەرچەند عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر فەرمانەکەی پێغەمبەری وەبیر دەهێنانەوە، کەچی ئەوان بەوردی لە فەرمانەکە نەگەیشتبوون. چونکە ئەوان ئاوەها لێکیان دابووەوە کە "تا کۆتایی جەنگ لە جێگەی خۆتاندا بمێننەوە!" دەی ئەوەبوو بە بەرچاوی هەمووانەوە جەنگ تەواو بووبوو و دوژمن تێکشکابوو، لە دیدی ئەواندا مەحاڵ بوو سوپایەکی شکاو هەڵبسێت بە کۆکردنەوەی ڕیزەکانی و دووبارە هەڵمەت بهێنێتەوە. ئەوەش تابلۆی دووەمی جەنگی ئوحود بوو!

تابلۆی سێیەم:

تیرهاوێژەکان بە جێهێشتنی جێگەکانیان بوون بەهۆی دروستبوونی کەلێن لە سەنگەری موسڵمانانندا. بێگومان هەڵێکی لەوجۆرەش هەرگیز لەکیسی سەرکردەیەکی بلیمەتی وەك خالیدی کوڕی وەلید نەدەچوو، ڕۆژ ڕۆژی خۆی بوو...

لەوکاتەدا موسڵمانان شمشێریان خستبووە کێلانەوە، سەرگەرمی کۆکردنەوەی دەستکەوت بوون، کۆمەڵێکیشیان کشابوونەوە تاکو کەمێك پشوو بدەن. خالید وەك بروسکە هەڵگەڕایەوە و هەڵۆناسا دای بەسەریاندا. چەند کەسێکی لەو تیرهاوێژانە شەهیدکرد کە لە جێگەی خۆیان مابوونەوە. بە سوپاکەیەوە لە پشتەوە دەوری موسڵمانانی دا و ئەناکاو دای بەسەریاندا. موسڵمانانیش تەواو لە هەڕەتی جەنگ سارد بووبوونەوە، خالید سوودی لەو حاڵە وەرگرت و نیشی خۆی کرد...

لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ خاڵێکی تر بکەین، ئەویش ئەوەیە: کاتێك موسڵمانان ڕۆیشتن بەرەو ئوحود، درزێکیان تێدابوو. پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیویست لە ناو مەدینەدا بمێنێتەوە، کەچی ئەوان سووربوون لەسەر چوونە دەرەوە، ئەوەش سەبارەت بە ئەوان بریتی بوو لە چوونە ناو بازنەیەکی ئەزۆك و بەتاڵەوە. وا ئێستا ئەو بازنەی بەتاڵە بازنەیەکی بەتاڵی تری لێوە پەیدابوو. پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) فەرمانی پێکردبوون پابەندی جێگەکانیان بن و بەجێی نەهێڵن، بەڵام ئەوان نافەرمانییان کردبوو و سەنگەرەکانیان چۆڵکردبوو. ئەوەش پێ هەڵخلیسکانێکی تر بوو. قورئانی پیرۆزیش تیشك دەخاتە سەر ئەو بابەتە و دەفەرموێت:

﴿إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا۟﴾

(آل عمران: ١٥٥)

"ئەوانە تەنها شەیتان تووشی هەڵەی کردن، لە خشتەی بردن بەهۆی هەندێك گوناهەوە کە ئەنجامیان دابوو."

واتە لە سەرەتادا پێیان وترا لە مەدینە بمێننەوە، بەڵام ئەوان پێداگرییان کرد لەسەر چوونە دەرەوە. هەروەها بە تیرهاوێژەکانیش وترا لە جێگەی خۆیان بمێننەوە، کەچی دیسانەوە ئەوانیش لە پێناو کۆکردنەوەی دەستکەوت، یاخود تا یارمەتی ئەوانیتر بدەن لە کۆکردنەوەی دەستکەوتدا، شوێنەکانیان جێهێشت. گوێڕایەڵی نەکردنیان بۆ یەکەمین ئامۆژگاری، موسڵمانانی خستە ناو بازنەیەکی بەتاڵەوە، کە بووە هۆی ڕوودانی هەڵەی دووەم. خۆ ئەگەر خوا بە ڕەحمی خۆی ڕێی نەگرتایە لە بەردەوامبوونی بازنە بەتاڵەکان، ئەوسا هەڵەکان یەك بەدوای یەکدا ڕیزیان دەبەست. بەڵام ئەوەی پیشاندان کە بەزەییەکەی پێش تووڕەییەکەی کەوتووە، بۆیە میهر و بەزەیی خۆی بەسەردا باراندن.

لەلایەکی ترەوە، ئەوان کەوتنە کۆکردنەوەی دەستکەوت، چونکە وایان دەزانی شەڕ و پێکدادان کۆتایی هاتووە. هەرچەندە ئەوە بە کارێکی ئاسایی دادەنرێت بۆ ئەوانەی بەشداریی جەنگیان کردووە و سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە، بەڵام سەبارەت بە موقەررەبین تەنانەت ئەوەش بە هەڵخلیسکان هەژمار دەکرا. ئەمە لەکاتێکدا کە پێشتر پەروەدگار بەهۆی دەستکەوتەکانی بەدرەوە بەندە خۆشەویستەکەی خۆی ئاگادارکردبووەوە.[١] تەنانەت پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و حەزرەتی ئەبوبەکریش بەو ئاگادارکردنەوە خواییە کەوتنە گریان. کاتێك حەزرەتی عومەریش ئەوانی بەو حاڵەوە بینی، بەهەمان شێوە فرمێسك لەچاوانی هاتە

١. سورەتی الأنفال، ئایەتی ٦٧-٦٨.

خوارەوە ئەوان ئارەزوومەندی دنیا نەبوون و بۆشیان نەبوو ئارەزوومەند ببن.. بگرە دەبووایە وەلایان بنایە. دەستخستنی دەستکەوت بۆ کەسانی وەك ئێمە ئەمومژی تێدا نییە، بەڵام ئەگەر نزیکانی خوا (موقەررەبین) هەڵسن بە کۆکردنەوەی دەستکەوت لەو مەیدانەدا کە بە خوێنی شەهیدان سوور بووە، ئەوا لە داهاتوودا دەبێتە هۆی هەستکردنیان بە پەشیمانییەکی گەورە، بەڵام خواوەندی میهرەبان لەڕێی ئەمێکردنی پێشوەختەوە لەو دەرەنجامە پاراستنی. بەڵام کەلێنێکی تر دروست بووبوو. ئەویش ئەو ڕاستییە بوو کە بەڵا و تاقیکردنەوەکان ئەوەندە بە سەختی دەهاتن، ئەوانەی پێش خۆیان بیر دەبردەوە. بەڵایەکی تر کە لە هەموو بەڵاکانی پێش خۆی گەورەتر بوو و بەس بوو بۆ لەبیربردنەوەی هەموو بەڵا و ناخۆشییەکانی پێشوو، بریتی بوو لە گەمارۆدانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەلایەن بتپەرستانەوە و بڵاوبوونەوەی دەنگۆی شەهیدبوونی. ئەو هەواڵە وەك بروسکەیەك لێی دان و هەموو موسیبەتەکانی تریان لەبیرچووەوە. بەڵام خوای گەورە سەلامەتی کرد و بەدەوریدا دیوارێکی پتەوی لە گۆشت و ئێسقانی ئەو موسڵمانانە بۆ تەنی کە پێش گەیشتنی دوژمنان دەنگیان بیستبوو. دەبێت چەند ئافرەتی بەجەرگ کە گۆزە ئاو یان دەرمانی بریندارانیان بە دەستەوە بووبێت، بەپەلە ڕایان کردبێت بۆ فریاکەوتنی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)! بەدڵنیاییەوە ئوم عەممارە، ئەو ئافرەتەی کە مێژوو بە ڕێز و شکۆمەندییەوە یادی دەکاتەوە، لە ڕیزی پێشەوەی ئەو ئافرەتانەدا بوو. مێردەکەی و کوڕەکانی ڕەوانەی مەیدان کردبوو و خۆیشی ئاوی دەدا بە جەنگاوەران و بریندارانی تیمار دەکرد.

ئەو دیمەنەی ئوم عەممارە بینی خوێنی لە دەمارەکاندا دەمەیاند؛ ئەو شوورایەی کە هاوەڵان بە جەستە و گیانی خۆیان بەدەوری پێغەمبەردا دروستیان

کردبوو، ورده ورده هەرەسی دەهێنا و دەستە ناپاکەکان هەنگاو بە هەنگاو لەو نازداره نزیك دەبوونەوە. هەتاکو ئەو قەڵایەشیان پارچە پارچە نەکردایە مەحاڵ بوو دەستیان بگاتە تاڵێکی ئەو سەروەرە. هەرچی شمشێری کیناوی بوو بۆ ئەو مەبەستە دەوەشێنرا. هەرچی تیر و ڕم بوو بە ئاراستەی ئەو دەهاوێژرا. بەڵام هەموویان دەچەقینە لاشەی یەکێك لەو باوەڕدارانەی خۆیان کردبووە قەڵغان بەدەوریدا.

ساتێك هات کە هەرچی باڵ هەبوو پەڕی بوو، هەرچی سەر هەبوو بڕا بوو، کۆمەڵێك لە بتپەرستە داخ لە دڵەکان تا دەهات پێشڕەوییان دەکرد، ئەویش فەرمووی "کێ ئەمانەم لێ دوور دەخاتەوە؟" نوسەیبە بەپەلە چوو بە هانایەوە و وتی "من ئەی پێغەمبەری خوا!" نوسەیبە وەك چیایەکی گەردنکەش لەبەردەم پێغەمبەردا وەستابوو و بە ڕاست و چەپدا بە شمشێرەکەی بەرگری لێ دەکرد. لەڕاستیدا ئەو بۆ تیماری بریندارانی هاتبوو، بەڵام کە تەنگیان پێهەڵچنرا، بوو بە جەنگاوەرێکی چاونەترس. لەو سەروبەندەدا بینی کوڕەکەی بە تیغی شمشێر باڵی پەڕێنراوە، دەستبەجێ ڕۆشت بۆلای و برینەکەی بەست و پێی وت "بڕۆ لەبەردەم پێغەمبەردا بجەنگە!" خۆیشی گەڕایەوە بۆ جێگەکەی و کەوتەوە بەرەنگاری. هێندە لە پێغەمبەری خواوە نزیك بووبووەوە، وەختە بڵێین گوێی لە چپەکانی بوو. ئەوەبوو لە گەرمەی بەرگریدا پێکرا و زامێکی قووڵ کەوتە پشتییەوە کە جێگەی مستێکی تێدا دەبووەوە.

دوای ئەوەی کوڕەکەی نارد بۆ بەرگری، سەروەرمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ڕووی تێکرد و فەرمووی "مَنْ يُطِيقُ مَا تُطِيقِين (جا کێ بەرگەی ئەوە دەگرێت کە تۆ بەرگەی دەگریت!)" نوسەیبە کە گوێی لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر بوو، وتی "أُدْعُ اللّٰه أَنْ يَجْعَلَنِي مَعَكَ يَا رَسُولَ اللّٰه (ئەی پێغەمبەری

خوا، دوعا بکە تا لەگەڵتدا بم!)" پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەستەکانی بڵند کردەوە و نزای بۆ ئەم ئافرەتە کرد کە خوێن لە دەست و قاچ و پشتی دەچۆڕا و، داوای لە خوا کرد کە لە بەهەشتدا لەگەڵیدا بێت.[1] کە خانمی شەرەفمەند گوێی لە نزاکەی پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بوو، وتی "دەتوانم لەبەردەستتدا هەتا قیامەت بجەنگم."

ژیان و بەسەرهاتی ئەو خانمە هاوەڵە زنجیرەیەك هەڵوێستی دلێرانەی بەیەکەوەبەستراو بوو. هەموو هەنگاو و هەڵوێستەکانی مایەی فەخر و شانازی بوون. لە عەقەبەدا بەیعەتی بە پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) دا و بانگی کرد بۆ مەدینە.. بووە هۆکاری موسڵمانبوونی سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەی.. لە ئوحوددا لە نزیك پێغەمبەرەوە جەنگی کرد و وەك پاڵەوانێك ڕووبەڕووی مەرگ بووەوە. کاتێکیش ئایەتی باڵاپۆشی دابەزی، دڵی تەنگبوو. چونکە پێی وابوو ئیدی پاش ئەوە ناتوانێت بەشداری لە جیهادی کرداریدا بکات. بەڵام کە پێغەمبەرە درۆینەکان دەرکەوتن، لە جەنگی یەمامەدا بەشداری کرد و لەوێ دەستێکی و کوڕەکەی بەجێهێشت و گەڕایەوە. بەڵێ، نوسەیبە ئەو ئافرەتە بێوێنەیەیە کە دەتوانین چەندین تابلۆی سەروەری تری لە ژیانیدا بەدی بکەین.[2]

یەکێکی تر لە گیان لەسەردەستەکانی ئوحود ئەنەسی کوڕی نەضرە، کە مامی ئەنەسی کوڕی مالیکە (رضيَ اللهُ عَنْهما). لە ئوحوددا بەدەم شمشێر وەشاندنەوە هاواری دەکرد لەو موسڵمانانەی کە وایان دەزانی پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) کوژراوە، بە دەنگی بەرز دەیوت "لەپاش ئەو ئیدی ژیانتان بۆچییە؟ هەستن گیانی خۆتان

---

١. ابن هشام، السيرة النبوية ٣١/٤-٣٢؛ ابن حجر، الإصابة ١٤٠/٨، ٢٦٦.

٢. ابن حجر، الإصابة ١٤٠/٨، ٢٦٦.

ئەو ڕێیەدا بەخت بکەن کە ئەو لە پێناویدا گیانی بەخشیوە!"[1] هەموو هاتن بەدەم بانگەوازەکەیەوە و کۆبوونەوە. هێرشی دوژمنان بەرپەرچدرایەوە، لەرزینەکە کۆتایی هات، پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی دەرکرد بۆ ئەو هاوەڵانەی کە لە فەرمانەکانی پێشتری نەگەیشتبوون، شوێن ستراتیژی نوێ بکەون. لێرەدا پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) فەرمانی دا بەدوای سەعدی کوڕی ڕەبیعدا بگەڕێن. پیاوێکی ئەنصاری ڕۆیشت و بە برینداری دۆزییەوە. بەزەحمەت هەناسەی بۆ دەدرا، لێی پرسی "حاڵت چۆنە؟" وتی "سەلامم بگەیەنە بە پێغەمبەر، لەودیو ئوحودەوە هەست بە بۆنی بەهەشت دەکەم، سەلامم بگەیەنە بە هۆزەکەم و پێیان بڵێ سەعدی کوڕی ڕەبیع پێتان دەڵێت ئەگەر هەتا یەکێکیان مابێت و دەستی دوژمن بگاتە پێغەمبەر (عَلَيْهِ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ)، ئەوا لای خوا هیچ بیانوو و پاساوێکتان نییە."[2] هاوەڵەکە لەتەنیشتیدا مایەوە تاکو گیانی سپارد. ئەوجا هات بۆ لای پێغەمبەر و وتەکانی سەعدی بۆ گێڕایەوە.

لەم نێوەندەشدا ئەوانەی داوای بەدەستهێنانی شەرەفی شەهادەتیان کردبوو، خوا نزاکانی قبووڵکردن. ئەنەسی کوڕی نەضر و عەبدوڵڵای کوڕی جەحش و حەمزەی کوڕی عەبدولموتەللیب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ) دوعاکانیان گیرابوو.. گیرابوو و فڕین بەرەو ئاسمانی شەهیدان. ئەوانەشی مابوونەوە لە ناو گۆمی خوێندا نوقوم بووبوون. ئوحود بە فرمێسکی خوێنینەوە دەگریا، گریانێك جیاواز لە گریانی تر. گریانێك وا دەزانرا پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) شەهیدکراوە. لەئەنجامی ئەو دەنگۆیەوە دڵەکان بە پەژارە و داخەوە دەکوڵان و ڕۆحی مەعنەوییان لەرزەی پێکەوتبوو. هەندێکیان بیریان لەوە دەکردەوە بڕۆنەوە بۆ

---

١. ابن هشام، السيرة النبوية ٣٢/٤؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٣٤/٤.

٢. ابن هشام، السيرة النبوية ٤٤/٤؛ الحاكم، المستدرك ٢٢١/٣-٢٢٢.

مەدینە و جەنگاوەری تر ئامادە بکەن و بیانهێنن. هەندێکیشیان بۆچوون و نەخشەی تریان هەبوو. لە ساتەوەختێکدا کە هەموویان لەوپەڕی شپرزەییدا بوون، کتوپڕ گوێیان لە دەنگی کەعبی کوڕی مالیك بوو هاواری دەکرد "یَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينْ! أَبْشِرُوا هذا رَسُولُ اللّه. (هۆ گرۆی موسڵمانان، مژدەتان لێبێت ئەوە پێغەمبەری خوایە!)"[1]

ئەو هاوارە لە ڕۆژی ئوحوددا وەك هاواری زیندووبوونەوەی پاش مردن وەها بوو. موسڵمانان بەجارێك بەدەم بانگەوازەکەوە چوون و سەرلەنوێ لەدەوری ئازیزدا کۆبوونەوە. هەندێکیان وەك پەروانە بەدەوریدا دەهاتن و دەچوون و بە جەستەیان دەیانپاراست، هەندێکیان سەرقاڵی دەرهێنانی هەردوو پارچەی کڵاوە ئاسنینەکەی بوون کە بە ڕوخساری پیرۆزیدا چەقیبوو. هەندێکی تریشیان بانگەوازیان دەکرد موسڵمانان ڕووبکەنە ئەو شوێنە. هەموویان هەوڵیان دەدا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) وەك چاوی خۆیان بپارێزن. ئامادەبوون ژیانیان بکەنە قوربانی ددانێکی سەروەر. کەواتە جارێکی تر کۆبوونەوە بەدەوریدا، سوێندیان خوارد کە ئیتر هەرگیز بەجێی نەهێڵن.

مایەی شانازیی مرۆڤایەتی، سەرکردەی هەرەمەزن جارێکی تر جڵەوی کارەکانی گرتەوە دەست. تاکو ستراتیژێکی نوێ پیادە بکات و دەست بەسەر بارودۆخەکەدا بگرێتەوە. بە ئەسپایی کشایەوە پشت چیاکە. مەبەست لەم هەنگاوەش، دانانی پلانێکی نوێ و دووبارە ڕێکخستنەوەی ڕیزەکان بوو. واتە دەستی کرد بە نەخشەکێشان بۆ ئەو قۆناغە، یان بڵێین بۆ تابلۆی سێیەم، کە بە سەرکەوتن کۆتایی پێ دەهات.[2]

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٣٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/٣٥.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٣٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/٣٥.

## د. لە شکستەوە بۆ سەرکەوتن

ئەم تابلۆی سێیەمە سەرکەوتنێکی ئاشکرا بوو. سەرکەوتن بوو، چونکە دوژمن تۆقی و کشایە دواوە. موسڵمانانیش کەوتنە دوایان و ڕاویان نان. ئەبوسوفیان نیازی وا بوو هێرشێکی تر ڕێك بخاتەوە و ئەمجارەیان بدات بەسەر مەدینەدا. بەڵام صەفوانی کوڕی ئومەییە پێی وت "ئەی ئەبوسوفیان با بگەڕێینەوە، چونکە مەحاڵە دەستمان بگات بە محەممەد هەتا هەموو ئەوانەی دەوری لەناو نەبەین. ئێستا سەرکەوتنێکمان بەدەستهێناوە، با نەیگۆڕین بە شکست!" ئەم قسانە وای لە ئەبوسوفیان کرد پاشگەز ببێتەوە لە هێرشێك کە ئەنجامێکی لێڵ و گوماناوی هەبوو. لەڕاستیدا ئەویش هەمان ڕای هەبوو، بۆیە بەرەو مەککە ملی ڕێگەیان گرتەوە بەر.[1]

لەپاش نزیکبوونەوە لە چارەنووسێکی نەخوازراو، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەرکەوتنێکی ئاشکرای تۆمارکرد. هەروەك بەوەش قەدەر بیەوێت وانەیەکی وا بە هاوەڵان بڵێتەوە کە: خوای باڵادەست تەنها بە فەزڵ و بەخشندەیی و چاودێری خۆی سەرکەوتنی کردە خەڵاتی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی. شمشێرەکانی ئێوەش تەنها هۆکاری ڕوواڵەتی بوون. ئەگینا هەر خوا خۆیەتی کە پێغەمبەرەکەی لە سەرکەوتنێکەوە بۆ سەرکەوتنێکی تر دەبات.

ئەوە ئەو سەرکەوتنانە بوون کە لە سەرەتا و کۆتایی ئوحوددا بەدەستهاتن. لەو نێوەندەشدا شکستێکی کاتی هاتە ئاراوە تاوەکو بزانرێت خاوەنی ڕاستەقینەی سەرکەوتنەکان پێغەمبەری سەروەرە (صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). ئەوەتا پەروەردگار تەنانەت لە سەختترین ساتەکانیشدا دەستبەرداری پێغەمبەرەکەی

---

١. ابن هشام، السيرة النبوية ٤/٥٤-٥٥؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٤/٥١.

نابێت، ئەو سەرکەوتنەشی پێبەخشی کە پەیمانی پێدابوو. ئەم ئایەتە پیرۆزەش تیشك دەخاتە سەر ئەو تابلۆیە:

﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾

(آل عمران: ١٥٢-١٥٣)

"سوێند بێت، خوا بەڵێنی خۆی بۆ ئێوە بەڕاستی بردە سەر، هەر بە مۆڵەت و یارمەتیی ئەو، (دوژمنتان) بەگیرهێنا و تێکتان شکاندن. هەتا ئەوکاتەی ساردبی ڕوویتێکردن و بوو بە کێشەتان لەسەر هەندێك شت و، (لە فەرمانی پێغەمبەر بە چۆڵکردنی سەنگەرەکانتان) یاخیبوون دوای ئەوەی هەندێك شتی نیشاندان کە حەزتان لێ دەکرد. هەتانە دنیای دەوێت و هەشتانە قیامەت. لەوەودوا دەستی ئێوەی کۆتاکرد (لە دوژمنان) تا تاقیتان بکاتەوە. سوێند بێت، بەڕاستی خوا چاوپۆشی لێکردن و لێتان خۆشبوو، خوا فەزڵ و ڕێزی هەیە بۆ ئیمانداران. ئێت، ئەوەبوو کە (بەگیرهاتن و کشانەوە و شپرزە و پەرتوبلاو بوون) خۆتان هەڵدەگیر بە کێوی ئوحود و دەوروبەریدا و ئاوڕتان لە کەس نەدەدایەوە، لەکاتێکدا لەلاکەی ترەوە پێغەمبەریش بەدواتاندا بانگی دەکردن: (ئەی بەندەکانی خوا بگەڕێنەوە و ڕامەکەن). جا ئەوەبوو ئێوە خەم و خەفەتتان کردە دڵی پێغەمبەرەوە، (بە نافەرمانیتان خوای گەورەش) خەم و پەژارەی کردە دڵی ئێوەوە (بە دەنگوباسی بریندار بوونی پێغەمبەر و شەهیدبوونی) تاوەکو خەفەت نەخۆن بۆئەوەی لەدەستان

چووه و ئەوەش کە خوا تووشی کردن و بەسەری هێنان. خوا ئاگادارە لەو کار و کردەوانەی ئەنجامی دەدەن."

لەنێوان ئێوە و خواوەندا بەڵێن و پەیمان هەیە. خوا دەفەرمووێت:

﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴾

(البقرة: ٤٠)

"بەوەفا و بەئەمەك بن و پەیمانەکەم جێبەجێ بکەن. ئەوسا منیش پەیمانی خۆم بەجێ دەهێنم."

ئەو بەڵێنە هەرگیز لەلایەن پەروەردگارەوە هەڵنەوەشێتەوە، بەڵام ئەگەر ئێوە نەیبەنە سەر، ئەوا خواش هەر بەو شێوەیە دەکات. ئەوەتا دەڵێت: خوای مەزن لە ئوحوددا پەیمانی خۆی بردە سەر. چونکە ئێوە بە ویست و مۆڵەتی ئەو دەجەنگان. بەڵام لەبەرئەوەی سەرپێچیتان کرد و کۆدەنگ نەبوون سەبارەت بە فەرمانەکەی پێغەمبەر، بۆیە ڕووخان و شکست بەشتان بوون. لەبری ئەوەی کەمێك ئۆقرە بگرن و ئەو دەستکەوتانەی کە دەبوو دواتر بۆی بهاتنایە. پێنج خولەك زووتر بۆی هاتن و چاوەڕێی فەرمانتان نەکرد. بەڵێ، سەروەری پێغەمبەران (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەناو خێوەتەکەیدا چاوەڕێی کاتی گونجاو بوو تاکو ئەو فەرمانە دەربکات. بەڵام ئێوە پەلەتان کرد و بەو هۆیەوە دووبەرەکی کەوتە نێوانتانەوە.

کاتێك بەرەکان پشێوییان تێ دەکەوێت و سەنگەرەکان چۆڵ دەکرێن، دووبەرەکی و پشێوی سەرهەڵدەدات. چونکە هەر بڕیارێکی نوێ چەندەها بۆچوونی جیاوازی لێ دەکەوێتەوە. هەر خاوەن بۆچوونێکیش ڕێگەیەکی

تایبەت بە خۆی دەگرتە بەر، بەوەش یەکبوون و یەکڕیزی هەرەس دەهێنێت. کاتێکیش خوا ئەوەی نیشاندان کە نیشانی دان. ئیتر ئەوسا بێداربوونەوە. ئەوەش شایستەی ئێوە نییە، چونکە ئێوە لە نزیکانن. لەوانەیە ئەوە بۆ خەڵکی تر دروست بێت. بەڵام بۆ ئێوە دروست نییە کە وەك خەرمانەی مانگ دەوری پەیامی پێغەمبەرایەتیتان داوە و ڕاستەوخۆ وانەکانتان لەوەوە وەردەگرن. خۆ پێشتر ئێوە بەشێوەیەك بوون سەرتاپا ڕەزامەندیی پەروەردگارتان بەدەستهێنابوو. کەچی کاتێك هەندێك شتتان بینی کە حەزتان لێبوو -شەکی سەر بە دنیا بوون و بایەخێکی ئەوتۆیان نەبوو- خوا لە دەستی سەندنەوە و بێبەشی کردن. چونکە ئەگەر تەنها بەتەنگ ئامانجی قیامەتەوە بوونایە، ئەوا دنیایش ڕووی تێ دەکردن.

بەڵام بەجۆرێك لە جۆرەکان ئێوە بوونە داخوازی دنیا. ئەمە لەکاتێکدا دەبوو تەنها قیامەتتان بکردایە بە تەوەر و چەقی تێکۆشانتان. سروشتیی ئەمە، دونیاش بەرپاکردن دەهات بەشوێنیاندا. بەڵام لە بیرتان نەچێت، سوێند بێت کە خوا ئێوەی بەخشی و لێتان خۆشبوو.

کەواتە پاش ئەو هەژانە سەختە، پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) توانی ئەوە بەدەست بهێنێت کە بە سەرکەوتنی بزانین. ئەوەتا هەرکە ترسی خستە دڵیانەوە، یەکسەر ئەبوسوفیان و جەنگاوەرەکانی بەپەلە ڕوویان کردەوە مەککە، پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) گەڕایەوە بۆ مەدینە.

## ٣. بەرەو حەمرائولئەسەد

نوعەیمی کوڕی مەسعود کە هێشتا موسڵمان نەبووبوو و ڕووناکیی خۆری درەخشانی هیدایەتی بەسەردا هەڵنەهاتبوو، بە "شەیتان" ناوبانگی دەرکردبوو. نوعەیم خاوەن توانا و ژیرییەکی دەراسا بوو. لە نوحودیشدا ئەم شەیتانییەی بەوپەڕی خەستوخۆڵی بەکارهێنا. ئەوەبوو هات بۆلای پێغەمبەر (عَلَيهِالصَّلاةُوَالسَّلام) و وتی "ئەبوسوفیان سەرلەنوێ هێزی خۆی جەمکردووەتەوە و دێتەوە سەرتان، بێهودە مەجەنگن. خۆتان بەدەستەوە بدەن!"[1]

پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيهِ) تازە دەگەیشتەوە مەدینە و هێشتا سەرەی تیمارکردنی بریندارەکان نەهاتبوو، کەچی هەواڵی ئەوەی پێ دەگات کە ئەبوسوفیان بە سوپاکەیەوە گەڕاوەتەوە و بەنیازە دووبارە هێرش بکاتەوە. هەرچەندە زۆرێکیان چاوەڕێی مردنیان لێدەکرا. چونکە لەناویاندا کەسانێک هەبوون برینەکەیان ئەوەندە سەخت بوو توانای هەستانەوە و ڕۆیشتنیان نەبوو. کەچی سەرباری ئەوەش هەموویان ڕاپەڕین و بەرەو حەمرائولئەسەد (حَمْراء الأَسَد) کەوتنە ڕێ. ئەوە هەنگاوێکی هەڕەشەئامێز بوو لەلایەن پێغەمبەرەوە دژی بتپەرستانی مەککە تاکو بیانترسێنێت و جموجوڵیان ئیفلیج بکات. لە مەدینە جاڕی دا کە "تەنها ئەوانەی دوێنێ لەگەڵمان بوون با سبەینێ لە فلان جێگەدا کۆببنەوە. دەڕۆین بەدوای سوپاکەی قوڕەیشدا!"[2]

دوابەدوای ئەو بانگەوازە، بریندارەکان تەنانەت ئەوانەش کە بە سەختی بریندار بووبوون و چاوەڕوانی چارەسەر و تیماریان دەکرد، وەک ئەوەی مردوو لە

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٥٤؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/٥٠.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٥٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/٤٨-٤٩.

گۆڕ بێتە دەرەوە. ئاوەها هەڵسان و لە جێگەی دیاریکراودا کۆبوونەوە. بەڵێ، دەنگی ژیانبەخشی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مردووی گۆڕستانی دەژیاندەوە، وەك ئەوەی ئەم دێڕە شیعرەی ئیمام بوصەیری بسەلمێنن كە دەڵێت:

لَوْ نَاسَبَتْ قَدْرَهُ آيَاتُهُ عِظَماً          أَحْيَا اسْمُهُ حِينَ يُدْعَى دَارِسَ الرِّمَمِ..

"ئەگەر موعجیزە و كارە دەراساكانی حەزرەتی موستەفا هاوشانی گەورەییەكەی بوونایە، ئەوا كاتێك ناوی پیرۆزی دەبرا، ئێسك و پروسكی ناو گۆڕەكان زیندوو دەبوونەوە."

ئیتر لە هەموو جێگەیەكدا یادی شیرین و پڕ سۆزی پێغەمبەری ئازیز (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) دەهاتە بەرگوێ. لە هەر چوارلاوە سەدا و هاواری پڕ جۆش و خرۆش دەزرنگایەوە، وەك بڵێیت ئیسرافیل فووی كردبێت بە "صور"دا و هەمووان لە گۆڕەكانیان هاتبنە دەرەوە ئاوا ڕایان دەكرد.

مێژوو باسی ئەوە ناكات لەناو بریندار و دەست و قاچ براوەكاندا كەسێك هەبێت نەچووبێت بەدەم بانگەوازەكەوە. تیایاندا بوو قۆڵی قرتابوو، هەبوو لاقەكانی بەدوای خۆیدا دەخشاند و دەهات، بەڵام كەسێك نەبوو دابنیشێت و نەیەت. عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف دەفەرمووێت "كەسی وای تێدابوو نەیدەتوانی بە ڕێگەدا بڕوات، بەكۆڵ هەڵمان دەگرت. هەشبوو نەیدەتوانی شمشێر بگرێت بەدەستەوە. ئەم سوپایە ڕۆیشت و بە ئامانجی خۆشی گەیشت."[١]

ئەم هەواڵە گەیشتەوە قورەیشییەكان، لەرزیان لێنیشت، ئەبوسوفیان كاتی بەفیڕۆ نەدا و هەڵهاتنی بە باشترین ڕێگەچارە زانی. سوپای موسڵمانانیش -كە وا دەبینرا شكستی هێنابێت- بەدەم تەكبیر و دروشمی سەركەوتنەوە

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٥٢/٤؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤٩/٤.

گەیشتنە حەمرائولئەسەد. سێ ڕۆژ مانەوە، لەوێدا پشوویان دا و برینی ماددی و مەعنەوییان ساڕێژ بوو.

لەو هەڵمەتەدا کەس زیانی پێنەگەیشت. لەولاشەوە ئەبوسوفیان کە لافی سەرکەوتنی لێدەدا، هەر کە بیستی پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بە سوپایەکەوە بەرەو ئەو دێت، تۆقی و بەبێهیوایی بەرەو مەککە هەڵهات.[1]

ئێستا با بپرسم: ئایا براوە قوڕەیشی هەڵهاتوو بوو یان سوپای موسڵمانی هێرشبەر؟ هیچ سەرکردەیەکی سەربازی نییە لە توانایدا هەبێت وەها دۆڕانێک وەربگێڕێت بۆ ئەو جۆرە سەرکەوتنە ئاشکرایە. بۆیە لێرەدا جێ پەنجە و مۆری فەتانەتی ئەو سەرودەرە بە هەموو ڕوویەکییەوە دەبینین.

خوێنەری بەڕێز! لە بڕگەکانی ڕابردوودا هەوڵماندا تیشکێک بخەینە سەر ئەو ڕێوشوێنە سەربازییانەی پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە جەنگی بەدر و ئوحوددا گرتوونیەتییە بەر. جا لەبەرئەوەی ناچاربووم بە زمانی کەسێکی عەوام گەورەیی و لێهاتوویی ئەو سەرکردە مەزنە باس بکەم، ئەوا ڕەنگە شتانێکم وتبێت کە سەری ئێشاندبن و ڕۆحتانی ڕەنجاندبێت. بۆیە دەخوازم خوای گەورە بە میهری خۆی بمبورێت و ئێوەی هێژاش چاوپۆشی لە کەموکورتییەکانم بکەن.

## أ. گۆڕانکاریی بەردەوام لە ستراتیژدا

لێرەدا هەوڵ دەدەین بەکورتی ئاماژە بە چەند لایەنێکی پەیوەندیدار بە پێغەمبەری خواوە (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بکەین چ لە بەدر و چ لە ئوحودیشدا،

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٥٥؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/٥١.

که سەرەتا و کۆتاییەکەی سەرکەوتن و ناوەڕاستەکەشی لەرزە پێخستن بوو:

پێغەمبەر (صَلَّیَ اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) لە بەدردا تاکتیکێك و لە ئوحوددا تاکتیکێکی تر و لە خەندەقیشدا شێوازێکی تری جیاوازی پەیڕەوکرد. بۆ هەر جەنگێك تەکتیکێکی تایبەتی هەبووە، ئەوەش پلان و پێشبینییەکانی دوژمنی ئاوەژوو دەکردەوە و تووشی سەرسامی دەکردن و دەبووە هۆی کەمبوونەوەی زیانی موسڵمانان. ژمارەی ئەو موسڵمانانەی لە کۆی جەنگەکانی پێغەمبەردا شەهیدبوون، سەد شەهید و چەندێك دەبن.

پێغەمبەر (عَلَیْهِ أَفْضَلُ صَلاةٍ وَسَلَامٍ) سوپاسالارێکی بێوێنە بوو، موسڵمانان لە سەردەمی ئەودا لە کەشی بەختەوەریی ڕاستەقینەدا دەژیان کە ناکرێت جارێکی تر دووبارە ببێتەوە. تۆ بڕوانە؛ سەرباری ئەوەی بازنەی نەیارانی تا بڵێیت بەرفراوان بوو و عەرەب و عەجەمی دەگرتەوە، کەچی بە زیانێکی نێجگار کەمەوە لە کۆی جەنگەکاندا سەرکەوتنی گەورەی بەدەستهێنا و کاری مەزنی ئەنجامدا. بێگومان بەوەش نەخشی نەسڕاوەی خۆی لەسەر پەڕاوی مێژوو واژووکرد.

بەڵێ، لە ئەحوددا تەکتیکێکی تری جیاوازی بەکارهێنا لەوەی کە لە بەدردا پیادەی کرد. لە ئوحوددا ژمارەیەك فیداکاری تایبەتی هەڵبژارد و چەند ئەرکێکی تایبەتی پێ سپاردن. هەروەها جێگەی بۆ تیرهاوێژەکان دیاریکرد، تاکو نەهێڵن دوژمن لە پشتەوە هێرش بکاتە سەریان. هاوکات بە دەستە پیرۆزەکانی خۆی ڕیزەکانی ڕێك دەخست و وره و هەستی کێبڕکێی تێدا دەبزواندن. واتە بەجۆرێك ڕەفتاری دەکرد کە هەستی خۆزگە بەیەکخواستنی لە ناو دەروونی هاوەڵاندا دەورووژاند. بۆ نموونە؛ شمشێرێکی دا بەدەست ئەبودوجانەوە تاکو مافی خۆی بداتێ. هەر کە پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ)

بینی ئەبودوجانە بە فیزەوە بەناو ڕیزەکانی دوژمندا دەڕوات و سەری بە جەمەدانە سوورەکەی بەستووە، فەرمووی "ئەمە ڕۆیشتنێکە خوا پێی خۆش نییە، بەڵام لەم جۆرە جێگایانەدا ڕێگەپێدراوە."[1] لەم سۆنگەیەوە زانایان فەرموویانە "واباشە سەربازان سمێڵیان درێژ بکەنەوە. تاکو سامیان لە دڵی دوژمندا زیاتر بێت." تەنانەت فەرموویانە "جەنگاوەران لە بەرەی جەنگدا چەندە مردنیان لەلا بێ بایەخ بێت و فیز لێ بدەن، ئەوەندە باشترە."

پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ئەو تاکتیکەی لە جەنگی بەدردا بەکار نەهێنا، بەڵام دەبینین لە ئوحوددا پیادەی کرد و هاوەڵەکانی بەرەو پێشبڕکێ هان دەدا. هەریەکەیان لەلای خۆیەوە ئاواتی دەخواست خۆی ئەو کەسە بێت کە شمشێرەکەی سەروەر وەردەگرێت. بەڵام ئەو شمشێرەکەی دایە دەست ئەبودوجانە. ئەوەش وای کرد فیداکار و پاڵەوانانی تریش بە دڵ و بە گیان بجەنگن و هەریەکەیان ببێتە ئەبودوجانەیەك بۆخۆی.

ڕێکارێکی دیکەش کە لە ئوحوددا پیادەی کرد، بریتی بوو لە بەشداری پێکردنی ئافرەتان. ئەوەبوو لە پێشدا باسی ئەو پاڵەوانێتییەمان کرد کە هاوەڵی پایەبەرز خاتوو نوسەیبە نواندی.

بەدەر لەوە، هەتا ئێستا ڕوون نییە لامان کە ئاخۆ خاتوو فاتیمەش لەو جەنگەدا بەشداری کردووە یان نا، بەڵام سەرچاوەکانی سیرە بۆمان دەگێڕنەوە کە لە کۆتایی جەنگەکەدا خوێنی ڕوخساری باوکی سڕیەوە. کاتێ بۆی دەردەکەوێت کە خوێنەکە بە ئاو ناگیرسێتەوە، پارچە حەسیرێك دەسوتێنێت و خۆڵەمێشەکەی دەخاتە سەر برینەکە و بەوشێوەیە

---

١. ابن هشام، السيرة النبوية ٤/١٣؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٤/١٥.

خوێنەکە دەگیرسێتەوە.[1] کەواتە یەکێك لە مەبەستەکانی پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) لە بەشداری پێکردنی ئافرەتان ئەوەبووە یارمەتی برینداران بدەن و وورەیان بەرز بکەنەوە.

## ب. هۆکاری شکستە کاتییەکەی ئوحود

پێویستە دان بەوەدا بنرێت کە لە ئوحوددا چەند درز و کەلێنێك لەنێوان هەردوو تابلۆی سەرکەوتنەکەدا دروستبوون. دەتوانین ئاماژە بۆ ئەم چەند هۆکارەی خوارەوە بکەین:

هۆکاری یەکەم:

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) هەر لە سەرەتای کارەکەوە لەگەڵ ئەوەدا بوو لەنێو مەدینەدا بمێننەوە و جەنگی بەرگری ئەنجام بدەن و ستراتیژێکی ئەرێنی پەیڕەو بکەن. گەر جۆش و خرۆشی هاوەڵان نەبووایەتە ڕێگر لە بەرامبەر دەرك کردنیان بەو وردەکارییەی لە گوێڕایەڵی کردندا هەبوو، کە لە بابەتێکی وادا ئەوەی لەسەر ئەوان بوو گوێڕایەڵی ڕەها بوو. ئەمە دەکرێت سەبارەت بەو تیرهاوێژانەش بووترێت کە لەنێو جەنگدا شوێنەکەیان چۆڵکرد. ئەوا دەکرێت ئەم جیاوازی بۆچوونە بە هۆکارێکی ئەم شکستە هەژماربکرێت. هەرچەندە شکستێکی کاتیش بوو.

---

[1] صحيح البخاري، المغازي ٢٤؛ صحيح مسلم، الجهاد ١٠١؛ سنن الترمذي، الطب ٣٤.

هۆکاری دووەم:

هاوەڵان لەگەڵ ناخ و سروشتی خۆیاندا کەوتنە ململانێیەکی سەختەوە. ناخر ئەوە ناکاری ئەوان نەبوو ئارەزووی دنیا بکەن، ئەم ڕاستییەشیان هەر ئەو دەمە سەلماندبوو کە هەرچییان لە مەککە هەبوو بەجێیان هێشتبوو و کۆچیان کردبوو بۆ مەدینە. ئەوان لەو ساتەوەختەدا تەواو نزیك بوون لە ئاخیرەت (دوارۆژ)، بۆیە خۆخەریککردن بە دەستکەوت و سامانی دنیاوە، سەبارەت بەوان کە لە نزیکانی خوا بوون بە بێئاگایی لەقەڵەم دەدرا. لەبەرئەوە خوای میهرەبان ویستی وابوو سزایەکی جەستەیی ئەو مرۆڤە بژاردانە بدات. ئەوەش سزایەك بوو تایبەت بەوانەی کە پایەی هاوەڵێتی پێغەمبەریان بەدەستهێنابوو. بەڵێ، ڕەنگە ئەوەی بۆ ئێمەومانان بە چاکە و پاداشت دەنوسرێت، سەبارەت بەوان بە گوناه دابنرێت. چونکە "حَسَنَاتُ الأَبْرَارِ سَيِّئَاتُ الْمُقَرَّبِينَ."

هۆکاری سێیەم:

دەکرێت بوونی سەرکردەیەکی بلیمەتی وەك خالیدی کوڕی وەلید لە ڕیزەکانی بەرامبەردا وەك یەکێك لە گرنگترینی هۆکارەکانی ئەو شکستە بژمێرین. چونکە خوا سیفەتی سەرکەوتنی بەردەوامی بۆ خالیدی کوڕی وەلید پاراست، ئەو خالیدەی کە دواتر هەستا بە ئەنجامدانی چەندین خزمەتی مەزن بۆ ئیسلام. ئەوەش خۆی لە خۆیدا پاداشتێکی پێشوەختە بوو لەبەرامبەر ئەو چاکانەی لە ئایندەدا ئەنجامی دەدان. چونکە ئەو هەڵمەت و ئەبەردییەی کە نازناوی "شمشێری خوا" یان سیفەتی "هەمیشە سەرکەوتن"ی بە خالید بەخشی، لە داهاتوودا وەك چەکوش سەری ڕۆم و فارسەکانی پێ دەکوتییەوە. خۆ

ئەگەر خالید لەو جەنگەدا بیەزیایە، ئەوا لەوانەبوو نەیتوانیایە بەو ڕۆحیەتە بەرزەوە خزمەت بە ئیسلام بکات.

هۆکاری چوارەم:

ئەوانەی کە شەرەفی بەشداریکردنی جەرنگی بەدریان هەڵنەگرتبوو، بەردەوام نزا و پاڕانەوەی گەرم و بەکوڵیان دەکرد و ئاواتیان ئەوەبوو پەروەردگار شەهادەتیان خەڵات بکات. خوای میهرەبانیش نزاکانی گیراکردن و وەڵامی دانەوە و ئەو نیشانە بەرزەی پێشکەشکردن. لە ساتەوەختی هەژانەکەی ئوحوددا کاتێك ئەنەسی کوڕی نەضر چاوی بەو هاوەڵانە کەوت کە بەهۆی بڵاوبوونەوەی پڕوپاگەندەی شەهیدبوونی پێغەمبەرەوە چۆکیان دادابوو و شڵەژابوون، ڕووی کردە ئاسمان و فەرمووی "خوایە، من داوای لێبوردن و لێخۆشبوونت لێدەکەم لەوەی ئەمانە دەیکەن!" دواتر تا دەنگی بڕ بکات هاواری کرد "ئێوە دوای مردنی پێغەمبەر ژیانتان بۆچییە؟" ئینجا شمشێرەکەی هەڵکێشا و کەوتە ویزەی دوژمن تا ئەو ساتەی شەهیدبوو. چونکە پەلەی دیداری ئەو پێغەمبەرەی بوو (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) کە وای دەزانی شەهیدبووە.[1]

بەڵێ هەروەك بڵێیت تەواوی نزاکانی پاڵێوراوی شەهادەت قبوڵ بووبوو. جا خۆ کەی بووە مرۆڤ داوای ئەو پلەیە بکات و لێی مەحروم بێت! ئەوەتا پاش چەندین سەدە دوعای کەسێکی وەك سوڵتان موراد لە یەکێك لە غەزاکانی بەم شێوەیە "خوایە ئوممەتی موحەممەد سەر بخەو منیش بە شەهادەت بگەیەنە!" ئەوە دەبێت موسوڵمانان سەرکەوتن بەدەست دەهێنن و

---

1. صحيح البخاري، الجهاد ١٢؛ ابن هشام، السيرة النبوية ٣٢/٤؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٤/ ٣١-٣٢.

پاش کەمێکیش لەنێو شەهیدەکان سوڵتان دەدۆزنەوە. خوای پەروەردگار ئەو نزایانە قبوڵ دەکات کە بەدڵ و گیان ئەنجام دەدرێن. ئەو هەموو نزایانەش کەهاوەڵان بۆ شەهادەت ئەنجامیان دەدا لەنێو جەرگەی ئوحوددا قبوڵ بوون، شەهید بوونی ئەو هەموو کەسەش لە ڕواڵەتدا وەك شکست دەرکەوت.

### هۆکاری پێنجەم:

وەك یەکێك لە خاوەن ئەقڵە گەورەکان دەڵێت: جەنگی ئوحود بریتی بوو لە جەنگی نێوان هاوەڵانی ئەوکاتە و هاوەڵانی داهاتوو. واتە جەنگی نێوان ئەو کەسانە بوو کە موسڵمان بووبوون و بووبوونە هاوەڵی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لەگەڵ ئەوانەی کە لە داهاتوودا دەبوونە هاوەڵ و لە فتوحاتی ئیسلامیدا چەندەها ڕۆڵی گرنگیان دەبینی. لە نموونەی ئەو هاوەڵانەش: خالیدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص و عیکریمە و ئیبن هیشام. ئەمانە ئاخ و سروشتیان هەرگیز بەرگەی دۆڕاندنی نەدەگرت، جا بۆئەوەی بەبێ زامدارکردنی شکۆیان موسڵمان ببن، دەبوو لەرزە پێکەوتنێکی کاتی لە ئوحوددا -لەبەر خاتری ئەوان- بەسەر موسڵماناندا بێت.[1]

### هۆکاری شەشەم:

لەپاڵ ئەمانەدا وانەیەکی یەکتاپەرستیش نمایانە. بۆی هەبوو سەرکەوتنەکەی بەدر کاریگەریی هۆکارە ڕواڵەتییەکانی لەلای هەندێکیان

---

۱. بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی، تیشکەکان ۷.

زیاد لە پێویست گەورە کردبێت.. ڕاستە هەستی شانازی و سەروەری لەبەردەم دوژمناندا هەستێکی پەسەندە، بەڵام لە حاڵێکدا ئەگەر ئەوجۆرە هەستە با کەمیش بێت بە خەیاڵیاندا هاتبێت، ئەوا سەبارەت بە کەسانی خواویستی هاوشێوەی ئەوان -وەك پێشتر وتمان- بە هەڵە دادەنرا.

شکست یاخود سەرکەوتن بەستراوە بە ویستی خواوە، هەر ئەوەش بوو لە بەدردا سەرکەوتنی خەڵاتکردن. جا ئەگەر هەندێکیان سەرکەوتن بدەنە پاڵ خۆیان و بڕیار و ویستی خوا لەبەرچاو نەگرن، ئیدی ئەودەم "شیرکی پەنهان" دێتە ئاراوە. دەی خۆ ئەوان فەرسەخ فەرسەخ لە سادەترین جۆری شیرکەوە دوور بوون. ئەگەرچی هەمووان باوەڕیان بەوە هەبوو، کەچی خوا ویستی لەم بابەتەدا هاوەڵانی پێغەمبەر (رضي الله عنهم) بگەیەنێتە پلەی یەقینی ڕاستەقینە. بۆیە لەوکاتەدا کە لە لوتکەی سەرکەوتندا بوون، شۆکێکی توندی لە ڕیزەکانیاندا هێنایە کایەوە. دواتریش لە ساتەوەختێکدا کە هەرگیز چاوەڕێیان نەدەکرد، سەرکەوتنی پێ بەخشینەوە و، بیری خستنەوە کە ویست و بڕیار تەنیا بەدەستی خۆیەتی:

﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ۖ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾

(آل عمران: ٢٦)

"ئەی پێغەمبەر، ئەی باوەڕدار بڵێ: خوایە هەر تۆ خاوەنی هەموو شتێکیت، دەسەڵات دەبەخشیت بە هەرکەسێك بتەوێت و، دەسەڵاتیش وەردەگریتەوە لە هەرکەس بتەوێت. هەرکەس بتەوێت باڵادەستی دەکەیت، هەرکەسێکیش بتەوێت زەلیل و بێ دەسەڵات و ژێردەستەی دەکەیت. هەرچی خێر هەیە هەر بەدەست تۆیە. بێگومان تۆ دەسەڵاتداری بەسەر هەموو شتێکدا."

له ئوحوددا باوەڕداران حەقیقەتی ئەم ئایەتانەیان بە ئاشکراترین شێوە بە چاوی خۆیان بینی و بەکردەیی لەگەڵیدا ژیان. بە چاوی خۆیان بینییان کە چۆن ویستی خوا هاتە دی. ڕاستە ئەوان دووچاری هەندێك زیانی ڕواڵەتی و سادە بوونەوە، بەڵام ئەوەی لەو ڕۆژەدا لە ڕوانگەی ئیمان و یەقینەوە بەدەستیان هێنا، هەموو ئەو زیانە ڕواڵەتیانەی ڕەواندەوە.

نکوولی لەوە ناکرێت کە شمشێر و خۆپڕچەککردن ڕۆڵی خۆیان هەیە و بە هۆکاری سەرکەوتن دادەنرێن. بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کە بناغەی هەموو کار و هەنگاوێك تەنها و تەنها ویست و ئیرادەی خوایە. چونکە تەنها ئەو باڵادەست و بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا.

بەڵی، وەك بڵێیت پەروەردگار لەسەر زوبانی ئەو شکستە کاتییەی ئوحود بە باوەڕداران بفەرمووێت: ئەگەر توانا و دەسەڵاتی خوا بەهەند وەرنەگرن، ئەوا ناگەن بە هیچ ئەنجامێك. ئەوەتا بە چاوی خۆتان دەبینن کە دەکرێت سەرکەوتن هەڵبگەڕێتەوە و ببێت بە شکست. کەوابێت ئەگەر خوا نەیەوێت ئەوا سەرکەوتن مەحاڵە، هەروەك چۆن ڕزگاربوون لە شکست بەبێ ویستی ئەو مەحاڵە.

هەموو باوەڕدارێك پێویستە ئەم وانە کردارییە فێر ببێت. پێدەچێت هاوەڵان بووبنە نوێنەری ئێمە بۆ وەرگرتنی ئەو وانەیەی کە دەبوو ئێمە وەری بگرین و فێری ببین..!

لەلایەکی دیکەوە، ئەو سزا کاتییەی بەهۆی سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەرەوە دەرخواردی باوەڕداران درا، وریای کردنەوە و زیاتر هەستیاری و هۆشیاری پێدان لەکاتی دەربڕینی ڕاکانیان لە خزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ).

لە ڕاستیدا ئەو ئەدەبە بەرزەی هاوەڵان بەدەستیان هێنا، قازانجێکی هەروا سادە و ساکار نەبوو...

ئەو ڕۆژە و ڕۆژەکانی دوای ئەویش هەموو لە دەستی توانستی پەروەردگاردا ئاڵوگۆڕیان پێدەکرێت.[1] هەرچی سەرەنجامیشە هەمیشە لە بەرژەوەندی باوەڕداراندا بووە و لە داوڕۆژیشدا هەروا دەبێت. ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (الأعراف: ١٢٨) (قصاص: ٨٣)[2]

"پاشەڕۆژ و سەرەنجام هەر بۆ پارێزکارانە."

ئیتر بەمجۆرە لەنێوەندی پشێوی و تەنگەبەرییەکانی ئێستا ڕزگارمان دەکات و، بەناو هەرێمە فراوانەکانی ئایندەدا دەمانگەڕێنێت. لە ئوحودیشدا هەمان تابلۆ بینرا و سەرەنجام بە سەرکەوتنی موسڵمانان کۆتایی هات.

بەڵێ، ئەگەرچی لەسەر بنەمای چەندین حیکمەتی زەبەندە کەموکورتییەکی هەندەکیش هاتبێتە کایەوە، بەڵام ئەمە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ کە ئوحود شکست بووە بۆ موسڵمانان. نا نەخێر.. ئوحود سەرکەوتنێکی فرە ڕەهەندی پەنهان بوو.

## ج. ڕەواندنەوەی گیانی شکست

بەم هەنگاوەی دوایی، پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) توانی گیانی مەعنەویی پێشوو بگەڕێنێتەوە بۆ موسڵمانان. هاوەڵانیش لەلایەن خۆیانەوە لە

١. بڕوانە: سورەتی آل عمران، ئایەتی ١٤٠.

٢. بە کەمێك جیاوازییەوە بڕوانە: سورەتی هود، ئایەتی ٤٩.

جاران بە ئەزموونتر بوون و پتر هەستیارییان دەتواند لە پەیبردن بە وردەکاریی فەرمایشتەکانی سەروەر. بەڵام هەواڵی ئەو شکستە کاتییەی دووچاری موسڵمانان بووبووەوە، بەخێرایی بڵاوەی کرد بە دەوروبەری مەدینەدا و بووە هۆی ئەوەی هەندێك هۆزی عەرەب و جولەکە تەماع بیانگرێت و چاو ببڕنە مەدینە. بۆیە زۆر پێویست بوو ئەو شکۆیەی لە ئوحوددا زامدار کرابوو، بێتەوە جێگەی جارانی و هێز و زەبری ڕاستەقینەی موسڵمانان بگەڕێنرێتەوە. ئەوەش ئەرکێك بوو دواخستنی هەڵنەدەگرت.

لە ساڵی چوارەمی کۆچیدا پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) ڕووی کردە هۆزی بەنی نەضیر، کە لەگەڵ بتپەرستانی مەککەدا دەستیان تێکەڵکردبوو. زۆر دەمێك بوو هۆزی ناوبراو لە سنووری خۆیان دەرچووبوون و دووجاریش هەوڵی تیرۆرکردنی پێغەمبەریان دابوو. ئەو هۆزە پشتیان بە یارمەتییەکانی بتپەرستانی مەککە و دووڕووەکانی مەدینە دەبەست و بڕیاری جەنگیان دابوو دژی پێغەمبەر و وایان دەزانی کە لەودیوی قەڵا تۆکمەکانیانەوە پارێزراو دەبن و دەستی موسڵمانانیان ناگاتێ...

ئەوەبوو تەنها پازدە ڕۆژ دوای گەمارۆدانیان، بەناچاری خۆیان دا بەدەستەوە و ڕازی بوون بەوەی لە مەدینە دووربکەونەوە، بەمەرجێك ئەوەندەی لە توانایاندایە بە کۆڵ و بار لەگەڵ خۆیان ببەن. لەگەڵ ئەوەشدا دڵخۆش بوون چونکە لە مردن ڕزگاریان بووبوو. بۆیە پێش بەجێهێشتنی مەدینە ئاهەنگێکیان سازدا کە شارەکە لەوەوپێش ئاهەنگی لەوجۆرەی بەخۆیەوە نەدیبوو. لەڕاستیدا مرۆڤ سەری سووڕدەمێنێت لە پەستیی خەڵکانێك کە لەبری پەژارە و دڵتەنگی، ئاهەنگ دەگێڕن بەبۆنەی جێهێشتنی زێد و نیشتمانیانەوە![1]

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/١٣٤-١٣٦.

## ٤. بەدری بچووك

ئەوەبوو ئەبوسوفیان پێش گەڕانەوەی لە ئوحود بە موسڵمانانی وت "بۆ ساڵی داهاتوو شوێنی بەدر وادەی دیداری جەنگمان دەبێت!" پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەم داوایەی قبووڵ کرد.[1] پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە تەواوی سوپاکەیەوە و لەکاتی دیاریکراودا لە بەدر ئامادەبوو و، یەك دوو ڕۆژ مایەوە و چاوەڕێی ئەبوسوفیانی کرد. بەڵام هیچ شوێنەوارێکی بتپەرستان دەرنەکەوت، بۆیە گەڕایەوە بۆ مەدینە، ئەو ڕووداوەش چووەتە ناو مێژووی ئیسلامەوە و ناوی "بەدری بچووك"ی لێنراوە. چونکە تێیدا موسڵمانان سەرکەوتنێکی وەك سەرکەوتنی بەدریان بەدەستهێنا، ئەگەرچی بە پێوانەیەکی بچووکتریش بێت. کاتێك نوعەیمی کوڕی مەسعود هات بۆلای پێغەمبەری خوا و وتی کە ئەبوسوفیان سوپایەکی زەبەلاحی ڕێکخستووە و ڕووی کردووەتە بەدر، مەبەستی ئەوەبوو وورەی موسڵمانان لاواز بکات، بەڵام بەو هەواڵە ئەوەندەی تر باوەڕی ئیمانداران زیادی کرد، قورئانیش ئاماژە بەوە دەکات و دەفەرمووێت:

﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴾

(آل عمران: ١٧٣)

"ئەوانەی کە خەڵکی (باوەڕ لاواز) پێیان دەڵێن: بەڕاستی خەڵکی بێباوەڕ و خوانەناس خۆیان بۆ ئێوە کۆکردووەتەوە و خۆیان بۆ ئێوە مەڵاسداوە، لێیان بترسن و خۆتان تووشی بەلا مەکەن. بەڵام ئەوان (واتە ئیمانداران) بەو پروپاگەندەیە باوەڕیان زیاتر دامەزرا و وتیان: خوامان بەسە کە یاریدەدەر و یارمەتیدەرێکی چاکە."

---

١. ابن هشام، السيرة النبوية ٣٤/٤؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٣٨/٤.

دواجار موسڵمانان بەوپەڕی ئاسودەییەوە لە بەدری بچووك گەڕانەوە. ئیدی سەرلەنوێ کەشی ئارامی و ئاسایشی ئیسلام باڵی بەسەر هۆزەکانی بیاباندا کێشایەوە.

## ٥. غەزای "زاتوڕڕیقاع و ئەلمورەیسیع"

لە ساڵی چواری کۆچیشدا ئەمجۆرە مانۆڕانە بەردەوام بوون. لەو ماوەیەدا هەردوو هۆزی "سەعلەبە و ئەنمار (ثعلبة و أنمار)"ی سەر بە تیرەی "غەطەفان" بڕیاریاندا هێرش بکەنە سەر مەدینە. کاتێك هەواڵەکە گەیشتە پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ)، بە خۆی و (٤٠٠) لە هاوەڵانەوە ڕۆیشت هەتا گەیشتە جێگەیەك کە پێی دەوترا "زاتوڕڕیقاع(ذاتُ الرِّقاع)". بەڵام کە هەردوو هۆزەکە بە هاتنی موسڵمانانیان زانی، خێرا خۆیان کوتایە ناو کونەکانیان و خۆیان حەشاردا، بەوەش هیچ جۆرە بەریەککەوتنێك ڕووی نەدا.[1] بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەوەش بۆخۆی سەرکەوتنێك بوو کە لە تۆماری سەرکەوتنەکانی سوپای ئیسلامدا تۆمارکرا.

دوابەدوای ئەمە غەزای "ئەلمورەیسیع" یان "هۆزی موستەلەق" ڕوویدا. مورەیسیع ناوی جێگەیەکە کە نۆ فەرسەخ لە مەدینەوە دوورە. ئەو بتپەرستانەی لەوێ دەژیان بە هاشوهوشی قورەیشییەکان خەڵەتابوون و تەماعیان خرابووە بەردەم. بۆیە بڕیاریاندا هێرش بکەنە سەر مەدینە. بۆ بەرگرتن لەوەها پێشهاتێك، پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) سوپایەکی ڕێکخست و بەرەو مورەیسیع ختییە ڕێ. کە هەواڵی هاتنی موسڵمانانیان پێگەیشت دەستبەجێ هەڵهاتن. جگە لە خەڵکی مورەیسیع کەسی تر نەمایەوە، ئەوانیش لەگەڵ موسڵمانان بەشەڕهاتن، بەڵام سوپای پێغەمبەر زاڵبوو بەسەریاندا و هیچ زیانێك لە ڕیزی موسڵمانان نەکەوت، جگەلە دوژمن دە جەنگاوەریان لێ کوژرا، موسڵمانانیش بە (٦٠٠) دیل و (٢٠٠٠) وشتر و (٥٠٠٠) سەر مەڕەوە گەڕانەوە. بەوجۆرە

---

[1]. إبن سعد، الطبقات الكبرى ٦١/٢.

پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) سەرکەوتنێکی تری نوێی خستە سەر زنجیرەی سەرکەوتنەکانی.[1]

بە گەڕانەوەمیان لەو غەزایە، هەندێك لە دووڕووان دزەیان کردە ناو ڕیزی موسڵمانانەوە، تاکو دووبەرەکی و دووزمانی لەنێوانیاندا بچێنن و سوود لە دەستکەوتەکان وەربگرن. تەنانەت ویستیان ڕووداوێکی بچووك بقۆزنەوە بەوەی کە ناکۆکییەك لەنێوان هاوپەیمانی یەکێك لە ئەنصارەکان و یەکێك لە کۆچەرەکان بنێنەوە. ئەوەش تەنها لەسەر ئەوەی کامیان شایانترە بەوەی لە بیرێکی ئەو دەڤەرەدا وشترەکەی پێشتر ئاو بدات. بەڵام پیلانەکەیان سەری نەگرت. دیسانەوە دووڕووان ئەکاتی گەڕانەوە لەم غەزایەدا بوختانە دزێوەکەیان بۆ دایکی ئیمانداران (حەزرەتی عائیشە) هەڵبەست. ئەو عائیشەیەی پاکیزەییەکەی بە ئایەت سەلمێنراوە و بە ئەندازەی حۆرییەکانی بەهەشت پاك و بێگەردە.[2] هاوکات عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی پەردەی لەسەر دووڕوویی خۆی لادا و سەبارەت بەو جەنگە وتی "سوێند بە خوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە، دەبێت سەربەرز و خانەدانەکان ئەوانە لە مەدینە دەربکەن کە ڕیسوا و سەرشۆڕن!" دیارە مەبەستی ئەوە بوو کە خۆی سەربەرزە و پێغەمبەریش (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) —حاشا.. هەزارجار حاشا- پێچەوانەکەیەتی.[3] بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی ئەم مونافیقە، کە هاوەڵێکی پایە بەرزە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، هەر کە گەشتنەوە شاری مەدینە بە باوکی وت "ناهێڵم بێیتە ناو مەدینەوە هەتا نەڵێیت محەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) سەربەرزە و منیش سەرشۆڕم!"، وە هەتا باوکی دانی نەنا بە سەربەرزی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) نەیهێشت بڕواتە ناو مەدینە.

---

١. الواقدي، المغازي ٤٠٤/١-٤١٠؛ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٦٣/٢-٦٤.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٢٦٠/٤-٢٧٤؛ إبن كثير، البداية و النهاية ١٦٠/٤-١٦٤.

٣. صحيح البخاري، المناقب ٨؛ صحيح مسلم، البر ٦٣.

## ٦. فاکتەری شەو لە هەڵمەتەکاندا

پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) بۆ هەموو سەفەرەکانی شەوی هەڵدەبژارد، دیارە شەو نهێنییەکی تری تێدایە. ئەوەتا قورئان بەشێوەی ناڕاستەوخۆ بەردەوام ڕێنمایی دەکات بۆ گەشتی شەوانە. موسا پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ) هەر لە شەودا بوو پێشەوایەتی باوەڕدارانی کرد تاکو لەگەڵیدا هەڵبێن، چونکە خوا پێی فەرموو:

﴿ فَأَسْرِ بِعِبَادِي لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴾ (الدخان: ٢٣)

"ئەوسا ئیتر خوا فەرمانی بۆ نارد کە شەوڕەوی بکە بە بەندەکانم و شار چۆڵ بکەن، بێگومان ئەوانە بەدواتاندا دێن."

هەمان فەرمانیشی کردووە بە لوط پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ):

﴿ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا امْرَأَتَكَ ﴾

(هود: ٨١)

ئەو کاتەش کە شەوڕەوی(إسراء) بە سالاری پێغەمبەران کرا و دەستی کرد بەگەشتە ئاسمانیەکەی و تیایدا لە جوبرەئیل ترازا، ئەویش هەر لە شەودا بوو:

﴿ سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَا الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴾

(الإسراء: ١)

"پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەی کە شەوڕەوی کرد لە بەشێکی کەمی شەودا بە بەندەی خۆی، لە مزگەوتی "حرام" (کەعبەی پیرۆز)ەوە بۆ مزگەوتی "ئەقصا" لە (بیت المقدس) کە دەوروبەریمان پیرۆز و پڕ بەرەکەت کردووە، تا

هەندێك نیشانە و بەڵگە و دەسەڵاتداری و توانایی خۆمانی نیشان بدەین. بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و بینایە."

زۆربەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلَامُ) گەشتی شەویان هەبووە، مەنزڵەکان بە شەودا دەبڕرێن و ئەو شەوانەش دەبنە شەوانی گەیشتن و نزیکبوونەوە لە بەدیهێنەر. خوای باڵادەستیش لە زۆر ئایەتدا سوێند بە شەو دەخوات، ئەو کردەوە پرشنگدارانەی لە تاریکایی دەیجووریی شەودا ئەنجام دەدرێن، ئەو شەوە زۆر لە ڕۆژ ڕووناکتر و پرشنگدارتر دەکەن. شاعیری خواناس "ئیبراهیم حەققی" دەڵێت:

ئەی دیدە، چیت داوە لە خەو.. بێداربەوە،
گوزەری ئەستێرەکان لە شەواندایە، بیربکەوە.

ئەوەی مەودا دوورەکانی بڕیوە لە شەودا دەبڕێت. هەر لە شەودا کە دەچێتە سوژدەوە و بەرماڵەکەی بە فرمێسك تەڕ دەبێت، ئەوکاتە ڕۆحی دەتوانێت بەرزەفڕ بێت و دوورییەکان تەی بکات. ئەو کەسەش کە دیواری ماڵەکەی لەسەر بیستنی ناهونالەی ڕاهاتبێت، دەتوانێت هەڵبکشێت بەرەو چەند ئاسۆیەك کە دوورییەکان دەستیان کورتە و نایانگەنێ. ئەو جۆرە کەسانە تەنها بە شەواندا مەوداکان دەبڕن. لەوانەش کە ئەو دوورییانەیان بڕیوە هەر بە شەودا بووە. بەڵام ئەوانەی لە شەواندا خەوتوون، لە نیوەی ڕێگەدا ماونەتەوە. جا ئەگەر دەتانەوێت لە سزای بەرزەخ ڕزگارتان ببێت، ئەوا هەرگیز مەهێڵن بەبێ شەونوێژ شەوتان بڕوات. مەهێڵن، چونکە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەرگیز دەستبەرداری نەبووە.

محەممەد ئیقبال دەڵێت "بیست ساڵ لە لەندەن لەو دنیا پڕ تەمومژەدا مامەوە، بە بیرمدا نایەت هیچ شەوێك لەو شەوانە شەونوێژم نەکردبێت."

بەڵێ، شەوگار (دەمی کپبوونی سەرجەم دەنگەکان) هەرکەس بەهەندی وەربگرێت، دەگاتە ئاستێك هەر قسەیەك بکات لە ناو ویژدانیدا دەنگ دەداتەوە و دوورییەکان دەبڕێت. پێغەمبەریش (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) دوورییە ماددی و مەعنەوییەکانی هەر بە شەودا دەبڕی. بۆیە بەشەودا سەفەری دەکرد و بەڕۆژدا وچانی دەدا. بەوجۆرە دوژمنانیشی پێیان نەدەزانی، هەر ئەوەندەیان دەزانی لەبەردەمیاندا کتوپڕ دەرکەوتووە. ئایەتی:

﴿ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴾ (الصافات: ١٧٧)

"(واوەیلا بۆ ئەوانە) کاتێك کە سزا و تۆڵەی ئێمە دادەبەزێتە سەریان، ئای کە بەرەبەیانێکی سامناکە بۆ بێدارکراوان."

بڕگەیەکی بچووکی ئەو دیمەنەمان بۆ نمایش دەکات.

بەڵێ. ئەگەر ڕووبەڕووی کۆمەڵێك ببوونایەتەوە، مانای ئەوە بوو کە ئیتر ئەو کۆمەڵە کۆتاییان پێ هاتووە و دەورانیان هەڵپێچراوە. پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەر لە بەرەبەیاندا هەڵمەتی دەبرد.[1] چونکە لە بەرەبەیاندا بیروباوەڕی خەڵکی ئەو ناوچەیە دەردەکەوت کە داخۆ بانگ دەدرێت یان نوێژ دەکرێت. بەرەبەیان ئەوکاتەیە کە شنەبای تەجەللا هەڵدەکات. یەکێك لە دۆستانی خوا دەڵێت:

شنەی تەجەللا هەڵدەکا لە سەحەردا
سا دیدەم بێداربەوە لە تاوی سوبحدا

بەرەبەیان لای ئیماندار زۆر گرنگە، ئەو ساتەوەختەیە کە سروەی میهری ئیلاهی هەڵ دەکات. لەودەمەدا خۆی ساز دەکات بۆئەوەی بچێتە ناو

---

١. صحيح مسلم، الصلاة ٩؛ سنن الترمذي، السير ٤٨؛

جیهانی واتاوە. چونکە خۆی بۆ نوێژ ئامادە دەکات. بۆیە هەردەم پێغەمبەر (عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ) کاتی بەرەبەیانی هەڵدەبژارد. لەکاتێکدا کە دوژمن بە باوێشکەوە لە جێگەی خەو هەڵدەستا، دەیبینی کە ئیمانداری گورجوگۆڵ لەبەردەمیدا وەستاوە. زۆربەی جار ئەوە نەخشەی بوو. ئەوکاتەی کە لەبەردەم قەڵای خەیبەردا دروشمی "الله أكبر! خەیبەر وێران بێت!"ی وتەوە،[1] قەڵاکە یەکسەر لەرزەی پێکەوت. بەڵام کەس نەیدەزانی ئەو سوپایە چۆن گەیشتووەتە ئەوێ، چونکە بروسکە ئاسا و بەخێرایی غەزاکانی ئەنجام دەدا. ئەوەندە بە چوستی ڕێگایان دەبڕی، خێراترین وشتر پێیان نەدەگەیشتەوە.

غەزای "هۆزی موستەڵەق" یەکێك بوو لەو غەزا خێرایانە. کاتێك گەڕانەوە دووڕوویی پەلی خۆی کوتا. لەبەرئەوە خاوەن فەتانەتی مەزن بۆئەوەی ڕێ نەدات شوێنەواری دووڕوویی تەشەنە بکات، فەرمانی دەرکرد بەبێ وەستان موسڵمانان سەفەرێکی درێژ بکەن. بەهۆی ئەو سەفەرە بەردەوامەوە دووڕووەکان هەلیان بۆ نەڕەخسا تاکو ئاگری ئاژاوە زیاتر خۆش بکەن.[2] ئەگەرچی عەبدوڵڵای کوڕی نوبەی کوڕی سەلول لە بیری خۆیدا نەخشەی بۆ چەندەها شت کێشابوو، بەڵام کاتی پێویستی دەست نەکەوت تاکو بیرۆکەکانی جێبەجێ بکات. هەمووان هێندە خێرا دەڕۆیشتن هەروەك ڕابکەن. ڕۆیشتن و گەڕانەوەیان هەر بەو خێراییە بوو. تەواو شەکەت بووبوون، بۆیە هەر کە مۆڵەتی پشوویان پێدرا، خێرا تەختی خەو بوون. خەبەریشیان نەبووەوە تا ڕۆژ بووەوە و خۆر هەڵهات. ڕەنگە یەکەمجار بووبێ نوێژی بەیانی لە گزنگدا بکەن.[3]

---

١. صحيح البخاري، الصلاة، ١٢؛ الآذان ٦؛ صحيح مسلم، الجهاد ١٢٠.

٢. ابن هشام، السيرة النبوية ٤/٢٥٢-٢٥٦؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٤/١٥٧-١٥٨.

٣. صحيح مسلم، المساجد ٣٠٩-٣١٢؛ سنن أبي داود، الصلاة ١١.

ئەو حاڵە هەتا ساڵی پێنجەمی کۆچی بەردەوام بوو. بۆیە هۆزەکان لەوە دڵنیابوون کە هیچ کامیان ناتوانن بەتەنیا لەبەرامبەر پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) بوەستنەوە. بۆیە بڕیارياندا کە هێزەکانیان یەك بخەن و پێکەوە دژی بوەستن. بەوجۆرە هێزەکانیان یەکخست و بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ.

## ٧. خەندەق

سالّی پێنجەمی کۆچی، مانگی شەوال بوو، هۆزی نەضیر لە مەدینە دوورخرابوونەوە و ڕۆیشتبوون بۆ خەیبەر، لەوێ نیشتەجێ بووبوون. لەوێ دەستیان کردبووە هاندانی خەڵکی خەیبەر دژی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). ئەوەبوو هەندێك لە گەورەکانی خۆیان ناردە لای قورەیش و هۆزی غەطەفان. ئەو دوو هۆزە بە هەموو توانایان هەوڵیان دەدا موسڵمانان لەناوبەرن. بۆیە هەمیشە ئامادەبوون پێشوازی لە هەر پێشنیارێك بکەن کە هەرکەس و لایەنێك بۆ ئەو مەبەستە بیکات.

دواجار جولەکە و هۆزە عەرەبە بتپەرستەکان لەسەر لەناوبردن و ڕیشەکێشکردنی قەوارەی موسڵمانان ڕێککەوتن و، بڕیاریاندا بە بیست و چوار هەزار جەنگاوەرەوە هەڵبکوتنە سەر مەدینە. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) پێشتر لە ڕێگەی تۆڕە هەواڵگرییەکەیەوە هەواڵی ئەو گەلەکۆمەیەی بیستبوو. بۆیە هاوەڵانی کۆکردەوە و سەبارەت بە پلانی جەنگی داهاتوو پرس و ڕاوێژی پێکردن. لەناو هەموو پێشنیارەکاندا بۆچوونی سەلمانی فارسی پەسەندکرد. سەلمان پێشنیاری کرد خەندەقێك بەدەوری مەدینەدا هەڵبکەنن، ئەوجا لە پشت ئەو خەندەقەوە بەرگری لە شارەکە بکەن. ئەو تاکتیکە شێوازێکی نوێ بوو کە عەرەبی ئەو سەروەختە پێی ئاشنا نەبوو. قورەیش و هاوپەیمانانی چاوەڕێی ئەوە بوون جەنگێکی وەك ئەوەی بەدر و ئوحود بکەن. بەڵام ستراتیژێك چاوەڕێی دەکردن کە هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەهاتبوو. ئنجا سەروەرمان کۆمەڵە پاسەوانێکی بەدەوری خەندەقەکەدا جێگیرکرد. بەوەش نەیهێشت زانیاریی خەندەقەکە دزە بکات بۆ دەرەوە. پاسەوانەکان ڕێیان بە هیچ کەسێکی مەدینە یان دەوروبەری نەدەدا بەو دەوروبەرەدا هاتوچۆ بکەن.

هەڵکەندنی خەندەقەکە زۆر بەنهێنی تەواوکرا. بۆیە کاتێك سوپای بێباوەڕان لە مەدینە نزیکبووەوە، تووشی حەپەسان هات و چۆکی شکا.

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و سێ هەزار لە هاوەڵانی دەستیان کرد بە هەڵکەندنی خەندەق و، خۆیشی بەشداری کرد لە پرۆسەکەدا. پشکی هەرکەسێك ئەوە بوو هەنگاوێك هەڵبکەنێت. هاوەڵان کران بە چەند بەشێکەوە. قووڵایی خەندەقەکەش دەبوو بەشێوەیەك بێت کە ئەگەر سوار بە ئەسپەکەیەوە بکەوێتە ناوی، نەتوانێت لێی بێتە دەرەوە. پانییەکەیشی بەجۆرێك بوو ئازاترین سوارچاك نەتوانێت بە ئەسپ بازبدات بەسەریدا.[1]

لە ئێستادا ئەو خەندەقە تەواو پووکاوەتەوە. چەندە بە ئاواتەوەین ئێمەش ئەو خەندەقەمان ببینیایە کە پێغەمبەری ئازدار (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بەشداری کردووە لە هەڵکەندن و دەرداني گڵەکەیدا. نازانین داخۆ پاشماوەی ئەو خەندەقە مابێت یان نا، بەڵام ئەگەر پسپۆڕانی زانستی سەربازی توێژینەوەی ئەو شوێنەوارانە بکەن و بڵێن "لەوانەیە ئێرە جێگەکەی بێت!" ئەوکات پێویستە بایەخێکی تەواو بەو بابەتە بدرێت.

بەڵێ، پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) خۆی بەشداری کرد لە هەڵکەندنی خەندەقەکەدا، تاکو هانی موسڵمانان بدات بۆ بەدەستهێنانی پاداشت. لەگەڵ هاوەڵاندا بێ وچان کاریان تێدا دەکرد. زۆرجاریش جۆشوخرۆشی دەدانە بەر و هەڵی دەنان بۆ پێشبڕکێ. لەو نێوەندەشدا جارێك ستایشی موهاجیران و جارێکیش ستایشی ئەنصارەکانی دەکرد.

سەربازەکان برسی بوون، هەریەکەیان بەردێکی بەستبوو بەسەر کەلەکەیەوە.

---

[1]. إبن هشام، السيرة النبوية ١٧٢/٤.

کەچی پێشەواکەیان دوو بەردی بەستبوو،[1] بەڵام هەرگیز وزەیان کەم نەدەبووەوە، بەدەم پاچ وەشاندنەوە سروودیان دەخوێند و دەیانوت:

نَحنُ الذينَ بايَعوا مُحَمّداً     عَلى الجِهاد مابَقينا أبَدا

"ئێمە ئەوانەین داومانە بە حەزرەتی محەممەد پەیمان..

لەسەر تێکۆشان تا ماوین لە ژیان"[2]

بەدواشیدا دەیانوت:

وَاللّٰهِ لَوْلا اللّٰهُ مَا اهْتَدَيْنَا     وَلا تَصَدَّقْنَا وَلا صَلَّيْنَا

فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا     وَثَبِّتِ الأَقْدَامَ إِنْ لاقَيْنَا

"سوێند بەخوا! گەر خوا نەبووایە هیدایەتمان وەرنەدەگرت..

نە چاکەمان دەکرد، نە نوێژمان دەکرد. دەسا بباریێنە سەرمان سروەی ئارامی..

وە ڕووبەڕوویان پێمانبدە خۆگری و خەمڕەخساوی."[3]

سەروەریشمان (صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە وەڵامیاندا دەیفەرموو:

"اللّٰهُمَّ لَا عَيْشَ إِلا عَيْشُ الآخِرَةِ     فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَةِ"

"خوایە! ژینی تر نییە جگە لە ژینی دوارۆژ..

دەسا لە ئەنصار و موهاجیران تۆ خۆشببە!"[4]

کاتێك پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) ریزەکانی رێك دەخست، چیای "سلع"ی

---

١. الترمذي، الزهد ٣٩؛ الطبري، تهذيب الآثار ٢٧٤/١.

٢. صحيح البخاري، مناقب الأنصار ٩؛ صحيح مسلم، الجهاد ١٣٠.

٣. صحيح البخاري، المغازي ٢٩؛ صحيح مسلم، الجهاد ١٢٣-١٢٥؛

٤. صحيح البخاري، مناقب الأنصار ٩؛ صحيح مسلم، الجهاد ١٢٧.

خستبووە پشتەوەی خۆی و ژن و منداڵانیشی ناردبوو بۆ پەناگەیەکی پارێزراو.[1]

من پسپۆڕی بواری سەربازی نیم، بەڵام بڕوام وایە کە تاکتیکی پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە هەموو لایەنەکانییەوە ڕاست و دروستە، بە تایبەت لەو ڕووەوە کە چیاکەی خستبووە پشتی خۆی. با ئەوەش بوەستێت کە بڕیارەکانی هی ئەو ساتەوەختە بوون و زادەی بیرکردنەوەیەکی درێژ و ڕاوێژی سەربازیی نەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو بڕیارەکانی ئامانجەکانی دەپێکا.

لە سەروبەندی دانانی ستراتیژ و نەخشەی بەرگریی مەدینە، ئەگەری ئەوەی لەبەرچاوگرتبوو کە هۆزی قورەیزە هێرش بکەنە سەریان. بۆیە پاراستنی ئەو قۆڵەی سپارد بە کۆمەڵێك لە هاوەڵان بە سەرکردایەتی سەلەمەی کوڕی ئەسلەم.[2] بەڵێ، تەواوی ئەگەرەکان لەبەرچاوگیرابوون و هیچ شتێك بۆ ڕێکەوت جێ نەهێڵرابوو.

لە خەندەقەکەدا شوێنێکی تەسك هەبوو. سواری زرنگ و لێهاتوو ئەگەر ئەسپەکەی ڕەسەن بووایە دەیتوانی بە باز لێی بپەڕێتەوە. لە یەکەم سەرنجدا ئەمە بە کەمتەرخەمی لەقەڵەم دەدرێت. بەڵام ڕاستییەکەی وا نییە، چونکە دیسان لێرەشدا فەتانەتی ناوازەی پێغەمبەری سەردار (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەردەکەوێت. چونکە سوارە ئازا و دلێرەکانی بتپەرستان هەوڵ دەدەن لەو خاڵەوە خۆیان بگەیەننە ئەوبەر، بەوەش ڕێك دەکەونە بۆسەی موسڵمانانەوە. لەسەرەتادا کەس هەستی بەوە نەکرد، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم لە بەرەوپێشچوونی ڕووداوەکان، ئەوەی پێغەمبەر پێشبینی کردبوو ڕوویدا. سەربازە هەرە ئازاکانیان دەستیان کردە تاقیکردنەوەی بەختی خۆیان، بەڵام یەك لەدوای یەك تیادەچوون.

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/١٧٧؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/١٠٢.

٢. الواقدي، المغازي ٢/٤٦٠؛ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٢/٦٧.

عەمری کوڕی عەبدولود یەکەم کەس بوو لە خەندەقەکە پەڕییەوە. ئەگەرچی بەتەمەنیش بوو، بەڵام بە سەد جەنگاوەر هەژمار دەکرا. داوای زۆرانبازێکی کرد، حەزرەتی عەلی بۆی چووە مەیدان، کە ئەو لاوە مێردمنداڵەی بینی گاڵتەی پێهات و لە ئەسپەکەی دابەزی، چونکە بە شایستەی نەدەزانی بە سواری ئەسپەوە لەگەڵیدا بجەنگێت. ئەوجا بە شمشێر ئەسپەکەی خۆی کوشت و لەبەردەم حەزرەتی عەلیدا وەستا. زۆران دەستی پێکرد.

یەکەمجار عەمر دەستی کردەوە. ئەوەبوو گورزێکی بەزەبری وەشاند. حەزرەتی عەلی بەری لێگرت و شمشێرەکەی تێدا ڕاگرت و سەری بریندارکرد. ئنجا شمشێرێکی توندی کێشا بە شانیدا و "اللّه أكبر"ی کرد و موسڵمانانیش بەجارێك بەدوایدا دووبارەیان کردەوە. خۆ ئەگەر عەمر بە زەبری شمشێرەکەی عەلی نەمردایە. ئەوا بەدڵنیاییەوە دەنگی تەکبیرەکە دەیتاساند. مەرگی عەمر پەشۆکاوی خستە ڕیزی خوانەناسانەوە. بەو ئەندازەیەش دڵی موسڵمانانی خۆشکرد و وردی بەرزکردنەوە.[1]

پاش عەمر، ضیرار و عیکریمە و هوبەیرەیش هەڵمەتیان هێنا. بەڵام لەبەردەم گورزەکانی عەلیدا بەرگەیان نەگرت و هەڵهاتن. دواتر نەوفەلی کوڕی عەبدوڵئیلاهـ توانی لە خەندەقەکە بپەڕێتەوە. حەزرەتی زوبەیری کوڕی عەوام بەرەنگاری بووەوە. بەڵام لەکاتی هەڵهاتندا کەوتە ناو خەندەقەکەوە و موسڵمانان بەردبارانیان کرد. نەوفەل خۆی بە شایستەی ئەوە نەدەزانی بە بەردباران بمرێت، بۆیە هاواری کرد "هۆ عەرەبەکان، بەجۆرێکی شایستە

1. الواقدي، المغازي ٢/٤٧٠-٤٧١؛ إبن هشام، السيرة النبوية ٤/١٨٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/١٠٥-١٠٧.

بمکوژن!" ئنجا حەزرەتی عەلی بۆی دابەزی و بە سزای خۆیی گەیاند.[1]

ئەو ڕۆژە سەختترین ڕۆژەکانی گەمارۆ بوو، پاش تێپەڕینی مانگێك بەسەرگەمارۆکەدا، گرۆی بتپەرستان لاوازبوون و ورەیان دابەزی، چونکە بەڕێوەبردنی بیست و چوار هەزار سەرباز و دابینکردنی پێداویستییەکانیان هەروا ئاسان نەبوو.

کە هۆزی قورەیزە بینییان بتپەرستان ناتوانن خەندەقەکە ببەزێنن و هەرکەسیش سەربزێوی بکات یەکسەر دەکوژرێت، بڕیاریاندا هێرش بکەنە سەر ئەو قەڵایەی کە موسڵمانان ژن و منداڵەکانیان تێدا پەنادابوو. پێش هێرشەکە یەکێکیان نارد تاکو سیخوڕییان بۆ بکات. صەفیەی پوری پێغەمبەر (رضيَ اللهُ عَنْها) ئەو جولەکەیەی بینی کە بە دەوری قەڵاکەدا دەسووڕایەوە، یەکسەر خۆی لێ مەڵاس دا، ئەوجا لەناکاو هێرشی کردە سەری و کوشتی و چەکەکەی هێنایەوە بۆ قەڵاکە. کاتێك جولەکەکان هەواڵی کوژرانی سیخوڕەکەیان پێگەیشت، وایان زانی هێزێکی سەربازی لەوێدا هەیە، بۆیە وازیان لە بیرۆکەی هێرش هێنا.[2]

کاتێك دوژمنانی ئیسلام شاڵاویان هێنا، متمانەی تەواویان بە خۆیان هەبوو کە لە چەند ڕۆژێکدا کۆتایی بە موسڵمانان دەهێنن و سەربەرزانە بۆی دەگەڕێنەوە. بەڵام لەو پێشبینییەیاندا بەهەڵەدا چووبوون. وەختێکیش ئەوەیان بۆ دەرکەوت، تەنها ئەوەندەیان بۆ مایەوە نائومێدانە پشت هەڵبکەن و بگەڕێنەوە.

---

١. الواقدي، المغازي ٢/ ٤٧٠-٤٧٢؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٤/ ١٠٥-١٠٧.

٢. ابن هشام، السيرة النبوية ٤/ ١٨٧؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٤/ ١٠٨-١٠٩.

لەکاتی گەمارۆدا هەلومەرجەکان دژی بێباوەڕان بوون. زستان نزیک بووبووەوە و خەڵکی مەککەش بەرگەی سەرمای زستانی مەدینەیان نەدەگرت. جگە لەوەی کە ئامادەسازییان نەکردبوو بۆ سەرماوسۆڵەی زستان. ڕەشەبا بە شەو و ڕۆژ هەراسانی کردبوون. پاشان ئەو ڕەشەبایە گۆڕا بۆ گەردەلوولێکی بەهێز و خێوەتەکانی دەرماند و شمەکەکانی ڕادەماڵین. نەیانتوانی لەوە زیاتر خۆیان ڕابگرن، بۆیە ئەبوسوفیان بە نابەدڵی فەرمانی کشانەوەی دەرکرد.[1]

## أ. باسی خەندەق لە قورئاندا

قورئانی پیرۆز بەدرێژی باسی جەنگی خەندەق دەکات، ئەگەر پێتان خۆش بێت ئەوا دەتوانین لەنێو دێڕی ئایەتەکاندا بەدواداچوونێکی ئەو ڕووداوە بکەین. ئەوجا ئاماژەش بۆ ئەو بلیمەتییە سەربازییە دەکەین کە پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لەو جەنگەدا نواندی. خوای میهرەبان لەوبارەیەوە دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴾

(الأحزاب: ٩-١١)

"ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، یادی نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان، کاتێک سەربازانی بێباوەڕان هاتنە سەرتان، ئێمەش ڕەشەبایەکی بەهێز و سەربازانێکمان نارده سەریان کە ئێوە نەتاندەبینین. خوای گەورە بینا بوو بە هەوڵ و کۆششتان.

١. إبن هشام، السيرة النبوية ١٩١/٤؛ إبن كثير، البداية و النهاية ١١٢/٤-١١٣.

ئەودەمەی دوژمنان لەسەر و خوارتانەوە هاتنە سەرتان. کاتێکیش چاوەکان ئەبلەق بوون. دڵەکان گەشتبوونە گەروو. گومانی جۆراوجۆرتان دەبرد بە بەڵێنەکانی خوا (بە سەرخستنی باوەڕداران). لەوێدا باوەڕداران تاقی کرانەوە و تووشی تەنگانە و سەختییەکی زۆر توند و بەهێز بوون. دووچاری دڵە لەرزەیەکی زۆر سەخت کران."

هەروەها ئاماژە بۆ ورە و هێزی مەعنەویی باوەڕداران دەکات و دەفەرمووێت:

﴿ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴾ (الأحزاب: ٢٢)

"کاتێك ئیمانداران ئەو هەموو دەستە و گرۆهەیان بینی. وتیان "ئەمە ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەرەکەی بەڵێنیان پێداوین (کە بەو شێوەیە دژایەتی ئایینەکەی دەکرێت و کافران و دووڕووان نەخشە و پیلان دەکێشن بۆ ڕیشەکەن کردنی). دیارە کە خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو لەپێش هاتنیدا." بێگومان ئەو دژایەتییە باوەڕ و ملکەچی نەبێت هیچی تری بۆ زیاد نەکردن."

وەك بنچینەیەکی گشتی ناچینە ناو ئەو باس و خواسە مێژووییەی کە لەناو پەڕاوەکانی سیرەدا باسکراون. بەڵکو تیشك دەخەینە سەر چەند لایەنێکی دیاریکراو. ئامانجی سەرەکیشمان پیشاندانی ڕەهەندی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەدە. چونکە ئەو زاتە دارای فەتانەتێکی هەمەلایەنە بوو. بێگومان یەکێك لەو لایەنانەش بریتی بوو لە بواری سەربازی. هەروەك پێشتریش باسمان کرد، وێڕای ئەوەی کە شارەزاییەکی ئەوتۆشمان لە بوارەکەدا نییە، کەچی نموونەیەکی ناوازەی سەرکردایەتیی سەربازییمان بینی لە هەردوو جەنگی بەدر و ئوحوددا. هەروەها وتووێژێکی کورتیشمان دەبێت لەبارەی جەنگی خەندەقەوە. تاکو ڕۆشنی بکەینەوە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەم جەنگەشدا سەرکردەیەکی نایاب و بێهاوتا بووە. ئەوەتا جەنگی خەندەق شایەتە و ئەو حوکمەی ئێمە پشتڕاست دەکاتەوە.

لە جەنگی خەندەقدا -کە لە هەلومەرج و بارودۆخێکی زۆر ناهەموارد! ڕوویدا- سەرکەوتنێکی ئێجگار گەورە بەدەستهات. بارودۆخەکانیش وەها پێشهاتن کە دواتر سەرکەوتنیان مسۆگەکرد. هەر بەوجۆرەی کە خوا بە پێغەمبەرەکەی خۆی ڕاگەیاندبوو. ئەو خاوەن فەتانەتە هەرەمەزنەش (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لەلایەن خۆیەوە ئەو هەلومەرجانەی بەهەند وەرگرت کە خواوەند لەڕێی وەحی یان ئیلهامەوە فێری کردبوو.

بەڵێ، بەدەستهێنانی سەرکەوتن لەژێر ئەو هەلومەرجە سەخت و دژوارانەدا تابڵێیت زەحمەت بگرە ئەستەم بوو. جا ئێستا با پێکەوە چاوێك بخشێنین بەو ڕێوشوێنانەدا کە سەردارمان لە خەندەقدا پیادەی کردن و، لەسەر زوبانی خەندەق گوێبیستی سەدای "محمد رسول اللّٰه" بین...

## ب. خەندەق و پێشهاتەکانی پشت پەردە

١- ژمارەی سوپای دوژمن بیست و چوار هەزار و سوپای موسڵمانانیش سێ هەزار کەس دەبوو. واتە لەشکری دوژمن هەشت ئەوەندەی لەشکری موسڵمانان بوو. ئەوەش پێویستی دەکرد هەر موسڵمانێك بەرامبەر هەشت جەنگاوەر بوەستێتەوە. لەبەرئەوە گواستنەوەی ئەو جەنگە لە جەنگێکی مەیدانی و دەستەویەخەوە بۆ جەنگێکی بەرگری، بە سەلیقە و داناییەکی ناوازە هەژمار دەکرێت. وەك لە سەرەوەشدا هەڵوێستەمان لەسەرکرد. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) هیچ تاکتیکێکی لەگەڵ دوژمندا دووبارە نەکردووەتەوە. ئەوەی لە خەندەقیشدا بینیمان هەر ئەوە بوو.

٢- خەندەق لەو جەنگەدا ڕۆڵێکی کاریگەری بینی لە بەربەرچدانەوەی

شاڵاوی دوژمن. چونکە قورەیش و هاوپەیمانانی هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەدەهات دووچاری ڕێوشوێنێکی سەربازیی وەها ببنەوە کە تەواوی خەملاندن و نەخشەکانی سەروژێر کردنەوە.

٣- هێشتنەوەی بەشێکی خەندەقەکە بە تەسکی تا سوارچاکە ئازاکان بتوانن لێوەی بپەڕنەوە، نموونەی بلیمەتی و زرنگییە. چونکە بەوە توانی ئازاترین و بەهێزترینی جەنگاوەرانی دوژمن بخاتە بۆسەوە. دەرەنجامی ئەوەش بە هەژانی وورەی دوژمن و بەرزکردنەوەی وورەی موسڵمانان کۆتایی هات.

٤- خودی پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە هەڵکەندنی خەندەقەکەدا بەشداری کرد. ئەوەش پاڵپشت و پشتگیرییەکی مەعنەوی بوو بۆیان. کاتێك تاشە بەردێکی گەورەش هاتە ڕێیان و نەیانتوانی بیشکێنن، ئەو "بسم اللّه"ی لێکرد و گورزێکی پێدا کێشا. لە ئەنجامی ئەو گورزەشدا بریسکەیەك شەوقی دایەوە و فەرمووی "اللّه أكبر! مژدەی ڕووخان و دەستبەسەرداگرتنی ئیمپراتۆریەتی فارسی ڕاگەیاند. پاشان بۆ دووەم جار لێی دایەوە و بریسکەیەکی تری لێ دەرچوو، فەرمووی "اللّه أكبر!" هەواڵی ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای ڕاگەیاند.[1]

ئەو فەرمایشتانەی لەو ڕۆژەدا لە زاری موبارەکی هاتنە دەر، ئەوەندە وزەی پێبەخشین، ئەگەر هەموو جیهان -نەك تەنها بیست و چوار هەزار کەس- گەلەکۆمەیان لێبکردنایە، دوودڵ نەدەبوون لەوەی بچن بە گژیاندا.

٥. هەڵبژاردنی حەزرەتی عەلی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو سوارانەی خەندەقەکەیان دەبەزاند، هەڵبژاردنێکی سەرکەوتوو بوو. هاوکات بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە زۆر چاك دەیزانی کێ هەڵدەبژێرێت و کەی هەڵی دەبژێرێت.

---

١. إبن سعد، الطبقات الكبرى ٤/٨٣-٨٤؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/١٠٠-١٠١.

٦. لە ڕوویەکی ترەوە، دوورڕووەکانی خستبووە ژێر چاودێرییەکی وردەوە، بە چەشنێك نەیاندەتوانی هیچ ئازار یان خراپەیەك بگەیەنن بە باوەڕداران، هەرچەندە زۆر حەزیان دەکرد و سەریشیان بۆی دەخورا. ئەوەش بۆخۆی نیشانەی لێهاتووییەکی مەزنە لە گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست بۆ دوورخستنەوەی زیانەکان.

٧. سەروەرمان (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەندەی لە توانایدا بووایە هەوڵی دەدا ماوەی جەنگەکە درێژ بکاتەوە، لەوەشدا سەرکەوتوو بوو. لێرەدا سوودەکانی ئەو درێژکردنەوەیە لە چەند خاڵێکدا کورت دەکەینەوە:

یەکەم: کات بەرەو وەرزی زستان دەڕۆیشت، چ قوڕەیش و چ هاوپەیمانەکانی خۆیان بۆ زستان ساز نەکردبوو. ئەگەر زیاتر بمانایەتەوە ئەوا زستان قڕی تێ دەخستن. خۆ ئەگەر گەمارۆشیان هەڵوەشاندایەتەوە و بڕۆیشتنایە، ئەوا هێز و وزەیان نەدەما و لاواز دەبوون.

دووەم: دوژمن ناچاربوو بەتەنگ سوپا بیست و چوار هەزار جەنگاوەرییەکەیەوە بێت و ڕۆژانە بەخێویان بکات. لەبەرئەوە هەتا ڕۆژێك زیاتر بمانایەتەوە، قەیرانی ئابووری زیاتر ڕووی تێدەکردن. هەرئەوەندەش کە برسێتی و سەرماوسۆڵە پێکەوە زۆریان بۆهێنان، ڕەوشەکە ئەوەندەی تر ناهەموار بوو.

سێیەم: چاوەڕێ نەدەکرا چیدی لەوە زیاتر هاوپەیمانێتی بەرەی دوژمن درێژە بکێشێت. چونکە ئەو هاوپەیمانێتییە لەسەر یەك بناغە ڕاوەستابوو، کە ئەویش بریتی بوو لە هاوبەشیکردن لە دوژمنایەتی پێغەمبەر و کیانی ئیسلام. بۆیە تا دەهات ڕایەڵەی کاری هاوبەش لاوازتر دەبوو. کەچی لەبەرامبەردا موسڵمانان ڕۆژ دوای ڕۆژ بەهێزتر و تۆکمەتر دەبوون.

چوارەم: بەرەی دوژمن چەندین سەرکردەی هەبوو، کەسیشیان نەیدەتوانی قسەکانی بدا بە گوێی ئەوانی تردا و وایان لێ بکات گوێڕایەڵی بکەن. ئەبوسوفیان هەر بەناو سەرکردەی سوپا بوو. بۆیە بە تێپەڕبوونی کات ناکۆکی و ململانێکان قووڵتر دەبوونەوە.

٨- نوعەیمی کوڕی مەسعود بەنهێنی موسڵمان بووبوو، پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئامۆژگاری کردبوو تاماوەیەك موسڵمانبوونی خۆی بشارێتەوە، چونکە هەندێك ئەرکی گەورە و هەستیاری پێسپاردبوو.

نوعەیم کەسایەتییەك بوو تەنانەت قورەیش و جولەکەکانیش ڕێزیان لێ دەگرت. پێغەمبەریش (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) پێی وتبوو کە جەنگ هونەری تاکتیکە و مۆڵەتی دابوو شێوازی تایبەتی خۆی لە گفتوگۆدا بەکاربهێنێت. ئەودبوو ڕۆیشت بۆلای هۆزی قورەیزە و پێی وتن "ئەی هۆزی قورەیزە. خۆتان دەزانن من چەندە ئێوەم خۆشدەوێت" وتیان "ڕاستدەکەیت، لەلای ئێمە هیچ تۆمەتێکت لەسەر نییە." وتی "قورەیش و غەطەفان وەك ئێوە نین، وڵات وڵاتی خۆتانە، سامان و ژن و منداڵتان ئێرەیە. ناتوانن دەستبەرداری ببن و بەجێی بهێڵن و ڕووبکەنە جێگەیەکی تر. قورەیش و غەطەفان هاتوون بۆ جەنگی محەممەد و هاوەڵانی، ئێوەش پشتگیریتان کردن. ئەوان خاك و ماڵ و منداڵیان لە جێگەی خۆیەتی و بارودۆخیان هاوشێوەی ئێوە نییە. ئەگەر نێچیرێکیان بینی پەلاماری دەدەن، خۆ ئەگەر دەستیان نەکەوت دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و ئێوە بۆ ئەو پیاوە بەجێ دەهێڵن. ئەگەر ئەویش بۆتان یەکلابێتەوە، ئێوە بەرگەی ناگرن. کەوابێ مەچنە پاڵ قورەیش هەتا بارمتەیەك لە پیاوماقوڵانیان لێ نەسێنن بۆ ئەوەی ببنە جێی متمانەتان. ئەوجا ئەگەر

شان بەشانی ئەوان جەنگی محەممەدتان کرد تا کۆتایی پێکەوە بن.“ ئەوانیش وتیان ”بەڕاستی پێشنیارەکەت پەسەندە.“

پاشان ڕۆیشت بۆ لای قورەیش و بە ئەبوسوفیان و سەرانی قورەیشی وت ”ئێوە دەزانن چەندە ئێوەم خۆشدەوێت و چەندەش دوژمنی محەممەدم. شتێکم بیستووە وام بەباش زانی بە ئێوەی بگەیەنم و ئامۆژگاریتان بکەم. بەس با لەنێوان خۆماندا بمێنێتەوە.“ ئەوانیش ڕازیبوون. وتی ”بزانن کە جولەکەکان پەشیمانن لەو ڕەفتارانەی بەرامبەر محەممەد کردوویانە. ناردوویانە بۆ لای و پێیان ڕاگەیاندووە پەشیمانین لەو کارانەی ئەنجامیان داوە. ئەوجا وتوویانە گەر لێیان خۆش ببێت ئەوا ئامادەن بۆ ڕازیکردنی چەند کەسایەتییەکی دیار لە هەردوو هۆزی قورەیش و غەطەفان بە بارمتە بگرن و بیدەنە دەستی تاوەکو بیانکوژێت. پاشان لەگەڵی دەبن تا ئێوە ڕیشەکێش دەکەن. محەممەدیش ڕەزامەندی خۆی بۆ دەربڕیون. جا ئەگەر هاتن بۆئەوەی بارمتەی مرۆییتان لێ داوا بکەن، هەرگیز وا مەکەن و کەسیان لەگەڵ مەنێرن!“

ئەوجا ڕۆیشت بۆ لای غەطەفان و هەمان هۆشیاریی پێدان. هەر کە جولەکە داوای بارمتەیان لێکردن، یەکسەر قورەیش و غەطەفان وتیان ”سوێند بێت قسەکەی نوعەیم ڕاست دەرچوو،“ هەواڵیان دا بە بەنی قورەیزە و وتیان ”بەخوا هیچ کەسی خۆمان تەسلیم بە ئێوە ناکەین. ئەگەر ئێوە دەتانەوێت جەنگ بکەن، فەرموون دەرچنە مەیدانەوە بۆ جەنگ.“ هۆزی قورەیزەش وتیان ”کەواتە ئەوەی نوعەیمی کوڕی مەسعود باسی کردووە ڕاستە،“ قورەیزە هەر سووربوون لەسەر داوای بارمتە، قورەیش و غەطەفانیش ملیان نەدا و بەوجۆرە خوا نێوانی تێکدان.[1]

---

١. ابن هشام، السيرة النبوية ٤/١٨٨-١٩٠؛ الطبري، تاريخ الأمم و الملوك ٢/٩٦.

تەنها چەند ڕۆژێك بوو نوعەیم موسڵمان بووبوو. جا تۆ بڕوانن بۆ کارزانی و سەلیقەی سەرداری مرۆڤایەتی (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ). ئەوەتا زانی کە نوعەیم دەتوانێت هەڵبستێت بەو ئەرکە گەورەیە و شایستەی ئەوەیە. هەروایش بوو.. نوعەیم بە باشترین شێوە ئەرکەکەی بەجێگەیاند.

٩. ڕەشەبا و گەردەلوولێکی بەهێز هەڵی کرد و دوژمنی تەواو هەراسان کرد. لەو نێوەندەشدا پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) حوزەیفەی کوڕی یەمانی ڕاسپارد تاکو بچێت زانیاری سەبارەت بە حاڵ و گوزەرانی دوژمن کۆبکاتەوە. حوزەیفە ڕازپارێزی پێغەمبەر بوو، بەوە ناسرابوو کە زۆر بەوردی فەرمانەکان جێبەجێ دەکات. کاتێك سەروەرمان ناردی بۆ ئەو ئەرکە، پێی وت "ئەی حوزەیفە! بڕۆرە ناویان بزانە چی دەکەن، هیچ شتێك ئەنجام مەدە تاکو دەگەڕێیتەوە."

حوزەیفە بەنهێنی دزەی کردە ناو چادرەکانیان. تەنانەت هەلی ئەوەی بۆ ڕەخسا ئەبوسوفیان بکوژێت. چونکە لەوکاتەدا ئەبوسوفیان پشتی لەو بوو. لە دڵی خۆیدا وتی "تیرێکی لێ بدەم و بیکوژم!" بەڵام ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەری بیرکەوتەوە. کە هیچ شتێك نەکات تاکو دەگەڕێتەوە. بۆیە دەستی لەو نیازەی هەڵگرت. ئەبوسوفیان هەر هاواری دەکرد "دەڕۆین.. دەڕۆین!" ئاشکرابوو کە قوڕەیش و هاوپەیمانەکانی خۆیان ساز دەکرد تاکو بە شکست و دۆڕاوی بگەڕێنەوە.[1]

قورئانی پیرۆز حاڵی پەژموردەیی بێباوەڕانمان بەمجۆرە بۆ وێنا دەکات:

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/١٩٠-١٩١؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/١١٤-١١٥.

﴿ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُواْ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴾

(الأحزاب: ٢٥)

"خوا کافرانی تێکشکاند و بە خۆیان و کینە و بوغزیانەوە گێڕانیەوە دواوە، هیچ جۆرە خێرێکیان دەست نەکەوت. هەر خوا خۆی باوەڕدارانی لە جەنگ پاراست. جا هەمیشە و بەردەوام خوا بەهێزە و بەدەسەڵاتە."

حوزەیفە لەکاتی گەڕانەوەیدا چەند سوارێکی بینی کە مێزەر و پۆشاکی سپییان لەبەردابوو، بەناو بێباوەڕاندا دەگەڕان. یەکێکیان بە حوزەیفەی وت "بە هاوەڵەکەت بڵێ خوا ڕزگاری کرد." کاتێك حوزەیفە ئەو ڕووداوەی بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە، سەرووەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی "ئەوانە فریشتە بوون."[1]

١٠. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بەبەردەوامی جڵەوی کاروبارەکانی لە دەستی خۆیدا دەهێشتەوە. بەدرێژایی ڕۆژانی گەمارۆ بۆساتێك بەرەی جەنگی بەجێ نەهێشت، وەك هەریەکێك لەوان ڕەفتاری دەکرد، هاوبەشی سوپای دەکرد لە هەموو گرفت و ساتە سەختەکانیدا. ئەوەش دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە سەرکردایەتیی ئەو هەمیشە لە لوتکەدا بووە.

١١. کۆی شەهیدی موسڵمانان لەو جەنگە سەختەدا تەنها شەش شەهید بوو.[2]

١٢. پێغەمبەری سەرووەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لەکۆتایی جەنگدا فەرمووی "الآنَ نَغْزُوهُمْ وَلا يَغْزُونَا (ئیدی لەمەودوا ئێمە هێرش دەکەینە سەریان و

---

١. إبن كثير، البداية و النهاية ٤/١١٧.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٣/٢١٤؛ الواقدي، المغازي ٢/٤٩٦.

ئەوان ناتوانن هێرشمان بۆ بهێنن.)»[1] پێشهاتەکانی ڕۆژگاریش ڕاستیی ئەو فەرمایشتەیان سەلماند.

هەرکات باسی جەنگی خەندەق دەکرێت، دوو ڕووداوی گرنگ دێنە پێش کە ناکرێت فەرامۆش بکرێن؛ یەکەمیان بریتییە لە وەفاتی هاوەڵی گەورە و سەرداری ئەنصارەکان، سەعدی کوڕی موعاز (رضي الله عنه).[2] ئەوی تریشیان بریتییە لەوەی کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە کاتی جەنگەکەدا چوار نوێژی فەرزی بە "قەزا" کردووە.[3]

لە ڕووداوی یەکەمدا سەعدی کوڕی موعاز شانی بریندار بوو، خوێنی نەوەستایەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وعلى آله وصحبه وسلم) بایەخی تەواوی پێدا و لەناو مزگەوتدا دەوارێکی بۆ هەڵدا و بەردەوام سەری لێ دەدا. خەڵکی تریش سەردانیان دەکرد و لەگەڵی دەمانەوە. چونکە لەوکاتەوەی موسڵمان بووبوو، بۆ تەنیا جارێکیش لە پێغەمبەری نازدار (صلوات الله وسلامه عليه) جیا نەبووبووەوە. لەدیدی سەرووەردا سەعد کەسایەتییەکی نایاب و دانسقە بوو. بۆیە کاتێك وەك دادوەر لە پرسی هۆزی قورەیزەدا دەستنیشانکرا، بەبرینداری بەسەر کەژاوەوە هێنرا. جارێکی دیکە پێشتر جارێك کە سەعدی کوڕی موعاز هاتبووە نێو کۆڕی پێغەمبەرەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێشتر بە خەڵکەکەی فەرموو "قُومُوا إلى سَيِّدِكُمْ (لەبەر گەورە و سەردارتان هەستن!)" لەبەر ڕێزی سەعدی کوڕی موعاز ئەو کەسانەی کە لەوێ بوون هەستانە سەرپێ سەعد هەرگیز درێغی نەکرد لە وەفاداری و دڵسۆزی. بەو ئیخلاص و ئەمەکەوە ژیا،

---

١. صحيح البخاري، المغازي ٢٩؛ أحمد بن حنبل، المسند ٤/٢٦٢؛

٢. صحيح البخاري، المغازي ٣٠؛ صحيح مسلم، الجهاد ٦٥، ٦٨؛ ابن هشام، السيرة النبوية ٣/٢١٣-٢١٤.

٣. أحمد بن حنبل، المسند ١/٣٧٥.

هەر بەوجۆرەش ڕۆحی پاکی سپارد. هەر سەعد بوو ڕۆژێك بە پێغەمبەری وت "سیلەی ڕەحمی کێ دەگەیەنیت بگەیەنە. پەیوەندی لەگەڵ کێ دادەبڕیت دایبڕە، دوژمنایەتیی کێ دەکەیت بیکە، ئاشتی لەگەڵ کێ بەرپا دەکەیت بیکە. چەندت دەوێت لە سامانمان وەری بگرە، چەندە سامان دەبەخشیت ئارەزووی خۆتە پێمان ببەخشە. ئەوەی لێمان وەردەگریت لەوە پێمان خۆشترە کە بۆمان بەجێ دەهێڵیت. هەر فەرمانێك دەفەرموویت بیفەرموو، ئێمە شوێن فەرمانت دەکەوین. سوێند بە پەروەردگار ئەگەر بڕۆیت هەتا غیمادیش لەگەڵت دێین."[١]

لە دوا هەناسەکانیدا دوعای دەکرد و دەیفەرموو "پەروەردگارا! خۆت دەزانی چەندە حەزم لە جیهادە لەگەڵ ئەوانەی پێغەمبەرەکەی تۆیان بەدرۆخستەوە و دەریان کرد. خوایە من پێم وایە ئیدی جەنگت لەنێوان ئێمە و ئەواندا نەهێشتووە. جا ئەگەر شتێك لە جەنگی قوڕەیش ماوە ئەوا بمهێڵەوە بۆی هەتاکو لە پێناوتدا تێبکۆشم. خۆ ئەگەر جەنگیشت لەنێوانماندا نەهێشتووە، ئەوا شەهیدیم بەنسیب بکە، هەروەها ڕۆحم مەکێشە هەتا چاوم بە شکستی هۆزی قوڕەیزەش دەکەوێت."[٢] ئەوە بوو بەو برینەی لەجەنگی خەندەقدا پێی بریندار بووبوو، شەهید بوو. ئەو بۆ گەیشتن پەلەی کردبوو لە گەیشتن بەجەنگدا و بەهۆی ئەوەی کە زرێپۆشەکەی بەری بۆی بچوک بوو، شانی لەدەرەوە مابوویەوە، تیرێکی بەدبەخت بەر ئەو شانەی دەکەوێت و برینداری دەکات. برینێك کە سینەی ئیمەشی بریندار کردووە و پاشان بەهۆیەوە بەرەو لای پەروەردگاری گەڕاوەتەوە.

---

١. إبن أبي شيبة، المصنف ٣٥٣/٧؛ إبن كثير، البداية و النهاية ١٦٢/٣.

٢. صحيح البخاري، المغازي ٣٠؛ صحيح مسلم، الجهاد ٦٧.

جەنگ کۆتایی هات و پێغەمبەریش (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. بەڵام هەرکە قاچی خستە ئەودیو دەرگا، یەکسەر جوبرەئیل دەرکەوت و لێی پرسی "ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چەکت داناوە؟!" ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی"بەڵێ!" ئەوجا جوبرەئیل فەرمووی "بەڵام فریشتەکان هێشتا چەکیان دانەناوە. ئێستاش تەنها بۆ ڕاوەدوونانی ئەو هۆزە گەڕاوینەتەوە. ئەی محەممەد! خوا فەرمانت پێدەکات کە بڕۆیت بۆ ویژەی هۆزی قورەیزە."[1] دوا بەدوای ئەوە پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ عَلَيْهِ) فەرمانی کرد ڕاستەوخۆ بەرەو قورەیزە بکەونە جوڵە. جا بۆ ئەوەی بایەخی ئەو هەڵمەتەیان بۆ ڕوون بکاتەوە، فەرمانی پێکردن نوێژی عەسر لەوێ بکەن.[2]

هۆزی قورەیزە بەتایبەتی لەکاتی جەنگی خەندەقدا ناپاکییان بەرامبەر موسڵمانان نواندبوو و ویستبوویان لەپشتەوە خەنجەریان لێبدەن. ئەوەبوو ویستیان دەستدرێژی بکەنە سەر ئەو پەناگەیەی ئافرەت و منداڵی موسڵمانانی لێبوو. بەڵام هەلی ئەوەیان بۆ نەڕەخسا. ئەگەرچی پەیمان و ڕێککەوتنیان لەگەڵ پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەستبوو، بەڵام پەیمانیان شکاند و جاڕی جەنگیان دا دژی موسڵمانان.

تاوانکارییان هەر بەوەوە نەوەستا، بەڵکو قەڵا و سەنگەرەکانیان خستە سەرپشت بۆ پەنادانی نەیارانی ئیسلام، بەتایبەت حوییەی کوڕی ئەختەب کە یەکێك بوو لەوانەی لەلایەن موسڵمانانەوە دوورخرابووەوە. لەڕاستیدا ئەم ڕەفتارەیان پەیمان شکێنییەکی ئاشکرا بوو.[3]

---

١. صحيح البخاري، المغازي ٣٠؛ صحيح مسلم، الجهاد ٦٥.

٢. صحيح البخاري، المغازي ٣٠؛ إبن هشام، السيرة النبوية ١٩٢/٤.

٣. إبن هشام، السيرة النبوية ٢٠٠/٤-٢٠١.

سەرباری هەموو ئەوانەش، خۆ ئەگەر ئەو کاتەی پێغەمبەر (صَلَّیٱللهُعَلَیْهِوَسَلَّمْ) چوو بۆیان داوای لێبووردنیان بکردایە، لەوانەبوو چاوپۆشی لێ بکردنایە. چونکە ئەو هەمیشە لایەنداری ئاشتەوایی و پێکەوەژیان بوو. کەچی ئەوان هەڵوێستی دوژمنکارانەیان دژی موسڵمانان گرتە بەر. لەبەرئەوەی بەدخوازی لەناو کرۆکی دڵیاندا هێلانەی کردبوو. بۆیە کاتێك دەستیان لە هەموو شتێك دەرچوو، خۆیان دا بەدەستەوە. بەڵام بەمەرجێك کە سەعدی کوڕی موعاز ببێتە دادوەر لەنێوانیاندا. پێغەمبەریش (عَلَیْهِأَفْضَلُصَلَاةٍوَسَلَامٍ) ئەو مەرجەی قبووڵکردن. سەعدی کوڕی موعاز لەسەر جێگای نەخۆشی هەڵسا و بە سواری ولاغێك هات بۆ ئەو جێگەیەی کە چاوەڕوانیان دەکرد. پێغەمبەر (صَلَوَاتُٱللهِعَلَیْهِ) پێی فەرموو "ئەوانە بە حوکمی تۆ ڕازین." ئەویش حوکمی تەوراتی بەسەردا دان؛ پیاوانیان بکوژرێن و سامانیان بەش بکرێت و ژن و منداڵیان بەدیل بگیرێن. هەردوولا هیچیان بۆ نەمایەوە جگە ئەوەی بڕیارەکە قبووڵ بکەن.[1] ئیتر بەوجۆرە مەدینە لەسەر کەناری هەڵدێرێکی ترسناك گەڕایەوە و ئارامی و ئاسایش باڵی کێشایەوە بەسەر شارە ئارامەکەدا.

---

١. صحيح البخاري، المغازي ٣٠؛ إبن هشام، السيرة النبوية ١٩٩/٤.

## ٨. غەزاکانی تر

ژمارەی ئەو غەزایانەی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) بەشداری تێدا کردوون، نزیکەی هەژدە غەزا دەبن. لە بڕگەکانی ڕابردوودا بەکورتی چووینە خزمەت سێ لەو غەزایانە و، هەوڵماندا تێڕوانینێك سەبارەت بە ڕەهەندی سەربازیی پێغەمبەر لای خوێنەری هێژا دروست بکەین.

ئێستاش لە چەند کورتە دێڕێکدا ئاماژە بە چەند غەزایەکی تر دەکەین تاکو لەو دەلاقەیەوە مەزنی و بێهاوتایی سەروەرمان لە مەیدانی سەربازیدا ببینین:

لە ڕێککەوتنی حودەیبییەدا بینیمان چۆن بە توانستە کارگێڕییەکەی خۆی توانی گرفتە ئاڵۆسکاوەکان چارەسەر بکات. هەموو لایەك تەواو دڵنیابووبوون لەوەی کە لە حودەیبییەدا جەنگێك دەقەومێت. بەڵام ئەو بە چاودێری و کۆمەکی خوایی، شکستێکی یەکلابووەوەی گۆڕی بە دەروازەی سەرکەوتنێکی مەزن و، توانی خۆی لابدات لە جەنگێك کە هیچ هاوسەنگییەك لەنێوان جەمسەرەکانیدا نەبوو. سوپای دوژمن چەند قاتی موسڵمانان دەبوو و لەژێر فەرمانی کۆمەڵە سەرکردەیەکی سەربازیی لێهاتووی هاوشێوەی خالیدی کوڕی وەلید و عیکریمەدا بوو. لەبەرامبەردا ژمارەی موسڵمانان تەنها هەزار و شەش سەد کەسی بێچەك بوون، ئەوانیش ئیحرامیان بەستبوو و بەنیازی عەمرە هاتبوون.

وەك ئاشکرایە حودەیبییە لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا ڕوویدا. واتە لەو سەروەختەدا بوو کە هەستی تامەزرۆیی و ئەوینی مەککە باڵی بەسەر دڵ و دەروونی موهاجیراندا کێشابوو. تەنانەت کەسێکی وەك حەزرەتی ئەبوبەکر کە

خاوەنی ئیرادەیەکی پۆڵایین بوو، جودایی مەککە ئاخی هەڵقرچاندبوو. تەنانەت کەوتبووە بەددوعا لەوانەی تاڵاوی ئاوارەییان پێچەشتبوو.[1]

هەروەها بیلالی حەبەشی، لەگەڵ ئەوەدا کە خەڵکی مەککەش نەبوو، کەچی کە کۆچی کرد بۆ مەدینە لەوێ نەخۆشکەوت. بەدەم "تا"وە وڕێنەی دەکرد و دەیوت "ئەی مەککە، تۆ بڵێیت جارێکی تر بە دیدارت شاد ببمەوە!"

تاسە و پەرۆشیی مەککە (أُم القُرى) بەسەر دڵی هەمواندا زاڵبوو. ئەوە شەش ساڵە نەیانتوانیوە تەوافی کەعبە بکەن، ئەو کەعبەیەی کە ئیبراهیمی باپیریان (عَلَيۡهِ السَّلَام) هەڵیسابوو بە ئاوەدانکردنەوەی:

﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيۡتٖ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكٗا وَهُدٗى لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾

(آل عمران: ٩٦)

"بەڕاستی یەکەم خانە و ماڵ و مەنزڵگەیەك کە بۆ خەڵکی دانرا لەسەر ڕووی زەوی (بۆ خواپەرستی)، ئەوەیە کە لە مەککەدایە، کە پیرۆزە و هیدایەت و ڕێنموونی بەخشە بۆ هەموو خەڵکی جیهان."

ئەو کەعبەیەی ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ دەکات، یەکەم بینا بووە لەسەر زەوی، یەکەمین پێغەمبەر کە حەزرەتی ئادەمە (عَلَيۡهِ السَّلَام) بنیاتی ناوە و ئیبراهیمی خەلیلیش نۆژەنی کردووەتەوە. دەی ئەوە شەش ساڵی ڕەبەقە بێباوەڕان باشترین نەوەی ئیبراهیم، کە حەزرەتی محەممەد موستەفایە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيۡهِ)، دووریان خستووەتەوە لێی و ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە ناتوانێت تەوافی بکات. خۆ داوای شتێکی زۆری نەدەکرد، تەنها ئەوەندەی دەویست کە ڕێگە بدرێت بە خۆی و یارانی تا بەوجۆرەی ئیسلام دایناوە تەوافی ماڵی خوا بکەن.

---

١. صحيح البخاري، مناقب الأنصار ٤٦.

لەو ڕۆژگارەدا کەعبە پڕبوو لە بت. لە دەوروبەریشیدا چەندین بت ڕیزکرابوون. تەوافی بتپەرستان بەدەوری کەعبەدا بووبووە گاڵتەجاڕی و هیچ واتایەکی تێدا نەمابووەوە. خوای باڵادەست وەسفی تەوافی بێباوەڕان بەوە دەکات کە "مُكَاءً وَتَصْدِيَةً (تەنها چەپڵە و فیکەکێشان)"[1] بووە. پیاوەکانیان چەپڵەیان لێ دەدا و فیکەیان دەکێشا. ژنەکانیشیان بە شەودا بەڕووتی تەوافیان دەکرد و پۆشاکیان دادەکەند بە بیانووی ئەوەی دروست نییە بەو جلانەوە تەواف بکەن کە گوناهیان پێوە کردوون.[2] ئەوە سیمای تەوافی پیاوان و ژنانی ئەو سەردەمە بوو کە تێگەیشتنی بەلای ئێمەوە تا بڵێیت دژوارە.

پێغەمبەری سەروەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) دەیویست ئەوە ڕوون بکاتەوە کە چۆن تەواف دەکرێت و بە چ شێوەیەك عەمرە بەجێ دەهێنرێت. ئەوە مەبەستی یەکەمی بوو. دووەمیان دەیویست بیسەلمێنێت کە کەعبە بەتەنها موڵکی خەڵکی مەککە یان قورەیشییەکان نییە، بەڵکو خەڵکانی تریش مافیان پێوەی هەیە. ئەخوازەڵا حەزرەتی محەممەد و یارانی کە شان و شکۆیان بۆ کەعبە دەگەڕاندەوە و، لە هەمووان زیاتر مافیان بە کەعبەوە هەبوو.

لەبنەڕەتدا کەعبە وەك میحرابێك وابوو کە دەتوت لە مینبەرەکەی جیابووەتەوە. پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) دەیویست ئەو مینبەرەی لە مەدینە دایابوو، بهێنێتە پاڵ میحرابەکەی. چونکە کەعبە میحرابی هەمیشەیی ئێمە و، بەر لە هەموو کەسێکیش میحرابی حەزرەتی محەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) بوو. بۆ ماوەیەك لە نوێژدا ڕووی لە مزگەوتی ئەقصا دەکرد، چونکە کەعبە بتی تێدا بوو. بەڵام چاوانی هەر بە ئاسماندا

١. بڕوانە: سورەتی الأنفال، ئایەتی ٣٥.

٢. صحيح مسلم، التفسير ٢٥؛ النسائي، المناسك ١٦١.

دەگێڕا، چونکە بەرگەی ئەوەی نەدەگرت ڕوو لە کەعبە وەربچەرخێنێت. خواش دڵی خۆشکرد و مزگێنی پێدا:

﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴾

(البقرة: ١٤٤)

"(ئەی پێغەمبەر) بەڕاستی چاوگێڕان و هەڵسووڕانی ڕوخسارت ڕوو بە ئاسمان دەبینین (کە بە هیوای ڕووگەیەکی تایبەتیت. ئێمەش ئاگاداری نیازی دڵت بووین). سوێند بەخوا ئێمەش ڕووت وەردەچەرخێنین بۆ ڕووگەیەك پێی ڕازی و خۆشنوود بیت. دەسا ڕووت وەربچەرخێنە بەرەو لای کەعبە (المسجد الحرام) و ئێوەش ئەی موسڵمانان لە هەرکوێ بوون. بەرەو لای ئەوێ ڕووتان وەربچەرخێنن. بەڕاستی ئەوانەش کە کتێبیان پێگەیشتووە (لە گاور و جولەکە) چاك دەزانن کە (ئەم گۆڕانی ڕووگەیە) حەقیقەت و ڕاستییە و فەرمانی پەروەردگاریانە (لە تەورات و ئینجیلدا ئاماژەی بۆ کراوە) و خوا هەرگیز بێئاگا نییە لەو کار و کردەوانەی ئەنجامی دەدەن."

ئەو ماوەیەی بۆ نوێژکردن ڕووی لە مزگەوتی ئەقصا دەکرد، سەبارەت بە ئەو ماوەی ئاوارەیی و هیجران بوو. چونکە کەعبە میحراب و، مەدینەش مینبەری بوو. مەدینە بەتەنها بوو. ئەوکاتە پێشەوایەتی ئیمام تەواو دەبوو کە دوانگە ببرایە بۆلای میحراب. لەبەرئەوە زۆر پێویست بوو کەعبە لەژێر دەسەڵاتی موسڵماناندا بێت.

بەجێهێنانی عەمرەش هەنگاوی یەکەم بوو بەو ئاڕاستەیەدا. بۆیە نەخشەی دەکێشا بۆ ئەنجامدانی عەمرە، عەمرەیەك لەسەر شێواز و بیروباوەڕی ئیسلامی. ئەودەم هێشتا حەج فەرز نەکرابوو. لە ساڵانی کۆتایی ژیانیدا حەج

فەرزکرا. بۆیە تەنها یەکجار حەجی کردووە، قورئانی پیرۆزیش ئەو حەجەی ناوناوە "حەجی ئەکبەر"[1]، عەمرەکەش "حەجی ئەصغەر".

لەناو خەڵکدا وا باوە گوایە حەجی ئەکبەر ئەو حەجەیە کە تێیدا ڕۆژی عەرەفە بکەوێتە ڕۆژی هەینیەوە، هەر چەندە کۆبوونەوەی ڕۆژی هەینی و عەرەفات شتێکی جوان و پیرۆزە، بەڵام لەڕاستیدا حەجی ئەکبەر (حەجی گەورە) بەو حەجە دەوترێت کە لە وەرزی حەجدا بەجێ دەهێنرێت، حەجی ئەصغەریش (حەجی بچوک) بە عەمرە دەوترێت.

ئامانجی سێیەمی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەبوو کە کۆمەڵی پیرۆزی هاوەڵانی دەربخات بۆ هۆزەکان. ئەو کۆمەڵەی کە کاتێك بە ڕێگەدا دەڕۆن، ئازاری کەس نادەن و زیان بەکەس ناگەیەنن. ناچنە ناو باخ و بێستانی کەس و، ماڵ و موڵکی کەس تاڵان ناکەن.

بەڵێ، تاکو هەمووان بۆیان دەربکەوێت کە ئەو سوپایە دوورە لەو ئاکارانەوە. ئاخر لەوسەردەمەدا وا باوبوو سوپاکان کاری تاڵانی و بڕۆیی ئەنجام بدەن. بەڵام ئەمەیان سوپای ئارامی و متمانە بوو. لەو حەجەدا و لەبەرچاوی هەموو عەرەبدا نوێنەرایەتی ئیسلامیان دەکرد. دیارە ئەوەش شتێکی زۆر گرنگ بوو. هاوکات هەڵگری ئەو واتایەش بوو کە ئایینی ئیسلام خاوەنی پەیامێکی سەرتاسەرییە. چونکە ئەوانەی چاویان پێیان دەکەوت، لە دڵی خۆیاندا دەیانوت "ئەوانە چین؟ ئێمە تا ئێستا مرۆڤی لەو جۆرەمان نەدیوە. هەبێ و نەبێ ئەوانە فریشتەن!"

جا ئیتر سەروەرمان بەو نیازەوە ڕێگەی مەککەی گرتە بەر. بۆیە هاوەڵان

1. بڕوانە: سورەتی التوبة، ئایەتی ٣.

هەر یەك لە شمشێرێك زیاتریا پێنەبوو. هەتا گەیشتنە حودەیبییەش هیچ ڕووی نەدا. لەوێدا کەسانێك هاتن و پێیان ڕاگەیاندن کە قوڕەیش بە هەرچی هێز و خەڵکیەوە هەیە خۆیان سازداوە و ناهێڵن بچنە ناو مەککەوە...[1]

سومبولی هێوری و ئارامی، لایەنداری بەرەنگاربوونەوە و پێکدادان نەبوو، لە بنەڕەتیشدا بۆ ئەو مەبەستە نەهاتبوو. بۆیە ئەو هەڵوێستە بووە مایەی پەژارە بۆی. ئاخر ئەو بەڵێنی دابوو بە یارانی کە عەمرەیان پێ بکات. ئەوانیش بەو جۆش و تاسەمەندییەوە کە بۆ یەکەمجارە بەگوێرەی دەستوورەکانی ئیسلام عەمرە ئەنجام دەدەن و یاوەری پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) دەکەن لەو گەشتەدا، ئەو هەموو ڕێگەیەیان بڕیبوو. ئەوەی پێشتر لە تاڤی نەفامیدا ئەنجامیان دابوو، نە حەج بوو نە تەواف. بەڵام وا ئێستا بەپێی ڕێساکانی ئیسلام و لەژێر ڕابەرایەتی نیگای ئاسمان و لە پشت سەری باشترینی خەلقەوە لە ئەنجامدانی ئەو سرووتانە نزیکبوونەتەوە.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ناچاربوو لە حودەیبیە بوەستێت. ئەمە وێڕای متمانەی تەواوی بە باوەڕی خۆی و نەبەردیی هاوەڵانی. دڵنیاشبوو کە ئەگەر پەنا بباتە بەر خوا و پشتی پێ ببەستێت و بکەوێتە جەنگ لەگەڵیان، بەسەریاندا سەردەکەوێت. بەڵام ئەوەی نەکرد و وای بەباش زانی چاوەڕوان بێت. وەختێ کۆسپ و تەگەرەکانیش گەیشتنە قۆناغێکی دژوار و نالەبار، دەمودەست بەیعەتیان دا کە هەتا مردن لەپێناو ئیسلامدا بجەنگێن.[2] ئەوە ئەو بەیعەتە بوو کە خوای باڵادەست لە سەرووی حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە پیرۆزی کرد و فەرمووی:

---

١. صحيح البخاري، المغازي ٣٥.

٢. صحيح مسلم، الجهاد ١٣٢.

﴿ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾

(الفتح: ١٨-١٩)

"سويند بەخوا بەڕاستی خوا ڕازییبووە لەو باوەڕدارانەی کاتێك پەیمانیان لەگەڵدا بەستیت لەژێر درەختەکەدا، خوا خۆیشی ئاگاداربوو بەوەی لە دڵەکانیاندا هەیە (لە نیازپاکی و دڵسۆزی) هەربۆیە ئارامی و هێمنی و ئاسوودەیی دابەزاندە سەریان و پاداشتی بە مژدەی سەرکەوتنێکی نزیك دانەوە. هەروەها بەڵێنی چەندین دەستکەوتی زۆری پێدان کە لە ئایندەدا دەستیان دەکەوێت و وەری دەگرن، خوا هەمیشە و بەردەوام باڵادەستە بەسەر خوانەناساندا و دانایە و دەزانێت چ کاتێك ئیمانداران سەردەخات."

خوا دەیزانی چی لە دڵیاندایە، ئەگەر پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَالسَّلَامِ) فەرمانی پێ بکردنایە بمرن، ئەوا دەمردن. ئەگەر بیوتایە بمێننەوە، ئەوا دەمانەوە. ئەگەر پێی بوتنایە هەڵسن و تەوافی کەعبە بکەن، ئەوا ئەگەر چەکیشیان پێ نەبووایە، هەرچۆنێك بووایە فەرمانەکەیان بەجێ دەگەیاند.

خوا ئارامی نارد بۆ سەریان، لە پاداشتی ئەو جوامێرییەیاندا پەیمانی فەتحێکی نزیکی پێدان، لە قورئاندا ئاوەهای پێ فەرموون.

لە حودەیبییەدا تەنها شتێك هەبوو بەوشێوەیە نەهاتەپێش کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەتەمای بوو. ئەویش پاش ساڵێك دواتر دەهاتەدی، ئەوەبوو هاتیشەدی: دواجار هاتن بۆ مەککە و بەگوێرەی دروشمەکانی ئیسلام تەوافیان کرد و "بەردەڕەشەکە"یان ماچکرد. جگە لەوە هەموو ئاواتەکانیان هاتەدی. خەڵکی بیابان شایەتییان دا و دڵنیابوون کە ئەو سوپایە بە هەرشوێنێکدا گوزەر

بکات، ئارامی و ئاشتی و متمانە لەگەڵ خۆیدا دەچێنێت. سوپاکە لەسەر گەشتەڕێیان بەلای چەندین ئاوەدانی و دەوارنشیندا تێپەڕین و بە خەڵکانێکی زۆر ئاشنابوون. لەپاش دوو سێ ساڵیش ئەو تۆوانەی لە دڵی خەڵکیدا چاندبوویان هاتنەبەر.

بەڵێ، زۆرێك لەو خەڵکە پاش دوو سێ ساڵ لەو ڕووداوە موسڵمان دەبوون و، بە یاوەریی ئەو خۆشەویستە دەکەوتنە ڕێ بۆ فەتحی مەککە. ئیدی بەوجۆرە قورەیش و سەرجەم خوانەناسان بۆیان دەرکەوت کە کەعبە بەتەنها موڵکی ئەوان نییە. بەڵکو تەواوی مرۆڤایەتی و لەپێش هەموو کەسێکیشەوە مایەی شانازیی بوونەوەران، حەزرەتی محەممەد موستەفا (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) و کۆمەڵەکەی مافیان هەیە پێوەی.

لە ڕاستیدا قورەیش هەر لە ڕێککەوتننامەکەی حودەیبیەدا دانی بەو مافەدا نابوو و واژووی لەسەر ئەو پەڕەیە کردبوو کە واژووی پێغەمبەری پێوەبوو. ئەوەبوو بەمجۆرە گوزارشتیان لە مەرجەکەیان کرد "تۆ ئەمساڵ دەگەڕێیتەوە و نایەیتە ناو مەککەوە. بۆ ساڵی داهاتوو ئێمە مەککە چۆڵ دەکەین و تۆ و یارەکانت دێنە ناوی و سێ ڕۆژ دەمێننەوە. تەنها چەکی سوارتان پێ دەبێت و شمشێر لەناو کێلاندا دەبێت و هیچی تر لەگەڵ خۆتان ناهێنن."[1]

ئەمە لەهەمان کاتدا دانپێدانان بوو بە کیانی موسڵماناندا. لەکاتێکدا تا ئەو سەردەمە بانگەشەی ئەوە دەکرا کە مەککە و کەعبە موڵکی بت پەرستانن، بە تایبەتی قورەیش. هۆزەکانی تری نیمچە دوورگەی عەرەبیش تا ڕادەیەك خۆیان ڕادەستی ئەو ڕاستییە سەپێنراوە کردبوو.

١. إبن كثير. البداية و النهاية ٤/١٩٢-١٩٣.

هەرکەسێك بهاتایەتە ناو مەککەوە دەبووایە ملکەچی ئەو سرووت و دروشمە ئایینییانە بووایە کە بتپەرستان دایان نابوون. هیچ کەسیش مافی ئەوەی نەبوو ڕێوشوێنی تایبەت بەخۆی پەیڕەو بکات. کەچی یەکێك لە مەرجەکانی ڕێککەوتننامەی حودەیبیە بریتی بوو لە ئازادیی موسڵمانان لە بەجێهێنانی حەج و تەواف بەدەوری کەعبەدا لەسەر شێوازی تایبەتی خۆیان. ئیتر بەوشێوەیە پێغەمبەر (عَلَيهِ أفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) بە (١٦٠٠) لە هاوەڵانیەوە بەرامبەر بە سوپایەکی زەبەلاحی دە هەزار جەنگاوەر سەرکەوتنی بەدەستهێنا. ئەمە فەتحی دەرگای دڵان و خۆناساندن بوو بە خەڵکی.

هەر بۆ نموونە، عوروەی کوڕی مەسعود و سوهەیلی کوڕی عەمر بە نوێنەرایەتیی قوڕەیش بۆ دانوستان هاتنە لای پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم). جا کاتێك نوێنەرەکان گەواهیدەری هۆگری و پەیوەستی هاوەڵان بوون بە پێشەواکەیانەوە، هەروەها بەچاوی خۆیان حاڵەتەکانی پێغەمبەرایەتییان پێوە بینی کە چەندە لەخواترس و خواناسە، هەموو ئەمانە بە قووڵی کاری تێکردن و، شەختە سەهۆڵی ویژدانیان تووایەوە و، گۆشەی نیگایان گۆڕا و بوونە پاڵێوراو تاکو لە نزیکترین کاتدا ئیسلام قبووڵ بکەن. بۆیە لە گەڕانەوەیاندا هەڵوێستی ڕەق و وشکی قوڕەیشیان بەرامبەر موسڵمانان ڕەواندەوە.[1]

بەوجۆرە، خەسڵەتی نەرمونیانی کە لە ئاکاری موسڵمانانە و، خەسڵەتی ڕەقی و لاساری و دەمارگیریش کە تایبەتمەندیی بێباوەڕانە، بووە هۆی گۆڕانکاری لە هەڵوێستی هەندێکدا و چەند نموونەیەکی زیندووش لەوبارەیەوە هەن.[2]

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٣٢٩/٤-٣٣٠،إبن سعد، الطبقات الكبرى ١٩٦/٢.

٢. بۆ نموونە بڕوانە: إبن هشام، السيرة النبوية ٢٧٩/٤-٢٨٠.

بەڵێ، سەرگەردان و سەرسامەکان یەك لەدوای یەك پەنایان دەبردە بەر هەرێمە پڕ ئاسوودەییەکەی پێغەمبەر (صَلَّىاللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ). ڕەنگە حودەیبیە لە ڕووکەشدا جۆرێك بووبێت لە پاشەکشە، بەڵام لەڕاستیدا سەرکەوتنێك بوو چەندین بەروبوومی لێکەوتەوە. لەسایەی ئەو ڕێککەوتنەدا موسڵمانان بێخەم بوون لە شەڕ و خراپەی قوڕەیش. لەو نێوەندەشدا هاوپەیمانییەك پێکهات: هۆزی "بیکر" لەگەڵ قوڕەیش و، هۆزی "خوزاعە"ش لەگەڵ موسڵمانان هاوپەیمانێتییان بەست. ڕێککەوتنەکەش وەها بوو کە هیچ لایەك هێرش نەکاتە سەر لاکەی تر. بێگومان ئەوەش لە بەرژەوەندی موسڵمانان بوو. چونکە دە ساڵ ئاشتی لە بیاباندا بەرقەرار دەبوو و، دەرفەتی ئەوە دەرەخسا لەو ماوەیەدا سەدای ئیسلام بدرێت بە گوێی چەندین هۆز و تیرەدا.

## أ. خەیبەر؛ سەری مارەکە

هەرکە پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لە حودەیبیە گەڕایەوە، دەستبەجێ بەرەو خەیبەر کەوتەڕێ. خەیبەر وەك مۆڵگەی ئاشووب وابوو. جولەکەکان لەوێدا سەرگەرمی ئاژاوەگێڕان بوون و هەرجارەو لەگەڵ بەرەیەکدا دەستیان تێکەڵ دەکرد. جارێك لەگەڵ هۆزی نەضیر و جارێك لەگەڵ غەطەفان و جارێك لەگەڵ قوڕەیشدا. بەردەوام پیلان و ئاشووبیان دژی موسڵمانان دەگێڕا و نەخشەیان دادەنا بۆ لەناوبردنیان. هەر ئەوان قوڕەیشیان هەڵدەنا و دەستیشیان لە بەرپاکردنی جەنگی ئوحود و خەندەقدا هەبوو.

ئیدی کاتی تەمێکردنیان هاتبوو. بۆ ئەو مەبەستە هەڵمەتێکی خێرا و کتوپڕی دژیان ڕێکخست. ئەو هاوەڵانەی بەشداریی خەیبەریان کرد، ئەوانە

بوون که نه‌یانتوانیبوو عه‌مره به‌جێ بهێنن و نیازمه‌ندبوون به جیهاد ئه‌و که‌لێنه پڕبکه‌نه‌وه.

پێغه‌مبه‌ر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) هه‌ندێك له هاوه‌ڵه‌كانی نارد بۆ غه‌طه‌فان كه له بنه‌ڕه‌تدا هاوپه‌یمانی خه‌یبه‌ر بوون.[1] غه‌طه‌فان وایان زانی جه‌نگه‌كه به‌ره‌و رۆكی ئه‌وان ده‌گرێت. بۆیه به چاره‌نووسی خۆیانه‌وه سه‌رقاڵ بوون و یارمه‌تییان له خه‌یبه‌ر پچڕاند. به‌ڵام ئامانجی سه‌ره‌كیی پێغه‌مبه‌ر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خه‌یبه‌ر بوو، جوله‌كه‌كانی خه‌یبه‌ریش نیگه‌ران بوون و ده‌یانپرسی "كه‌ی بۆمان دێن؟" ئه‌وه‌بوو سوپای موسڵمانان به‌شێوه‌یه‌كی كتوپڕ دایان به‌سه‌ریاندا. كه به‌ره‌به‌یان بووه‌وه بینییان موسڵمانان ئابڵوقه‌ی خه‌یبه‌ریان داوه.

خه‌ڵكی خه‌یبه‌ر وه‌ك پیشه‌ی هه‌موو به‌یانییه‌كیان به‌نیاز بوون بچنه سه‌ر كێڵگه و بێستانه‌كانیان، پاچ و بێڵ و كه‌ره‌سته‌ی جوتیارییان له‌گه‌ڵ خۆیان هه‌ڵگرتبوو. به‌ڵام هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ی له قه‌ڵاكانیان هاتنه ده‌ره‌وه، حه‌په‌سان و له جێگه‌ی خۆیاندا وشكبوون. خۆیان له‌به‌رده‌م سوپای موسڵمانان به سه‌ركردایه‌تی پێغه‌مبه‌ر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بینییه‌وه. كاتێك به‌هۆش خۆیاندا هاتنه‌وه، ده‌موده‌ست گه‌ڕانه‌وه و خۆیان كوتایه ناو قه‌ڵاكانیانه‌وه. له‌و ساته‌وه‌خته‌دا دروشمێك له زاری پێغه‌مبه‌ر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) ده‌هاته ده‌ره‌وه كه زه‌وی ده‌هێنایه له‌رزه:

"اللهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ"

"الله أكبر، ڕووخا خه‌یبه‌ر!"[2]

به‌ڵێ، خه‌یبه‌ر كۆتایی پێهاتبوو. هیچ ڕێگه‌چاره‌یه‌كیان له‌به‌رده‌مدا نه‌مابوو

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٢٩٩/٤-٣٠٠؛ الطبري، تاريخ الأمم و الملوك ١٣٥/٢.

٢. صحيح البخاري، الصلاة ١٢، آذان ٦؛ صحيح مسلم، الجهاد ١٢٠.

جگە لە خۆبەدەستەوەدان. بەڵام دیسانەوە پێویستی بە حەیدەری کەررار هەبوو تاکو دەروازەی خەیبەر بۆ موسڵمانان بکاتەوە. ئیدی کاری خەیبەر تەواو بووبوو. ڕێگەکان بەرەو خۆبەدەستەوەدان دەڕۆیشت بەڵام هێندە هەبوو کە لەخەیبەریشدا دووبارە حەیدەری کەڕارێك پێویست بوو، پێویست بوو تا دەرگای قەڵاکە دەربهێنرێت و بیکاتە قەڵغانی دەستی و تاجی سەرکەوتن لەسەر سەری سوپای ئیسلام دابنێیت...[1] خەیبەر لەسەر دەستی حەزرەتی عەلی فەتح کرا. پێغەمبەر (عَلَیهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) پێشتر مژدەی دابوو کە ئاڵاکە دەدات بە دەست کەسێکەوە کە خوا و پێغەمبەری خۆشدەوێت و خوا و پێغەمبەریش ئەویان خۆشدەوێت. ئەو هاوەڵەش عەلی کوڕی ئەبوتالیب بوو.[2] بەو جۆرە لە ماوەیەکی کورت و بە کەمترین زیانەوە خەیبەر خۆی دا بەدەستەوە.

دایکی باوەڕداران، صەفییەی کچی حوییەی لەنێو دیلەکاندا بوو. ئەم ئافرەتە مەزنە بەهرەمەندی ئەو پایە نایابە بوو کە ببێتە هاوسەری پێغەمبەر. پاش موسڵمانبوونیشی ڕۆڵێکی گەورە و کارای گێڕا لە بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلام بەناو هۆزەکەیدا. پلەوپایە و ناوبانگی پێشووی لە خزمەتی گەیاندنی دوایەمین پەیامی ئاسمانیدا بەکارهێنا.

## ب. داستانی موئتە

ئەم غەزایەش پڕیەتی لە پاڵەوانێتی، ئەگەرچی پێغەمبەریش (صَلَوَاتُ اللهِ عَلَیهِ) بەشدار نەبوو تێیدا. بەڵێ، ناتوانین باز بدەین بەسەر غەزای موئتەدا و

١. إبن حجر، الإصابة ٤/٥٦٧.

٢. صحيح البخاري، المغازي ٣٨؛ صحيح مسلم، فضائل الصحابة ٣٢.

فەرامۆشی بکەین. ئەو مونتەیەی کە هۆکاربوو بۆنەوەی ناوی ئیسلام بدرێت بەگوێی جیهاندا. لەو غەزایەدا خۆشەویستترینی هاوەڵانی پێغەمبەر شەهیدبوون و هەر لەوێشدا ئەسپەردەکران "زەیدی کوڕی حاریسە، پاشان جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب و، دوای ئەویش عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە". هەرسێکیان شەهیدبوون و لەوێوە بەرەو بەهەشت دایان لە شەقەی باڵ. هاوکات لە مونتەدا بلیمەتیی خالیدی کوڕی وەلید دەبینین. ئەوە یەکەمین جەنگ بوو کە لە ڕیزی موسڵماناندا بەشداری کرد و بوونی خۆی تێدا سەلماند.[1]

لە ماوەی ڕێککەوتنەکەدا پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) نامەی دەنارد بۆ سەرۆك و پادشای وڵاتان و بانگی دەکردن بۆ ئیسلام. هەندێکیان وەڵامی ئەرێنییان دەدایەوە و،[2] هەندێکی تریشیان نەرێنی. تەنانەت هەندێکیان لە هەموو سنوورەکانی بەها و ڕەوشت دەترازان و ئاکاری ناپەسەندی خۆیان نمایش دەکرد.[3]

وەڵامی "شورەحبیل"ی فەرمانڕەوای بوصرا لە نموونەی ئەو وەڵامە نەرێنییانەیە. ئەگەرچی شورەحبیل بە ڕەچەڵەك عەرەب بوو، بەڵام خۆی کردبوو بە مەسیحی. ئەوجا بۆ ئەوەی ئاستی دەمارگیری خۆی بۆ ئایینەکەی بسەلمێنێ، فەرمانی دا بە کوشتنی حاریسی کوڕی عومەیری نێردراوی پێغەمبەر. کوشتنی نێرراوی پێغەمبەر تاوانێك نەبوو چاوی لێ کەلا بخرێت. ئەمە بەدەرلەوەی کە شوێنکاری ئەو کردارە لەسەر هەڵوێستی فەرمانڕەوای ناوچەکانی تر تا بڵێی جێی مەترسی بوو.

---

١. صحيح البخاري، فضائل أصحاب النبي ٢٥، المغازي ٤٤؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٥٦/١.

٢. صحيح مسلم، الجهاد ٢٧؛ سنن الترمذي، الإستئذان ٢٣؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٢٦٢/٤-٢٧٣.

٣. إبن كثير، البداية و النهاية ٢٧١/٤.

بۆیە دەستبەجێ سەرومرمان سوپایەکی سێ هەزار کەسی سازکرد و زەیدی کوڕی حاریثەی کرد بە سەرکردەی. پێشتر پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زەیدی کردبوو بە کوڕی خۆی. پاشان ئیسلام هات و نەریتی بەکوڕکردنی هەڵوەشاندەوە. ئەوەبوو فەرمووی "زەیدی کوڕی حاریثە پێشەواتانە. ئەگەر کوژرا با جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب بچێتە جێگەی. ئەگەر ئەویش کوژرا ئەوا با عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە شوێنی بگرێتەوە. خۆ ئەگەر عەبدوڵڵاش کوژرا، ئەوا با موسڵمانان لەنێو خۆیاندا ڕێك بکەون لەسەر پیاوێك و بیکەن بە پێشەوای خۆیان."[1]

کاتێك سوپای موسڵمانان گەیشتە موئتە، خۆیان لەبەردەم سوپایەکی دووسەد هەزار کەسیدا بینییەوە. جیاوازییەکی ترسناك لەنێوان هەردوو سوپادا هەبوو: سێ هەزار کەس بەرامبەر دووسەد هەزار کەس...

ئەوەی مایەی تێڕامانە ئەوەیە کە موسڵمانان بەبێ گوێدانە ئەو جیاوازییە لە ئەندازە بەدەرە، سووربوون لەسەر ئەوەی ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە. مێژوو قسەی سەر زوبانیانمان بەم چەند وشەیە بۆ دەگێڕێتەوە "یان ئەوەتا سەردەکەوین، یان ئەوەتا پلەی شەهیدی بەدەست دەهێنین."

جەنگ تاوی سەند و هەرسێ سەرکردەی دیاریکراو یەك لەدوای یەك شەهیدبوون. ئاڵاکەش لە دەستێکەوە بۆ دەستێکی تر دەگوازرایەوە. تا گەیشتە خالیدی کوڕی وەلید، کە لەو ڕۆژەدا نۆ شمشێر لە دەستیدا شکان.[2]

هەر ئەوەندی خالید سەرکردایەتیی سوپای گرتە دەست، ئیدی لەلایەکەوە دەجەنگا و مەردانە مانۆڕی ئەنجام دەدا، لەلایەکی تریشەوە بەدوای ڕێگەیەکدا

---

١. ابن هشام، السيرة النبوية ٥/٢٢-٣٠؛ ابن سعد، الطبقات الكبرى ٢/١٢٨؛

٢. صحيح البخاري، المغازي ٤٤.

دەگەڕا سوپاکەی لێوە دەرباز بکات و بیکشێنێتەوە بۆ مەدینە و لەوە زیاتر زیانیان لێ نەکەوێت. ئەو کشانەوەیەش لە تاکتیکی جەنگدا بە سەرکەوتنێکی گەورە دادەنرێت. ڕاستە پاشەکشە لە هاوەڵان نەدەوەشایەوە، خۆیشیان بەوە زۆر دڵگران بووبوون و گرێی لە دەروونیاندا دروستکردبوو، بەڵام لە چوارچێوەی پێوەرە قورئانییەکاندا ئەوە هەنگاوێك بوو دەبوو بنرایە. پێشەوا بوخاری و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بەمجۆرە باسی موئتەمان بۆ دەکەن:

ئەنەس (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەر لە شەهیدبوونی زەید و جەعفەر و عەبدوڵلا هەواڵەکەی بە هاوەڵانی دەوروبەری ڕاگەیاندووە "زەید ئاڵاکەی هەڵگرت و شەهیدبوو. پاشان جەعفەر هەڵیگرت و ئەویش شەهیدبوو. ئەوجا عەبدوڵلا هەڵیگرت و ئەویش شەهیدبوو. ئێستاش شمشێرێك لە شمشێرەکانی خوا ئاڵاکەی گرتە دەست و خوا سەری خستن."[1]

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت "پیشانم دران لە بەهەشتدا لەناو خێوەتێکدا بوون کە لە مرواری دروستکرابوو، هەریەکەیان لەسەر پێخەفێك بوو. لەملی زەید و عەبدوڵلا تەوقێکم بینی بەڵام جەعفەر بەو شێوەیە نەبوو، چونکە ئەوان کاتێك ڕوبەڕووی مەرگ بوونەوە سڵەمینەوە یاخود وەك ئەوە بوون کە ڕووخساریانی لێ لابدەن، بەڵام جەعفەر وەهای نەکرد."[2]

لەنێو هاوەڵانیشدا دەکرێت سامی مردن هەبووبێت، بەڵام هیچکامیان ئەو سڵەمینەوەیان نەگەیاندووەتە سنووری قەدەغەکراو. بێگومان ئەوەی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) دیویەتی تابلۆ گەلێکی پەیوەست بە جیهانی بەرزەخ و جیهانی میسالن.

١. صحيح البخاري، المغازي ٤٤؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٠٤/١.

٢. عبد الرزاق، المصنف ٢٦٦/٥؛ أبو نعيم، حلية الأولياء ١٢١/١.

موسڵمانان بەو ژمارە کەمەیانەوە کە لە سێ هەزار جەنگاوەر تێ نەدەپەڕی، ترسیان خستبووە دڵی ڕۆمەکانەوە. دواجار سەرکردەی بلیمەت، حەزرەتی خالید توانی بە کەمترین زیان پاشەکشە بە سوپای ئیسلام بکات و بیگێڕێتەوە بۆ مەدینە. بەگوێرەی ڕیوایەتەکەی ئیبن هیشام، ژمارەی شەهیدانی ئەو جەنگە دوازدە شەهید بووە.[1] جەنگی موئتە بۆ خەڵکی ئەو ناوچانەی سەلماند کە موسڵمانان هەن. ئایینی تازەش بووبووە باس و خواسی ڕۆمەکان. خەڵك باوەڕیان بهێنایە و نەهێنایە باس هەر باسی پێغەمبەر بوو (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). پاش ئەو ئامادەکارییە گشتییە ئیدی کاتی هاتنەدی خەونەکە هاتبوو:

﴿ لَقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴾

(الفتح: ٢٧-٢٨)

"سوێند بەخوا بێگومان خوا خەونی پێغەمبەرەکەی بەڕاستی و وەك خۆی هێناوەتە دی کە دەفەرموویت: بەمزووانە ئێوە بە هەموو ئارامی و ئاسوودەییەکەوە بە ویستی خوا دەچنە ناو کەعبەی پیرۆزەوە، (عەمرە بەجێ دەهێنن) سەرتان دەتاشن یان کورتی دەکەنەوە بێئەوەی ترس و بیمتان لە کەس هەبێت. جا ئەوەی نەتانزانیبوو خوا دەیزانی، کە جگە لەم سەرکەوتنە سەرکەوتنێکی نزیکی تری بۆ بڕیارداون و پێتان دەبەخشێت."

---

١. ابن هشام، السيرة النبوية ٤٦/٥؛ ابن كثير، البداية و النهاية ٢٥٩/٤.

## ج. بەرەو فەتحی مەککە

پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيهِ أَفضَلُ الصَّلاةِ وَأَتَمُّ التَّسلِيم) خەونی ڕاستەقینەی دەبینی. خاتوو عائیشەی دایکمان دەگێڕێتەوە "یەکەم شت کە بوو بە دەستپێکی نیگا بۆ پێغەمبەر، خەوبینینی ڕاستەقینە بوو. هەرکات خەونێکی دەدی وەك سپێدەی بەیان دەهاتە دی."[1]

ئەمەش ئەو خەونەیە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) بینیبووی: لە خەونەکەیدا چووە ناو "مَسْجِدُ الحَرام"، هەر بەو جۆرەی ئایەتە پیرۆزەکە وێنای کردووە و پشتڕاستی کردووەتەوە.

ئەگەرچی خەونی پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ) ناوێتە بوو بە وەحی و لێیەوە نزیك بوو، بەڵام وشەی "الرؤیا" دەکرێت بە واتای (الرؤیة - بینین) یش بێت. واتە؛ وەك چۆن خوای باڵادەست هەندێکجار بەهەشت و دۆزەخ و "لَوْحُ المَحْفُوظ" و کۆمەڵێك ڕووداوی نیشان دەدا کە پاش خۆی تا بەرپابوونی قیامەت دەهاتنە مەیدان، هەر بەوجۆرەش پیشانیدا بە ئاسایش و ئاسودەییەوە دەچێتە ناو کەعبەی پیرۆزەوە و مەراسیمی حەج و عەمرەش بەجێ دەهێنێت. جا دەگونجێت ئەوە لەڕێی خەونەوە بووبێت، یاخود بە چاویش دیبێتی. هەرکامیان بێت ئەنجامەکە هەر یەکێکە و ناگۆڕێت. گرنگ ئەوەیە ڕەوتی ڕووداوەکان بەو جۆرە گوزەرا کە ئەو بینیبوونی. ئەو دیمەنەی دیبووی ئاماژەی بۆ فەتحی مەککە دەکرد. ڕووداوەکانیش موسڵمانانیان بەرەو فەتح دەبرد.

ئەوەبوو باسمان کرد کە لە حودەیبیە ڕێککەوتنێك لەنێوان قورەیش و هۆزە هاوپەیمانەکانی لەلایەك و، موسڵمانان و هۆزە هاوپەیمانەکانی لەلایەکی تر،

---

١. صحيح البخاري، بدء الوحي ٣؛ صحيح مسلم، الايمان ٢٥٢.

ئەنجامدرا. بەڵام هەر کە هۆزی بیکری هاوپەیمانی قورەیش هێرشیان کردە سەر هۆزی خوزاعە، کە هاوپەیمانی پێغەمبەر بوون و زیانیان لێدان، ڕێککەوتنەکە کەلێنی تێکەوت و بڕگەکانی ئاشتەواییەکەی هەڵوەشاندەوە. ئەبوسوفیان زۆر چاك لە دەرەنجامە نەخوازراوەکانی ئەو هێرشە تێگەیشتبوو. بۆیە بەپەلە بەرەو مەدینە کەوتە ڕێ تاکو دووپاتی بکاتەوە کە هێشتا پەیماننامەی ئاشتەوایی بەردەوامە. بەڵام لەو هەوڵەیدا سەرنەکەوت.[1]

دەمێك بوو تیر لە کەوان دەرچووبوو.. پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) دەستی کرد بە خۆسازدان بۆ جەنگ. وەك نەریتی هەمیشەیی، نیاز و ئامانجی خۆی بە نهێنی هێشتەوە. ئەم نیازەی تەنانەت لە نزیکترین ڕاوێژکارەکانیشی شاردەوە. ئەوە بوو ئەبوبەکر جارێکیان ڕۆیشت بۆسەردانی عائیشەی کچی، بینی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خۆی ساز دەکات بۆ سەفەر. پرسیاری لە کچەکەی کرد کە داخۆ نیازی کوێی هەیە. ئەویش لەوەڵامدا وتی "بابەگیان بەخوا منیش نازانم!"[2]

بەڵێ، ئامادەکارییەکانی فەتح بەنهێنی بوون و تەنانەت لەلای حەزرەتی ئەبوبەکریش، واتە لە نزیکترین کەسی خۆی کە هەڵی بژاردبوو ببێتە هاوەڵی کۆچی، شاراوە بوو. ئەوەش بۆخۆی مەودایەکی تری مەوداکانی بێهاوتایی ئەو سەروەرە بوو لە مەیدانی سەربازیدا.

هەرکاتێك سەروەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بەنیاز بووایە کردەیەکی سەربازی ئەنجام بدا، بە پەنهانی دەیهێشتەوە و شتێکی نەدەدا بەدەستەوە ئامانجە ڕاستەقینەکەی ئاشکرا ببێت. پێم وایە فەرمانده سەربازییەکانی

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٥/٤٢-٥٢.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٥/٥٢.

ئەم سەردەمەش بەهەمان شێوە بیر دەکەنەوە. ئەگەر بیانەوێت هێرش بکەنە سەر جێگەیەکی دیاریکراو، ئەوا لە جێگەیەکی تردا هەرایەکی گەورە دەنێنەوە بۆ چەواشە و سەرلێشێواندن و، نیازە ڕاستەقینەکەیان هەمیشە دەشارنەوە و کەس نازانێت لە کوێ گورزی خۆیان دەوەشێنن؛ لە ناوچەی ئەلف؟ یان بێ؟ یان لە ناوچەی جیم؟ ئەوە چواردە سەدەیە و ئەو تاکتیکانە هەر پێش دەکەون. بەڵام داهێنەرە ڕاستەقینەکەی حەزرەتی محەممەدە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) کە نە قوتابخانەی دیوە و نە خوێندەواریشی هەبووە. بەڵام لە خواوە فێری هەموو ئەوانە بووە، بۆیە ئەو بە "نەخوێندەواری" بوو بە زاناترینی زانایان، بەڕادەیەك کە مرۆڤ خۆی پێناگیرێت نەڵێت ''شایەتی دەدەم کە محەممەد بەندە و نێردراوی خوایە.''

بەڵێ، ئامانجی جموجوڵەکانی لە نەیارەکانی دەشاردەوە، لەهەمان کاتیشدا هەواڵ و زانیاری ئەوانی لە ڕێگەی تۆڕە هەواڵگرییەکەیەوە کۆدەکردەوە. هەر شتێکیش ڕووی بدایە یەکسەر هەواڵەکەیی پێ دەگەیشت. جا ئەگەر ئەو باڵادەستییە چ لە ڕێگەی نیگای ئاسمانییەوە بووبێت یان فەتانەت و فیراسەتی ئەو خاوەن فەتانەتە مەزنە خۆی، هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت. گرنگ ئەوەیە وەك ناو لەپی دەستی خۆی ئاگاداری وردودرشتی بزاوتی بیابان بوو.

بۆ نموونە: یەکێك لە هاوەڵان کە بەشداری جەنگی بەدریشی کردبوو، کاتێك زانی موسڵمانان دەچن بۆ مەککە، هەستا بە ئیجتیهادی هەڵەی خۆی بە ژنێکدا نامەیەکی نارد بۆ مەککە تاکو هەواڵی هاتنی پێغەمبەریان پێ ڕابگەیەنێت. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە ڕێگەی وەحیەوە ئاگاداری ئەو حاڵەتە بووەوە، دەستبەجێ حەزرەتی عەلی و حەزرەتی زوبێری نارد بۆ

ڕێگرتن لەو هەوڵە. ئافرەتەکەیان گرت و هەوڵەکەیان پووچەڵکردەوە. هەموو ئەمانەش زۆر بەخێرایی ئەنجام دران.

نهێنیی هەڵمەتەکە بەردەوام بوو، کەس هەستی نەکرد بە هاتنی سوپای ئیسلام تاکو گەیشتە نزیك سنوورەکانی مەککە. ئەو وەختەش کە پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ) لە ڕێگەی عەباسی مامییەوە ناردی بەدوای ئەبوسوفیاندا، مەککەییەکان چارەیەکی تریان لەبەردەمدا نەمابوو.[1] تەنانەت ئەگەر بەخێراترین وشتر و ئەسپیش هەڵبهاتنایە هێشتا هەر نەیاندەتوانی دەرباز ببن.. تازە دەستیان لەبنی هەمانەکە دەرچووبوو.

وێڕای ئەوەش پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) زۆر بە وریایی مامەڵەی دەکرد. ئەو هەستیارییەشی دەگەڕایەوە بۆ پەرۆشی ئەو لەسەر پاراستنی بەرژەوەندیی هەردوولا. چونکە نەیدەویست نە لە سوپاکەی خۆی و نە لە خەڵکی مەککەش کەسێك ئازاری پێ بگات. بەهۆی ئەو هەستیاری و ورییاییەوە بوو توانی فەتحی مەککە بکات و، لە کردەیەکی سەبازیی وەها بەرفراواندا! تەنها سیان لە موسڵمانان شەهید ببن. کەچی هێشتا تاقمێك لە مەککەییەکان هەر سواری ئەقڵی خۆیان بووبوون و سەودای جەنگ دابووی لە کەللەیان، لەوانە بوون کە دەیانوت "چی دەبێت با ببێت!"

پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلاةٍ وَسَلامٍ) بە سوپایەکەوە هاتبوو کە دە هەزار جەنگاوەری لەخۆگرتبوو. کەچی دوو ساڵ پێشتر ژمارەیان تەنها هەزار و شەش سەد کەس دەبوو. سەروەرمان دەیویست هێزی ڕاستەقینەی سوپاکەی دەربخات، بۆیە فەرمانی دا هەرکەسەو لە شوێنێکی بەرزدا کە بەسەر مەککەدا بڕوانێ، ئاگرێك بکاتەوە تاکو مەککەییەکان ببینن. مەککەییەکان وایان دەزانی هەر ئاگرێك

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٥/٥٨-٦٠.

ئاماژەیە بۆ چادرێك.[1] بۆیە كە بینییان دە هەزار ئاگر كراوەتەوە، سوپاكەیان مەزەندە كرد بە سی هەزار جەنگاوەر، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی بە تەواوی پەكیان بكەوێت. تێگەیشتن كە جگە لە خۆبەدەستەوەدان هیچ ڕێگەیەكیان لەبەردەمدا نەماوە. ئەبوسوفیانیش لە گەڕانەوەیدا هەمان ئامۆژگاری كردن. چونكە ئەو هەموو ئاگرەی بینی دەوری مەككەی گرتووە، هیچ هیوایەكی نەما بۆ بەرهەڵستی. ئەوە دوایین شەوی سەردەمی نەفامی بوو، چونكە لەنێوان موسڵمانان و ساتی فەتحدا تەنها یەك شەو مابوو.

ستراتیژی فرەلایەنەی پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەك خۆی بەردەوام بوو. سوپاكەی دابەشكرد بەسەر شەش بەرەدا و لە شەش قۆڵەوە چوونە ناو مەككەوە. هیچكام لەو بەشانە ڕووبەڕووی بەرگری نەبوونەوە، جگە لەو سوپایەی كە خالیدی كوڕی وەلید سەركردەی بوو، چونكە ناچاربوو بڵاوە بكات بەو هێزەی كە عیكریمەی كوڕی ئەبوجەهل كۆی كردبووەوە. هێزەكانی تر بەبێ بەرهەڵستی چوونە ناو مەككەوە.[2]

ئەبوسوفیان تاكەكەس بوو كە لەدەستی دەهات لە مەككەدا پشێوی بنێتەوە. بەڵام پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) توانی بە یەك ڕستە دڵی نەرم بكات. ئەوەبوو فەرمووی "هەركەس بچێتە ماڵی ئەبوسوفیان، پارێزراوە."[3] بەخشینی ئەو پێگە و پایەیە بە ئەبوسوفیان بەس بوو بۆئەوەی دەستەكانی ببەستێت و نەهێڵێت هەڵوێستی دوژمنكارانە بنوێنێت. بگرە بووە چالاكترینی ئەوانەی كە هاندەر بوون بۆ خۆبەدەستەوەدان. بێگومان هەموو خەڵكی مەككە نەیاندەتوانی

1. إبن هشام، السيرة النبوية ٥/٥٨-٥٩؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٤/٢٨٩.
2. إبن هشام، السيرة النبوية ٥/٦٦-٦٧.
3. سنن أبي داود، الخراج ٢٤؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢/٢٩٢.

بچنە ناو ماڵی ئەبوسوفیانەوە، هەڵبەتە کە کەعبەی ماڵی خواش پێش ماڵی ئەبوسوفیان بوو. بۆیە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی ''هەرکەسیش بچێتە ناو حەرەمی کەعبە، پارێزراوە.'' پاش ئەوە و بۆ یەکەمجار لە مێژوودا بڕیارێکی تری کتوپڕ دەرچوو، کە ئەویش قەدەغەکردنی چوونە دەرەوە و هاتوچۆ بوو. ئەم بڕیارە چ بۆ پاراستنی سەلامەتی گیان و چ بۆ ئاسانکاریی جموجوڵی سوپا لەوپەڕی گرنگیدا بوو. ئەوەبوو سەروەرمان فەرمووی ''هەرکەسیش دەرگای ماڵەکەی لەسەر خۆی دابخات بێوەی دەبێت.''[1] بەوجۆرە هەموو ئەگەرێکی پێکدادان بنەبڕکرا.

خۆ ئەگەر چاو کەلا بکەین لە هەموو ئەو غەزایانەی کە پێشتر ئەنجامی دابوون و تەنها سەرنج بدەینە فەتحی مەککە و ئەو ڕێوشوێنە سیاسی و سەربازییەی پیادەی کرد، ئەوە بەسە تاکو بزانین چ بلیمەتێکی بواری سەربازییە. بەڵێ، فەتحی مەککە بەتەنها بەسە بۆئەوەی هەموو خاوەن ویژدانێك ناچار بکات بڵێت ''محەممەد پێغەمبەری خوایە.''

هێندە بە متمانەوە وردەکاریی پلانە سەربازییەکەی جێبەجێ دەکرد، دەتوت پێشتر چەندجارێك فەتحی مەککەی کردووە. بەدڵنیاییشەوە ئەو لێبوردنە گشتی و جوامێرییە بێوێنەیەی دوا بەدوای پرۆسەکە دەری کرد، ئەوەندەی تر دڵی مەککەنشینانی بەرەو لای خۆی ڕاکێشا. دەبێت ئەوە چ ناچارییەکی شیرین بێت وا لە ڕۆژێکدا سەرتاپای شارێك موسڵمانبوونی خۆیان ڕادەگەیەنن!

ئیدی ئێستاش کاتی گۆڕینی وزەی خاوەن لێهاتنە تازەکانە بۆ بزاوت و کردار. ئای خوایە ئەوە چ ئاڵوگۆڕێکی مەزنە! ئەوانەی تا دوێنێ لەپێناو

---

١. سنن أبي داود، الخراج ٢٤؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢/٢٩٢.

دوژمنایەتی ئەودا گیانی خۆیان دەسپارد، وا ئەمڕۆ لەبەرامبەر دوژمنەکانیدا ئامادەن گیانی خۆیان بەخت بکەن. هەرکەسێك پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) دیدەیەکی بۆ خستبێت، لە خەڵوزەوە گۆڕاوە بۆ ئەڵماس. جا چ پێویست بە چواندنی تر دەکات. مەگەر هەر خۆی هاوەڵەکانی نەچواندووە بە ئەستێرەکانی ئاسمان؟[1]

بەڵێ، ئەو ڕۆحانەی تا دوێنێ لەناو زۆنگاوی نەفامیدا دەگەوزان، لە تەنها ڕۆژێکدا بەرزی کردنەوە بۆ ئاسمان، تاکو ببنە ئەستێرە و پرشنگ بدەنەوە و هەتا قیامەت ببنە پێشەنگ.

## د. ئەوجا ساتمەی حونەین

هەتاکو فەتحی مەککە هێشتا چەند هۆزێك مابوون چاودێری ڕووداوەکانیان دەکرد. دەیانویست یەکلا ببنەوە و بزانن تەرازووی هێز بەلای چ بەرەیەکدا دەشکێتەوە. بەڵام بە فەتحکردنی مەککە هەموو ئەو هۆزانە پۆل پۆل هاتنە ناو ئیسلامەوە. بەڵام وا دیاربوو هۆزی "ثەقیف و هەوازن" چاویان بە پێشهاتەکان هەڵ نەدەهات. جا بۆ ئەوەی ڕێگە بگرن لە گەشەی زیاتری موسڵمانان، بەپەلە سوپایەکیان پێکهێنا کە زۆرێك لە جەردە و تاڵانچییانی بیابانی لەخۆگرتبوو و ژمارەیان گەیشتە بیست تا سی هەزار کەس.[2]

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی مەدرەدی ئەسلەمی نارد، تاکو لەناو ئەو هۆزانەوە هەواڵی بۆ بهێنێتەوە، ئەو هاوەڵە کاری خۆی ئەنجامدا و هەموو ئەو زانیارییانەی کۆی کردبوونەوە گەیاندنی

١. الحكيم الترمذي، نوادر الأصول ٦٢/٣؛ الديلمي، المسند ١٦٠/٤.

٢. إبن كثير، البداية و النهاية ٣٢٢/٤-٣٢٦.

بە پێغەمبەر (صَلَّیٰ اللهُ عَلَیْهِ وَعَلَیٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ): هۆزی "ثەقیف و هەوازن" سوپایەکی گەورەیان لە "حونەین" کۆکردبووەوە.

ئەو دوو هۆزە بە ئازایەتی و شارەزایی لە تیرهاوێشتندا ناویان دەرکردبوو. بۆیە دەبوو سوپایەکی لاو و خوێنگەرم بە ڕوویاندا بچێت کە زۆربەی لە موسڵمانە تازەکان پێکهاتبێت. هەروایش بوو.. ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (عَلَیْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامْ) فەرمانی دا دەستبەجێ بەرەو حونەین بکەونە ڕێ، چونکە پێدەچوو بارودۆخەکە لە بەرژەوەندیی موسڵمانان نەبێت. خۆ ئەگەر سوپای دوژمن بۆی بڕەخسێت، ئەوا ڕوودەکاتە مەککە و هەل بۆ هەندێك لە مەککەییەکانیش دەڕەخسا -کە بەدوای هەلێکدا دەگەڕان- تاکو شتێك دژی موسڵمانان بکەن. لەهەمان کاتیشدا موسڵمانە تازەکانی ناو مەککە کە هەستیان دەکرد شکۆیان زامداربووە، ئەگەر لەگەڵ پێغەمبەر (صَلَّیٰ اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمْ) لەم جەنگەدا دژی دوژمنان شەڕیان بکردایە، ئەمە دەبووە هۆکاری چەسپاندنی باوەڕەکەیان و زیاتر هۆگری ئیسلام دەبوون.

موسڵمانان بە دوازدە هەزار جەنگاوەرەوە بەرەو حونەین ڕۆیشتن، لەناویاندا دوو هەزار کەس هەبوون کە هێشتا ئیسلام لە دڵ و دەروونیاندا نەچەسپابوو، ئەوانی تر زۆربەیان لاو بوون و ئەزموون و شارەزایی جەنگیان نەبوو. سەرکردەی ئەوانە خالیدی کوڕی وەلید بوو. دوژمن لەسەر شێوەی ناڵی ئەسپ جێگەی خۆی گرتبوو. ڕیزی پێشەوەی سوپای ئیسلام بەرەو پێشەوە هەنگاوی نا. لەناکاو بینەوەی بەخۆی بزانێت خۆی لە ناوەڕاستی سوپای دوژمندا بینییەوە.

ئەو پێشەنگانە تیرباران کران و بەناچاری کشانەوە، چونکە زۆربەی سەربازەکان قەڵغانیان پێنەبوو، تیرەکانیش زۆر بوون و ئامانجەکانیشیان باش

دەپێکا. جا ئەگەر هێرشکردنە سەر ناوەندی سوپای دوژمن بە مەبەست بوویێت، ئەوا کشانەوەکەیان بە تاکتیکێکی جەنگی دادەنرێت. چونکە هەر کە تیر هاوێژەکان بینییان موسڵمانەکان دەکشێنەوە، یەکسەر ڕایان کرد بەدوایاندا و هوتافی سەرکەوتنیان کێشا و جێگەکانی خۆیان بەجێهێشت، هەستیشیان بەوە نەکرد کە وەك بزمار دەکەونە ناو دەمی گازەوە. چەند ساتێك تێپەڕی، ئەوەی لێیان کوژرا کوژرا، ئەوانی تریان بەرەو شاری تائیف هەڵهاتن و پەنایان بردە بەر قەڵاکانیان.[1]

لە سەرەتای جەنگدا جۆرە شکستێکی ڕواڵەتی دەرکەوت (هەروەك ناوەڕاستی جەنگی ئوحود)، بەڵام پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيهِ) بە ئازایەتییە سروشتییەکەی خۆی کە تەنانەت لە سەختترین کاتدا هەر لەگەڵیدا بووە، هەروەها لەرێی فەتانەتە مەزنەکەیەوە توانی ئاڕاستەی جەنگ بگۆڕێت و بە فەزڵ و کۆمەکی خوا لە شکستێکی تەواوەتییەوە بیگۆڕێت بۆ سەرکەوتنێکی ڕوون و ئاشکرا.

وەختێك ترس و دڵەڕاوکێ باڵی کێشا بەسەر سەربازگەی ئیسلامدا، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) بەرەو پێشەوە هەڵمەتی برد. عەباسی مامی، لغاوی ئەسپەکەی گرتبوو تاکو نەیەڵێت بەرەو دوژمن مل بنێت. کەچی پێغەمبەر (عَلَيهِ أَلفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) بە دەنگە بەرز و سامدارەکەی هاواری دەکرد:

"أَنَا النَّبِيُّ لاَ كَذِبْ، أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِب"

"من نێردراوی خوام، هیچ درۆیەك لەمەدا نییە. من نەوەکەی عەبدول موتەلیبم."[2]

---

١. إبن كثير، البداية و النهاية ٣٢٦/٤.

٢. صحيح البخاري، الجهاد ٥٢، ٦١، ٩٦، ١٦٧، المغازي ٥٤؛ صحيح مسلم، الجهاد ٧٨-٨٠.

ئەوجا بە عەباسی فەرموو "ئەی عەباس! هاوەڵانی سەموورە بانگ بکە. ئەوانیش وەڵامیان دایەوە "لَبَّيْكَ.. لَبَّيْك" و دەمودەست هاتنەوە. بەوجۆرە ساتی پەشۆکان و کشانەوە کورتەکە کۆتایی هات و جەنگەکە بە سەرکەوتنێکی ئاشکرا کۆتایی هات.[1]

لێرەدا خۆمم پێناگیرێت ئاماژە بە خاڵێك نەکەم، ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە هەژدە غەزادا بەشداری کردووە و لە هەموشیاندا سەرکەوتووە. بەڵام پێم وایە کە جەنگی ئوحود و حونەین دیارترین ئەو غەزایانەن کە سەلمێنەری توانا و لێوەشاوەیی ئەوزاتەن. چونکە لە جەنگەکانی تردا کارەکان تەواو بە گوێرەی نەخشە و پلان دەڕۆشتن، تا بەئاسانی دەگەیشتنە سەرکەوتن. بەڵام لەو دوو جەنگەدا پێشهاتگەلێکی وا هاتنە گۆڕێ کە پێشتر حسابیان بۆ نەکرابوو و، پلانەکەی ئەویان گۆڕی و هەلی گەورەیان بۆ دوژمن ڕەخساند. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانی بگاتە سەرکەوتن. هەربۆیە ڕزگارکردنی سوپاکەی لە شکست و گەیاندنی بە سەرکەوتن لەو دوو جەنگەدا، باشترین و ڕوونترین بەڵگە بوون لەسەر بلیمەتیی سەربازی ئەو سەرکردە هەرە مەزنە.

### هـ. تەبوك

جەنگی تەبوك بە یەکێك لەو جەنگە خێرایانە دادەنرێ کە پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) توانی لە ماوەیەکی کورتدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە گوایە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی سوپایەکی گەورەی کۆکردووەتەوە و دەیەوێت بدات بەسەر مەدینەدا. ئەو دەنگۆیەش موسڵمانانی

[1] ابن كثير، البداية و النهاية ٣٢٦/٤.

نیگەرانکرد. لەهەمان کاتیشدا بووە سەرچاوەی هیوا و دڵخۆشی بۆ ئەو هۆزانەی نەیاری موسڵمانان بوون. هەمووان چاوەڕێی ئەوەیان لە غەسسانییەکان دەکرد بەڵا و خراپەیەکی گەورە بەسەر موسڵماناندا بهێنن.

لە سەرجەم غەزاکاندا سەروەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەر بنەمای پەنهانی لە جموجوڵدا هەنگاوی دەنا. بەڵام ئەمجارەیان بەئاشکرا بانگەوازی بۆ غەزا کرد و، نێردەی خۆی نارد بۆلای هۆزە نزیکەکان و داوای لێکردن بە چەك و جەنگاوەر پاڵپشتی بکەن. لەو سەروەختەدا مەدینە و ناوچەکانی دەوروبەری بە بارودۆخێکی دژواردا تێدەپەڕین؛ کەشوهەوا زۆر گەرم بوو، وشکەساڵیش خەڵکەکەی هەراسانکردبوو. کاتی چنینی بەروبومیش هاتبوو. خەڵکی هەژار بەکۆمەڵ دەهاتن بۆلای پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ)[1] و داوایان دەکرد کە بەژداریی جەنگەکە بکەن، بەڵام لەبەر نەبوونی سواریی نەیاندەتوانی بەژداریی غەزاکە بکەن توانای یارمەتیدانی ئەوانی نەبوو. ئەوانیش بەدەم فرمێسکی چاوانیانەوە دەگەڕانەوە. قورئانی پیرۆز ئەو دیمەنە کاریگەرانەمان بەمجۆرە بۆ تۆمار دەکات:

﴿ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴾

(التوبة: ٩٢)

"هەروەها گلەیی و لۆمە نییە لەسەر ئەو کەسانەی کە دێن بۆ لات بۆئەوەی ولاخی سوارییان بۆ پەیدا بکەیت و بێن بۆ جیهاد، تۆش دەڵێیت "هیچ شتێک نابەم تا بۆ سواری بتاندەمێ." (ئیتر بەنائومێدی) گەڕانەوە و چاویان فرمێسکی لێ دەڕژا

---

١. صحيح البخاري، تفسير (٩) ١٨؛ صحيح مسلم، التوبة ٥٣.

لە خەفەتدا و ئەسرینی لێ دەباری. چونکە هیچ شك نابەن بیبەخشن و خەرجی بکەن."

لەو نێوەندەشدا دوورڕووەکان دەستەوسان نەوەستابوون، بە گەرم و گوڕی کەوتبوونە خاوکردنەوەی وورەی موسڵمانان و تەگەرەخستنە بەردەم ئەم سەفەرەیان. بۆ ئەو مەبەستەش پەنایان دەبردە بەر فێڵ و ساختەی جۆراوجۆر. دواجار پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بە سوپایەکی (٣٠) هەزار جەنگاوەرییەوە بەرەو تەبوك کەوتە ڕێ. بیست ڕۆژ لە تەبوك مانەوە، بەڵام بیزەنتییەکان لە خۆیاندا ئەوەندە ئازایەتی و بوێرییان شك نەدەبرد ڕووبەڕووی ئەو سوپایە ببنەوە، بۆیە لە تەبوکدا جەنگ ڕووی نەدا، بەڵام هاتنی موسڵمانان تا تەبوك، شوێنکارێکی گەورەی هەبوو لەسەر هەموو ئەوانەی هەواڵەکەیان بیست. هاوکات بووە هەڕەشە و چاوترسێنیش بۆ دوژمن و وورەی پەکخستن. بە جۆرێك، خۆ ئەگەر لە مەیدانی جەنگیشدا شکستیان بهێنایە هەر ئەوەندە کاریگەر دەبوون. لەپاڵ ئەوەشدا زۆرێك لە هۆزە مەسیحییەکان قبووڵیان کرد فیدییە بدەن، تەنانەت هەندێکیشیان موسڵمانبوون.[١] بۆیە دەکرێ هەڵمەتی تەبوك لە ڕیزبەندی ئەو سەرکەوتنانە دابنرێت کە پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بەدەستی هێنان.

لە چەند لاپەڕەی پێشوودا هەوڵماندا لە سۆنگەی چەند ڕووداوێکەوە لایەنی سەربازیی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نمایش بکەین. لێرەشدا هەندێك تایبەتمەندیی گشتی باس دەکەین کە پێویستە لە هەر سەرکردەیەکی سەربازیدا هەبن، تاکو باشتر فەتانەتی محەممەدیی لەو لایەنەوە ببینین.

١. ابن كثير، البداية و النهاية ٩/٥.

## ج. ئەو تایبەتمەندییانەی پێویستە لە سەرکردەدا هەبن

فەرماندەی سەربازی، هاوشانی لێهاتنە سەربازییەکانی لەهەمان کاتیشدا سەرکردەیە. هەربۆیە دەبێت فەرماندەی سەربازی خاوەنی کۆی ئەو تایبەتمەندییانە بێت کە دەبێت لە سەرکردەدا بوونیان هەبێت. لێرەدا هەوڵ دەدەین بە چەند خاڵێك پوختەی ئەم باسە بخەینە بەرچاو:

١- بڕیاری دروست و خێرا لەکاتی پێویستدا.

بڕیاردان بە بناغەی ئەو کار و چالاکییانە دادەنرێت کە پێویستە ئەنجام بدرێن. بەڵام هەروەك ئەگەری دەرکردنی بڕیاری نادروست هەیە، ئاوەهاش ئەگەری ئەوە هەیە لە ڕووی کاتەوە هەڵە بکرێت. چونکە دەرکردنی بڕیاری پێشوەخت یان پاشوەخت، هەرگیز ئامانجەکەی ناپێکێت. بۆیە بڕیاری سەرکردە دەبێت جیابێت لە هەر بڕیارێکی ئاسایی، بەوەی کە بڕیارێکی ڕاست و دروستە و لەکاتی گونجاوی خۆیدا دەرکراوە.

چەند کاتێکی گرنگ هەن پێوستە بڕیاری خێرایان تیادا بدرێت. سەرکردەش لەو جۆرە کاتانەدا بە توانا و بوێری خۆی لە خەڵکی تر جیا دەکرێتەوە و بڕیاری خێرا و دروست دەدات. دیارە زۆرێك لەو بڕیارانەی لەناکاو دەدرێن، زۆرجار دەرئەنجامی نەخوازراویان لێ دەکەوێتەوە. چونکە پەلەپەل و پێکان دژی یەکترن. وەك دیارە کۆبوونەوەی دوو دژیش ئەستەمە. سەرکردەش پیاوی ئەو جۆرە کاتە سەختانەیە، چونکە دەتوانێت ئەو جووتە دژە پێکەوە کۆبکاتەوە. واتە بڕیاری دروست لەکاتی پێویستدا.

٢- پێویستە هەموو سەرکردەیەك ئازایەتییەکی سروشتی تێدا بێت. هەرکەس بوێر نەبێت ناکرێت ببێت بە پێشەوا و سەرکردە. بۆیە بوێری و دلێری پەسنی دانەبڕاوی سەرکردەن. خۆ لەوانەیە ڕۆژێك بێتە ئاراوە کە بەتەنها بمێنێتەوە. ئیدی ئەوکات تەنها ئازایەتییە سروشتییەکەی فریای دەکەوێت و ڕزگاری دەکات لە سەرشۆڕی. ئا لەوکاتانەدا کە ناچار دەبێت بە تەنها خۆی کۆڵ و باری بانگەوازەکەی هەڵبگرێت، پێویستە بەجۆرێك ڕەفتار بکات هەروەك ئەوەی هەزاران کەس لە پشتیەوە بن، تاکو بتوانێت بگات بە ئامانجەکەی.

بەڵێ، دەبێت سەرکردە هەرگیز ترسی مردنی نەبێت. هەربۆیە گەر کەسێك لە هەموو شتێك بترسێت و بۆ هەر هەنگاوێك لەرز دایبگرێت، شیاوی ئەوە نییە ببێتە سەرکردەیەك کە کاری ڕێکخستن و کارگێڕیی کۆمەڵ ئەنجام بدات.

٣- سەرکردە خاوەن ئیرادەیەکی نەپساوە. هەرگیز لە بڕیارەکانی پاشگەز نابێتەوە و سازش لەسەر بیروباوەڕی ناکات. "ئومێد" هاودەمی ڕێگەیەتی و لێی جودا نابێتەوە، بێ ئومێدیش دوژمنی گەورەیەتی، کە تەنانەت بەخەونیش توخنی ناکەوێت. کۆسپ و ئاستەنگەکانی سەر ڕێی چەندە گەورە و سەختیش بن، خاوی ناکەنەوە و ئیرادەی لاواز ناکەن. دارای هێزێکی مەعنەوی و ڕۆحیەتێکی وەهایە زاڵ دەبێت بەسەر بێئومێدیدا. ئەگینا چۆن دەیتوانی ڕابەرایەتی گەل و نەتەوەیەك بکات؟ بەڵێ، سەرکردە خاوەن ئیرادەی پۆڵایینە.

٤- سەرکردە کەسێکە لە ئاست هەستی بەرپرسیارێتیی ئەرکەکانی سەرشانیدایە. ئەو هەستەش بەشێکی دانەبڕاوە لە بوون و کیانی. ئەگەر هەمووان یەك لەدوای یەك بڵاوەی لێبکەن و بەتەنها بمێنێتەوە، ئەو دیسانەوە ئامادەیی ئەوەی تێدایە هەتا کۆتا مەنزڵ بچێتە ژێر باری کۆڵ و ئەرکە قورسەکانی بانگەوازەکەیەوە. تا ئەوە ئەندازەی هەستکردنە بە بەرپرسیارێتی، هیچ کۆسپێکیش ناتوانێت ئەو هەستەی لاواز بکات.

٥- سەرکردە دەبێت دووربین بێت، لە چوارچێوەی سەردەمەکەی خۆی دەربچێت و بە دوربینی و بیرتیژی خۆی ئاراستەی ڕووداوەکانی داهاتوو بزانێت، وەك چۆن ڕووداوەکانی ڕابردووی بینیوە و لەسەر ئەو بناغەیە حوکم و بڕیارەکانی خۆی دەرکردووە. چونکە ئەگەر پێشهاتەکانی ڕۆژگار بەردەوام بەپێچەوانەی پێشبینی و خەمڵاندنەکانییەوە دەربچن، ئیتر چۆن دەتوانێت ببێتە چاوساغی ژێرمەندان!

پێویستە سەرکردە دواڕۆژ ببینێت، تاکو بڕیارەکانی یەکلاکەرەوە بن. ئەگینا ناچار دەبێت بەگوێرەی گۆڕانکارییەکانی ڕۆژ ئەویش بڕیارەکانی بگۆڕێت. ئەوەش بۆخۆی ئاڵۆزی و ناکۆکیی فیکری و دووبەرەکی لە ناو کۆمەڵەکەیدا پەیدا دەکات و دەبێتە مایەی هەرەسهێنانی پرۆژەکانی. بۆیە پێویستە سەرکردە خاوەن دیدگا و ئاسۆی فراوان بێت.

٦- دەبێت سەرکردە لەڕووی دەروونییەوە کەسێکی جێگیر و هاوسەنگ بێت و نەکەوێتە ژێر کاریگەریی هیچ ڕووداو و پێشهاتێکەوە. گەورەترین سەرکەوتن

لەخۆی بایی ناکات و نایگۆڕێت. لەحاڵێکدا ئەگەر دووچاری ئسکۆ و دۆڕانیش ببێتەوە، سڵ ناکاتەوە لەوەی لە دادگای ویژدانیدا لێپرسینەوە لە خۆی بکات.

سەرکردە کەسێکی دوورە لە ئەفسنزمی و بەردەوامە لە هۆنینی ژیانی سادە و ئاسایی. ژیانی بە ئاواز و ئەوایەکی ئارامەوە دەگوزەرێنێت. بگرە سەرکردەی ڕاستەقینە ئەوەیە کۆتایی ژیانی بە ئاستێکی بەرزتر بهێنێت لەو سەرەتایەی دەستی پێی کردووە. ئەوەش هەرگیز بەدەست نایەت مەگەر دەروونێکی خاکی و ڕۆحێکی تەندروستی نەبێت. ئەمەش بۆئەوەی ڕۆژە سەختەکانی ڕابردوو و هاوەڵە دێرینەکانی لەبیر نەکات.

٧- سەرکردە کەسێکە زۆر چاك دەزانێت مرۆڤەکان هەڵبسەنگێنێت و لە هەمووان زیاتر شارەزای کەسایەتیی ئەو تاکانەیە کە لەژێر سەرکردایەتی ئەودان. هاوکات خاوەن ئەزموونی تەواوە لەوەی کێ لە کوێدا بەکار دەهێنێت و بەرەو چ ئامانجێك دەیانخاتە گەڕ. کەسێك نەتوانێت ئەرکەکان بەگوێرەی لێوەشاوەیی و شایستەیی دابەش بکات، ئەوا نەك هەر ناتوانێت ڕۆڵی سەرکردە ببینێت، بگرە تەنانەت دەست نادات بۆ بەڕێوەبەرایەتیش.

لە بابەتی سپاردنی ئەرکدا سەرکردە شایستەترین کەس هەڵدەبژێرێت. ئەوە سەرکردەیە دەتوانێت بە باشترین شێوە هەڵبسێت بەو خەملاندنە و توانا و شارەزاییەکان بخاتە کارەوە و هەمیشە سوودیان لێ وەربگرێت. گۆڕانکارییەکان پاشگەزی ناکەنەوە لە بڕیارەکانی پێشووی. چونکە پێودانگێکی هەستیاری هەیە لە نرخاندنی تواناکان و کێشانەی پیاواندا. ئەمە بێگومان جگە لە هەندێك حاڵەتی دەگمەن کە هیچ مرۆڤێك ناتوانێت لێیان ڕزگاری ببێت.

٨- سەرکردە ئەو کەسەیە کە شوێنکەوتووەکانی خۆشدەوێت و هەریەکێکیان وا هەست دەکات کە ئەو لە هەمووان نزیکترە لە دڵییەوە. کەسێکە شوێنکەوتووەکانیشی خۆشیان دەوێت. متمانەی تەواوی بە پەیڕەوانی هەیە و ئەوانیش متمانەی تەواویان بەو هەیە.

٩- لە هیچ قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیاندا شتێك نییە کە وەك تاوان و خراپە بدرێتەوە بەناوچاویدا و پێی لەکەدار بکرێت. ڕابردووشی وەك ئێستای هەر ڕوون و بێخەوشە. خۆ ئەگەر کەسێك وردەکاری و توێژینەوەی ڕابردووشی بکات -بە نیازی باش بێت یان خراپ- خاڵێك نادۆزێتەوە جێی شەرمەزاری بێت. خۆ ئەگەر هەر هەموو دنیا دوژمنی بن -بەمەرجێك پابەندی ڕاستگۆیی تەواو بن و پەنا نەبەنە بەر شێوازی بوختان و درۆ- هەرگیز ناتوانن هیچ کەلێن و گومانێك لە پاکی یان ناوبانگ و شۆرەتیدا بەدی بکەن یان ناوی بزڕێنن.

١٠- سەرکردە خاوەن کەسایەتییەکی فرەلایەنە. لە هەر ڕوویەکەوە بیگریت جێ پەنجەی دیارە لەناو کۆمەڵگەدا. لە دنیای کەسایەتیی ئەودا شوێنێك نییە بۆ نەنگی یان لاوازی. هەر وردبینییەکیش لەم بوارەدا خزمەت بەم تایبەتمەندییەی دەکات.

لاپەڕەکانی مێژووی مرۆڤایەتی ژمارەیەکی بەرچاو سەرکردەی نەفسانەییان تۆمارکردووە. بەڵام لە هیچ یەکێکیاندا تەواوی ئەو ئامادەییانە نابینین کە لە سەرەوە تیشکمان خستە سەر. تەنانەت ژمارەی ئەوانەیان کە چەند دانەیەکیان لە خۆیاندا کۆکردووەتەوە، تابڵێیت کەمە.

ئەسکەندەری گەورە، هانیباڵ، ناپلیۆن، هیتلەر.. وە لەناو مێژووی خۆشماندا: صەلاحەدینی ئەیوبی، محەممەد فاتیح، تاریقی کوڕی زیاد... هتد. بێگومان هەریەك لەمانە سەرکردەی مەزن بوون. بەڵام ئەگەر لە گۆشەنیگای ئەو تایبەتمەندییانەوە هەڵیان بسەنگێنین کە لە سەرەوەدا باسمان کرد، بۆمان دەردەکەوێت کە هەرگیز بواری بەراوردیان نییە بە سەرکردەی سەرکردەکان، حەزرەتی محەممەد (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ).

بەڵێ، لە هەموو جیهاندا تەنیا کەسێك هەیە توانیویەتی هەموو سیفەتەکانی سەرکردەی سەرکەوتووی تێدا کۆببێتەوە، کە هیچ کەموکوڕییان تێدا نەبێت و لە بەرزترین لوتکەدا بێت، بەدڵنیاییەوە ئەویش سەروەرمان حەزرەتی محەممەدە (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ)، چونکە پێغەمبەری خوایە. سەرجەم ڕێکارەکانیشی لەژێر سایەی چاودێری و کۆمەکی پەروەردگاردا ئەنجامداوە.

## ١. ڕوانینێکی خێرا بە ژیانیدا

هەموو بڕیارەکانی زۆر چاپووك و دروست بوون. پاشگەزبوونەوەیان شکست لە بڕیارەکانیدا نەبینراوە. پێشتر چەندین نموونەمان لەوبارەیەوە پێشکەشکردن، بە تایبەت ئەو بڕیارە دروستانەی کە لە هەردوو جەنگی ئوحود و حونەیندا دەریکردن و بوونە مایەی دەربازکردنی سوپاکەی لە ئسکۆیەکی مسۆگەر.

هەر بە سروشت سەروەرمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) خاوەن فیترەتێکی ئازا و چاونەترس بوو. ڕێبازێکی درێژ و دژواری گرتە بەر و بەربەرەکانێی هەموو جیهانی پێکرد. هەر لەو ڕێگەیەدا و بێئەوەی سڵ لە هیچ کەسێك یان تاقمێك بکاتەوە، بەردەوام بوو لە ڕێکردنی خۆی. بگرە هەرکاتێك ئەدگاری نشوست

به سوپاکەیەوە ببینرایە، دەمودەست ئەسپەکەی تاودەدا و بەبێ هیچ ترس و دڵەڕاوکێیەك هەڵمەتی دەبرد.[1] تەنانەت قارەمانێکی وەك حەزرەتی عەلی دەیوت ''ڕاستییەکەی لە جەنگدا ئێمە خۆمان دەدایە پاڵ پێغەمبەری خوا. ئەو لە هەموومان زیاتر لە دوژمنەوە نزیك بوو، لەو ڕۆژەدا لە هەمووان بەزەبرتر بوو.''[2]

ئیمامی بوخاری لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە دەگێڕێتەوە ''لەدەمی گەڕانەوە لە غەزای نەجد، پاش شەکەتی و ماندوو بوونێکی زۆر، پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و هاوەڵانی لەناو دۆڵێکی پڕ لە پووش و دڕکوداڵدا بارگەیان خست. خەڵکیش بە ژێر درەختەکاندا بڵاوەیان کرد و خەوتن. پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەژێر دارێکی سەموورەدا دابەزی و شمشێرەکەی پێدا هەڵواسی و لە سێبەریدا خەوت. کتوپڕ پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) بانگی کردین، دەبینین دەشتەکییەکی لەتەنیشتەوە وەستاوە. فەرمووی: کاتێك خەوتبووم ئا ئەمە شمشێرەکەمی گرتبوو بەدەستەوە، کە خەبەرم بوویەوە دەبینم لە کێلان دەری هێناوە و پێم دەڵێت ''ئادەی بڵێ، ئێستا کێ هەیە لە من دەربازت بکات؟'' منیش سێ جار وتم ''اللّٰه'' کابرای دەشتەکی شمشێرەکەی لەدەست کەوتبووە خوارەوە و سەروەریشمان هەڵیگرتبوویەوە و بەدەستییەوە گرتبوو. وێڕای ئەوەش پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) سزای نەدا. ئەوەیە ڕادەی ئازایەتی پێغەمبەر و، سنووری متمانە و پشتبەستنی بە خوای گەورە.[3]

شەوێك دەنگێك خەڵکی مەدینەی زۆر ترساند. خەڵك بە ئاڕاستەی سەرچاوەی

---

١. صحيح البخاري، الجهاد ٥٢؛ صحيح مسلم، الجهاد ٢٨.

٢. أحمد بن حنبل، المسند ٨٦/١؛ إبن أبي شيبة، الموصنف ٤٢٦/٦، ٣٥٤/٧.

٣. صحيح البخاري، الجهاد ٨٤، المغازي ٣١.

دەنگەکە ڕۆیشتن، پێش کەمێك چاوەکان مەلۆیەك تۆزیان لەبەرامبەر خۆیانەوە بینییەوە کاتێکیش تەپو تۆزەکە ڕەویەوە، ئەوەی دەرکەوت سەروەری هەردوو جیهان بوون (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ). تەنانەت ئەسپە لەڕ و بێهێزەکەی تەڵحەش، ئەو شەوە لەخۆشی ئەوەی پێغەمبەر سواری بووبوو، هەروەك بڵێیت پێشبڕکێی لەگەڵ ڕەشەبادا دەکرد. ئەم پێغەمبەری خوایەی کە بەتەنها دەڕۆشت بەرەو ڕووی دەنگێکەوە کە هەموو کەسێکی دەترساند، حاڵەتێکی دەرەسای وەها نمایش دەکات کە سنورە ئاسییەکانی مرۆڤی تێپەڕاندووە. پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێش خەڵك بەرەو دەنگەکە ڕۆیشتبوو و لەوسەرەوە دەهاتەوە. پێشی لە خەڵکەکە گرت و فەرمووی "مەترسن، مەترسن!" ئەوکاتە بەسەر ئەسپەکەی ئەبوتەڵحەوە بوو کە کورتانی پێوە نەبوو، شمشێرەکەشی لەملدا بوو."[1]

ئەو یەکەم کەس بوو دەنگەکەی بیستبوو، بۆیە دەستبەجێ سواری ئەسپەکەی ئەبوتەڵحە بووبوو[2] و بەرەو ئاڕاستەی دەنگەکە غاری دابوو. وەختێکیش بێخەم ببوو لەوەی هیچ مەترسییەك لەئارادا نییە، گەڕابووەوە.

ئەوکاتەی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکر لە ئەشکەوتەکەدا بوون و بتپەرستان لێیان نزیکبوونەوە، حەزرەتی ئەبوبەکر لەتاو پەرۆشیی بۆ ژیانی نازدار ترس دایگرت، ئەویش فەرمووی "ڕات چییە سەبارەت بە دوو کەس کە سێیەمیان خوایە؟!" بەوە ترس و پەرۆشیی یاری غار ڕەوییەوە و ئارامبووەوە.[3] یان ئایا لەوکاتەدا کە دوژمنەکانی ڕق و تووڕەیی کوێری کردبوون و گەمارۆی ماڵەکەیان دابوو، کەچی ئەو بەوپەڕی دڵنیاییەوە

---

١. صحيح البخاري، الأدب ٣٩؛ صحيح مسلم، الفضائل ٤٨.

٢. صحيح البخاري، الأدب ٣٩؛ صحيح مسلم، الفضائل ٤٨.

٣. صحيح البخاري، فضائل الأصحاب ٢؛ صحيح مسلم، فضائل الصحابة ١.

لە ماڵەکەی هاتە دەرەوە و بەناویاندا تێپەڕی. ئایا ئەوە بە ئازایەتییەکی بێوێنە دانانرێ؟ پێغەمبەری سەروەر (عَلَيْهِ الْصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ئیرادەیەکی وەها پتەوی هەبوو کە لە هیچ هەلومەرجێکدا لەرزەی پێ نەدەکەوت و نەدەچەمایەوە. چونکە پەیوەست بوو بە ویست و ئیرادەی خوای خاوەن توانستی ڕەهاوە.

## ٢. لوتکەی مەزنی

پێش لەدایکبوونی باوکی مردبوو، واتە هەر لە سکی دایکیدا بێنازکەوت. بۆیە وا ڕانەهاتبوو پشت بە باوکی ببەستێت و چاوەڕێی هاوکاری لە کەس بکات. دیارە ئەو پشتبەستنە لە مرۆڤدا سستی و خاوی دروست دەکات. لەبەرئەوە پەیامەکەشی پەیامی ئاودان بوو بە ئیرادەی مرۆڤ.

تەمەنی شەش ساڵ بوو دایکی ماڵئاوایی لە دنیا کرد. دیارە دایک بە گەورەترین پاڵپشت دادەنرێت بۆ مرۆڤ و هیچ شتێکیش ناتوانێت جێگەکەی پڕبکاتەوە. کەواتە ئەو پاڵپشتەشی لێسەنرایەوە. ڕووداوەکان پەروەردەیان دەکرد. هەربۆیە ئیرادە و ویستی ئەو فەخری عالەمە ڕۆژ بەڕۆژ بەهێزتر دەبوو. لە هەشتەم ساڵیدا باپیرەی لەدەستدا. ئەو باپیرەیەی کە پشت و پەنا بوو بۆ مەککە و مەککەییەکان. بەڵام ئەویش ئاوا بوو...

بەم ڕووداوانە خوا دەیویست پێغەمبەرەکەی ئاڕاستە بکات بۆلای کانگای متمانە و سەرچاوەی ئەمن و ئەمان؛ خوای تاک و باڵادەست. هەروەها خوا دەوری چۆڵ دەکات و دەستی بەتاڵ دەکات لە هەرشتێک کە بۆی ببێتە یاریدەدەر یاخود سێبەر. بەڵێ، خۆی هاوکاری دەکات، پشتی دەگرێت و پەروەردەی دەکات. ڕاستە لەوانەیە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ)

بەپێی سروشتی مرۆڤانەی لەگەڵ لەدەستدانی هەر پاڵپشتێکدا تووشی هەوان و داخورپانێك بوویێت، بەڵام پێویست بوو بەتەواوی خۆی ئامادە بکات بۆ هەڵگرتنی ئەرکی هەرە گەورە کە چاوەڕێی بوو، زیاتر و زیاتریش ئیرادەی دەمەزەرد بکاتەوە تاکو کەمێك ورەی لەدەست نەدات و دڵەڕاوکێ توخنی هەرێمی پاکی نەکەوێت. خۆ ئەگەر هەموو دنیایش دەستی لێ بکێشایەتەوە و خۆی بە تەنها بمایەتەوە.. خۆ ئەگەر ئەوەش ڕوویبدایە کە هەرگیز ڕووی نەداوە، ئەوا سەبارەت بەو هیچ شتێك نەدەگۆڕا و لە ڕێکردنی خۆی هەر بەردەوام دەبوو. خۆ ئەگەر ئەوە ئاکاری نەبووایە، ئیدی چۆن دەیتوانی پاش ئەو هەموو بەڵا و نەهامەتییە هاوەڵەکانی کۆبکاتەوە و فەرمانیان پێبکات تا بکەونە دوای دوژمن و ڕاوی بنێن؟ ئەوەندە خاوەنی ئیرادەیەکی بەهێز بوو، وێڕای ئەو برین و زامانەی تووشی خۆی و یارانی بووبوو، کەچی لەپێشی پێشەوەی سوپاکەیەوە دوژمنی ڕاوەدوو دەنا.

لە سەرتاپای ژیانیدا ساتێك نییە دوودڵی پێوە دیاربێت. سەرباری ئەوەی هەریەك لە هاوەڵانی وەك شێری ئازا وەها بوون، کەچی بەملاو ئەولادا پەرتەوازە دەبوون. بەڵام ئەو لە جێگەی خۆی هاوشێوەی چیای ئەبزواو یەك هەنگاو نەهاتە دواوە. بەڵێ، بەڕاستی ئیرادەی ئەو ئیرادەیەکی پۆڵاین بوو.

لە مەککە ئازارێك نەمابوو دووچاری نەبێتەوە، بەڵام ئەو لەرزەی پێ نەکەوت. سەرەتا هاوسەرەکەی، پاشان مامی کە گەورەترین پاڵپشتی بوون، مردن. بەڵام ئەو دیسانەوە بێئومێد نەبوو.

وەختێکیش سەردانی تائیفی کرد، بەردبارانیان کرد و لاشەی پیرۆزیان خەڵتانی خوێن کرد و کەوتنە شوێنی، هەتا گەیشتە ناو بێستانێك. لەوێ فریشتەیەك خۆی بۆ دەرخست و پێی وت "ئەگەر دەتەوێت ئامادەم ئەو

شاخە هەڵبگرم و بیدەم بەسەر خەڵکەکەیدا!“ هەرچەندە خوێن بە لاشەی پاکیدا چۆڕەی دەکرد، بەڵام لە بەرامبەر ئەم مرۆڤانەوە کە ئەمەیان بەسەر هێنابوو هیچ گۆڕانێك لە ئیرادەیدا ڕووی نەداوە و بە وتنی "نەخێر" داواکاری فریشتەکەی ڕەتکردووەتەوە. ئامان خودایە ئەمە چ ئیرادەیە کە لە حاڵێکی هێندە سەختیشدا هێندەی تاڵە موویەك لەسەر هێڵی باوەڕ و پتەویی خۆی لانادات.[1]

ئەو ئیرادەیە ئەوەندە ناوازەیە تەنانەت تاڵەموویەك لە بڕیاری خۆی نەکشاوەتەوە. کەواتە مرۆڤ دەتوانێت تاکو مردن شوێن ئەو سەرکردەیە بکەوێت و هەموو شتێکی خۆی فیدای بکات. ئاخر چۆن دەکرێت شوێن کەسێك بکەویت کە ئیرادەی لاواز بێت و زوو زوو ڕایەکانی بگۆڕێت و لەکاتی تەنگانە و سەختیدا هاوەڵانی بەجێ بهێڵێت و پاشگەز ببێتەوە لە چەندین بڕیار و بۆچوون کە پێشتر بە هەزاران کەس قوربانییان لە پێناویدا داوە. لەکاتێکدا وا چاوەڕوان دەکرا ئەویش قوربانی بدات و بەشداری بکات؟ چۆن دەبێت کەسێکی لەوجۆرە ببێتە پێشەوا و سەرکردە؟ مەگەر هەر نموونەی ئەوانە نین کە لافی سەرگەورەیی و سەرکردایەتی لێ دەدەن و بوونەتە هۆی ئەو ڕەشبینی و ڕەجاڵییەی کە بەرۆکی مرۆڤی ئەم سەردەمەیان گرتووە؟

پێغەمبەری پێشەوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مرۆڤی بەرپرسیارێتی و پاڵەوانێك بوو لە پاڵەوانە ئیرادە بڵندەکان. ئەو نیگا ئاسمانییەی دابەزییە سەر ئەو، ئەگەر بۆ سەر چیا دابەزیبا وردوخاش دەبوو. ئەرکی سەرشانی؛ ئاساندنی بەدیهێنەری جیهانیان بوو بە یەك بەیەکی مرۆڤەکان. فەرمانبەرییەکەی ئەوەندە قورس بوو، وەك ئەوە وابوو بە تورێکڵە هێلکە ئاوی زەریا خاڵی بکەیتەوە. بەڵام خۆشەویست

---

١. إبن كثير، البداية و النهاية ١٣٧/٣.

ئەو ئەركەی بەبێ دڵەڕاوكێ خستە سەر شانی خۆی. توانا جیاوازەكانی هەریەك لە پەیڕەوانی لە زەمینەی خۆیدا بەگەڕخست و لە دڵەكاندا تەختی هەمیشەیی دانا.

ئامانجی بوونی ئەو بریتی بوو لە گەیاندنی بانگەوازی ئیسلام. هەرگیز تووشی نیگەرانی نەبووە سەبارەت بە كاروباری دنیا و دوارۆژ. هیچ شتێك ئەو ئامانج و لێپرساویەتییەی لەبیر نەدەبردەوە، نە بینینی بەهەشت و، نە گەیشتنی بە پایەی "قَابَ قَوسَیْن" لە شەوی میعراجدا. لەوجێگەیەوە كە ئەستێرەكان لەژێر پێیدا وەك چەو ڕیزكرابوون، گەڕایەوە بۆ ئەم دنیایەی كە پڕیەتی لە ئازار و سەختی و مەینەت. چونكە ئەو بە هەموو گەردیلەیەك لە گەردیلەكانی بوون و گیانی هەستی بەو ئەرك و لێپرساوێتییە دەكرد.

لە ڕاستییدا پێویست بە درێژ كردنەوەی قسەكان ناكات. ئەو مرۆڤێكە وەها بە گوێڕەی ئەركەكەی بەرنامەڕێژی كراوە كە هەر لەسەر مەلۆتكەوە "أُمَّتي.. أُمَّتي" وتووەتەوە، حاڵیشی لە ڕۆژی مەحشەردا هەر درێژە و تەواوكاری ئەو هەست و شعوورەیە، لەوێش كڕنوش كڕنوش دەبات و دەفەرمووێت "أُمَّتي.. أُمَّتي". لەڕاستیدا كەس نەبووە جگە لەو بتوانێت شان بداتە ژێر ئەو فەرمانبەرییە مەزنە. دەتوت هەر لە یەكەمین مرۆڤەوە تاوەكو دوایین مرۆڤ بەرپرسیارێتی سەرجەم مرۆڤایەتی گرتووەتە ئەستۆ.

پێغەمبەر (عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) خاوەن بینایی و فەراسەتێك بوو مەوداكانی كات و شوێنی تێ دەپەڕاند. جا هەر ئەوەندە؟! سەرنجی ئەو دەگەیشتە جیهانی نادیار و دەیبینی، ئەی هەر ئەو نەبوو كە هەر لەم دنیایەدا باسی جیهانی بەهەشت و دۆزەخ و سیراط و مەحشەری بۆ دەكردین؟

ئەو جیهانانەی بە چاو دەبینی ئەوسا بۆ ئێمەی باس دەکرد. هەروەك پێشتریش چەندجارێك دووپاتمان کردەوە، ڕووداوەکان هەموو ئەو فەرموودانەی ئەویان پشتڕاستکردەوە کە سەبارەت بە داهاتوو فەرمووبوونی. ئاماژەی بە هەرچییەك کردبێت، لەکاتی خۆیدا وەك خۆی هاتووەتە دی. چەندین فەرمایشتی دیکەش هەن کە هێشتا چاوەڕێی دەرکەوتنن. بۆ ئەوەی لە ئاستی دووربینی ئەو تێبگەیت، فەرموو بڕوانە بۆ ڕێکەوتننامەی حودەیبیە، کە پێشتر بە درێژی باسمان لێوەکرد.

## ٣. وەك خۆی مایەوە

ئازیز (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) چۆن ژیانی دەستپێکردبوو هەر بەوجۆرەش کۆتایی پێهێنا. واتە مایەی شانازیی بوونەوەران لەسەر هەمان شێواز و بەگوێرەی هەمان پێوەر و بنەما دەڕۆیشت و هیچ نەگۆڕا. لە دەستپێکی بانگەوازدا کە تەنها ئافرەتێك و منداڵێك و کۆیلەیەك و ئازادێك بەدەم پەیامەکەیەوە هاتبوون چۆن ڕەفتاری دەکرد، لەکاتی حەجیماڵئاواییشدا کە قسەی بۆ زیاتر لە سەد هەزار کەس دەکرد، هەر هەمان ڕەفتاری دەنواند. بگرە لە هەرەتی سەرکەوتندا خاکی و خۆنەویستیی زیاتر دەبوو. ئەو تاکە سەرکردەیە کە بەدرێژایی ژیانی نەگۆڕاوە و وەك خۆی ماوەتەوە. بیر لەوە بکەنەوە کە چۆن مامەڵەی خۆی بەرامبەر ئەوانە نەگۆڕی کە بووبوونە هۆکاری تاڵی و ئەشکەنجەی چەندین ساڵە! وەختێکیش لەناکامی بەرفراوانبوونی بانگەوازەکەیەوە خەڵکانێکی زۆری تازە و خاوەن توانا و شارەزایی گەورە پەیوەندییان پێوەکرد و بازنەی هاوەڵەکانی فراوان بوو، ئەو هەرگیز دۆست و هاوەڵە دێرینەکانی لەبیر نەچووەوە و پێشتر چۆن بوو هەرواش مایەوە.

## ٤. بێهاوتا لە خاکیبووندا

ڕۆژێکیان لەگەڵ هاوەڵانی دانیشتبوو نانی دەخوارد، لەوکاتەدا ژنێکی بەدزوبان بەلایاندا تێپەڕی، کە پێغەمبەری بینی وتی "تەماشا بکەن، هەروەك کۆیلە دانیشتووە و نان دەخوات. پێغەمبەریش (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی "بۆ مەگەر کۆیلەی لە من باشتر هەیە؟! من بەندەی خوام (جَلَّ جَلَالُهُ) " بەدوایدا ئافرەتەکە دەڵێت "بۆخۆی نان دەخوات و بەشی من نادات؟" ئەویش دەفەرموێت "دەی بخۆ! ئەویش لەبەرامبەردا دەڵێت "ئەوە دەخۆم کە لەناو دەمتدایە." پێغەمبەریش (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) خواستی ژنەی بەجێهێنا. بەم هەڵوێستە شەرم و حەیایەك زاڵ بوو بەسەر ئەم ژنەدا کە هەتاکو مرد بەدزوبانی بەرامبەر کەس نەنواند.[1]

"خوا جوبرەئیلی لەگەڵ فریشتەیەك نارد بۆ خزمەت پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ عَلَيْهِ). فریشتەکە پێی وت "ئەی محەممەد! خوا سەرپشکی کردوویت لەنێوان ئەوەی ببیتە پێغەمبەرێکی بەندە یان پێغەمبەرێکی پادشا؟" پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لای کردەوە بۆ جوبرەئیل، وەك بیەوێت پرس و ڕای پێ بکات، ئەویش ئاماژەی بۆ کرد، مەبەستی ئەوە بوو بڵێت "خاکی بە"، ئەویش فەرمووی "دەمەوێت ببمە پێغەمبەرێکی بەندە."[2]"

ئێمە باس لە سەردەمانێك دەکەین کە لە هەموو گۆشەیەکی دنیاوە دەستکەوت و سامان و دیاری بۆ دەهات، بەڵام ئەو تێکڕای دیاری و دەستکەوتەکانی بەسەر هاوەڵانیدا دابەش دەکرد و هیچی بۆ خۆی نەدەهێشتەوە. بەدرێژایی

---

١. الطبراني، المعجم الكبير ٢٠٠/٨.

٢. أحمد بن حنبل، المسند ٢٣١/٢؛ أبو يعلى، المسند ٤٩١/١٠.

ژیانی شێوازی ڕەفتار و مامەڵەی نەگۆڕا. وەختێکیش وەك سەرکردەیەکی فاتیح چووە ناو مەککەوە، لەڕووی خاکیبوون خۆبەکەمگرتنەوە ئەوندە سەری دانەواندبوو، خەریکبوو چەناگەی پیرۆزی بدات لە پشتی وڵاخەکەی.[1]

جارێکیان سەعدی کوڕی موعاز هاتە خزمەتی، ئەویش بە دانیشتووانی کۆڕەکەی فەرموو "لەبەر گەورەتان هەستنەوە!"[2]، بەڵام ئەو نازدارە نەیدەهێشت خەڵکی لەبەر خۆی هەڵبستنەوە و دەیفەرموو "هاوشێوەی عەجەمەکان هەڵمەسنەوە و دەستەونەزەر ڕامەوەستن!"[3]

شەوی میعراج پێشنوێژی بۆ هەموو پێغەمبەران کرد.[4] کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پایەبەرز و گەورەییەی خەڵاتی کرابوو، ئەویان نەگۆڕی و فەرمووی "بەسەر موسا پێغەمبەردا پەسەندم مەکەن!"[5]

وێڕای ئەوەی چەندین جار لەبەر چاویدا پەردەی غەیب لادراوە، کەچی جارێکیان کە سەردانی یەکێك لە هاوسەرەکانی کرد، بینی چەند کەنیزەکێك دەف لێ دەدەن و باوك و کەسوکاریان دەلاوێننەوە کە لە بەدردا شەهیدکرابوون، یەکێك لە کەنیزەکەکان وتی "پێغەمبەرێکمان لەناودایە کە دەزانێت بەیانی چی دەبێت." ئەو سەروەرەش پێی فەرموو "ناوا مەڵێ، بەڵکو ئەوە بڵێ کە پێشتر دەتوت." لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت "ئەمەیان نا، وا مەڵێن، چونکە جگە لە خوا کەس نازانێت بەیانی چی دەبێت."[6]

---

١. بروانە: إبن هشام، السيرة النبوية ٦٣/٥؛ أبو يعلى،المسند ١٢٠/٦.

٢. صحيح البخاري، الإستئذان ٢٦؛ صحيح مسلم، الجهاد ٦٤؛ إبن حجر، الإصابة ٨٥/٣.

٣. سنن أبي داود، الأدب ١٥٢؛ إبن ماجة، الدعاء ٢؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٥٣/٥.

٤. الطبراني، جامع البيان ٣/١٥؛ إبن كثير، البداية و النهاية ١١٠/٣.

٥. صحيح البخاري، الأنبياء ٣١؛ صحيح مسلم، ال فضائل ١٥٩-١٦٠.

٦. صحيح البخاري، المغازي ١٢؛ سنن الترمذي، النكاح ٦.

بەڵێ، تاقانە مرۆڤ و سەرکردەیەك کە بەدرێژایی ژیانی وەك خۆی ماوەتەوە، حەزرەتی محەممەد (پێغەمبەری خوا)یە (عَلَيهِ أفضَلُ الصَّلاةِ وَأتَمُّ التَّسلِيم).

## ٥. دۆزینەوەی توانا و لێهاتنەکان

لە مێژوودا کەسێك نەبووە وەك ئەو بتوانێت درك بە توانا و لێوەشاوەیی پەیڕەوانی بکات. کە بڕیاری کۆچ درا بۆ حەبەشە، جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبی هەڵبژارد تا ببێتە پێشەوای کۆچەرەکان. جەعفەریش لە گفتوگۆکەی لەگەڵ نەجاشیدا سەلماندی کە ئەو هەڵبژاردنە زۆر لەجێی خۆیدا بووە.[1]

موصعەبی کوڕی عومەیر یەکەم کەس بوو کە وەك ڕابەر و مامۆستا ناردی بۆ مەدینە. ئەو کارانەی موصعەب لە مەدینەدا جێبەجێی کردن و، ئەو خزمەتانەی پێشکەشی بانگەوازی ئیسلامی کرد، باشترین و ڕاسترین شایەتن لەسەر دروستیی هەڵبژاردنی. مەدینەش زۆر پێویستی بە پیاوێکی نەرم و نیانی ڕووخۆشی وەك موصعەب هەبوو، بۆیە پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ) هەڵی بژارد بۆ ئەو ئەرکە مەزنە.[2]

لە شەوی کۆچدا دەبوو یەکێك لە جێگەکەیدا بخەوتنایە تاکو بتپەرستانی پێ چەواشە بکات. ئەگەری ئەوەش لەئارادا بوو ببووایەتە قوربانی ئەو پیلانەی بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) دانرابوو. بۆیە دەبوو پاڵەوانێکی چاونەترسی وەك حەزرەتی عەلی دیاری بکرێت تاکو ئەو ئەرکە ڕاپەڕێنێت.[3]

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ١/٢٠١-٢٠٢.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٢/٢٨١.

٣. إبن هشام، السيرة النبوية ٣/٨-٩.

ئەوجا دەبوو کێ ببووایەتە هاوەڵی کۆچ و یاری غاری؟ دەبوو خەڵکی مەدینە چ کەسێك بە یاوەریی پێغەمبەرەوە ببینن؟ ئەوەبوو بڕیاری دا ئەو کەسە حەزرەتی ئەبوبەکر بێت کە هەتا سەر پێگەی هاوەڵی دووهەمینی بۆ خۆی پاراست.[1] هەر لەسەرەتاوە "صدّیق"ی دیاریکردبوو بۆ ئەو پایەیە، ئەویش هەتا دواسات لەو پێگەیەدا مایەوە. چونکە هەر لەسەرەتاوە دیاریکردنەکەی سەرکەوتووانە بوو.

ئاشکرایشە کە جێ پەنجەی لە هەڵبژاردنی هەموو خەلیفەکانی ڕاشیدین لەدوای خۆی دیارە. واتە وا پێویست بوو کە ئەبوبەکر یەکەم و، دووەم عومەر و سێیەم عوسمان و چوارەم عەلی بێت (رضيَ اللهُ عَنْهم). چونکە سنووری ئەجەلیان کە قەدەر دیاری کردووە، داخوازی ئەو ڕیزبەندییە بووە. دەی خۆ ئاشکرایە کە خوای باڵادەست خۆی ئەو کارەی ڕێکخستووە و هەڵی سووڕاندووە.

لە هەموو دەستنیشانکردنەکاندا سەرکەوتوو بووە، هەر لە پێدانی شمشێرەکەی بە ئەبودوجانە لە غەزای ئوحوددا،[2] تا دەگاتە سپاردنی ئەرکی چاندنی ناکۆکی لەنێوان قورەیش و جولەکەکان بە نوعەیمی کوڕی مەسعود لە غەزای خەندەقدا.[3] هەمیشە بەو هزرەوە ڕەفتاری دەکرد کە هەر ئەرکێك بسپێرێت بە کەسی شیاوی خۆی.

حوزەیفە شیاوی ئەوە بوو نهێنی بپارێزێت، بۆیە کردی بە ئەمینداری هەندێك لە نهێنییەکانی.[4] عەباسی مامی ڕاسپارد لە مەککەدا کاری هەواڵگری بۆ بکات، مامیشی بە باشترین شێوە هەستا بەو کارە.[5]

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ١٣/٣.

٢. صحيح مسلم، فضائل الصحابة ١٢٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٢٣/٣.

٣. إبن هشام، السيرة النبوية ١٨٨/٤.

٤. صحيح البخاري، فضائل الصحابة ٢٠.

٥. إبن حجر، الإصابة ٦٣١/٣.

دیاریکردنی سەرکردەکان و هەڵبژاردنی ئەو نێرراوانەی کە ناردنی بۆ لای پادشا و فەرمانڕەواکان و.. دەستنیشانکردنی ئەو هاوەڵە زانستخوازانەی کە دەبوونە خۆری زانست لە ئایندەدا و.. دیاریکردنی کارمەندان بۆ کۆکردنەوەی زەکات، هەر هەموویان لەجێی خۆیاندا بوون و ڕۆژگاریش لەسەر زاری ڕووداوەکان ڕاست و دروستیی ئەو هەڵبژاردنانەی سەلماند.

بەڵێ، زۆرگرنگە سەرکردە بە چاکی جۆر و کەسایەتیی ئەو تاکانە بناسێت کە ئەرکیان پێ دەسپێرێت. مێژوو ژمارەیەکی زۆر و زەبەندە هەڵەی گەورە دەگێڕێتەوە کە سەرکردە و سەرگەورەکان لەم بوارەدا ئەنجامیان داون. چەندین سەرکردە هەن خیانەتیان لەلایەن ئەوانەوە لێکراوە کە لە خۆیان نزیککردوونەتەوە و کردوویانن بە کەسانی ڕازپارێزی خۆیان.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەرقەمی کوڕی ئەبوئەرقەمی ڕاسپارد بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دارایی. لەسەردەمی خەلافەتی حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەریشدا لەسەر ئەو پۆستە هەر بەردەوامبوو. بەڵام لەسەردەمی حەزرەتی عوسماندا کاتێك سامانی تایبەتی خۆی بە هەندێك لە خزمانی خۆی بەخشی، دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە گوایە حەزرەتی عوسمان فەزڵی هۆزی ئومەمەیەی داوە بەسەر باقی موسڵماناندا. لەئاست ئەم دەنگۆیەدا ئەرقەمی کوڕی ئەبوئەرقەم هات بۆ لای پێشەوای باوەڕداران و کلیلەکانی گەنجینەی پێ سپاردووە و پێی وت "لەم هەلومەرجەدا و لەسایەی ئەم تۆمەتانەدا من ناتوانم کار بکەم."[١] بەڵێ، تا ئەو کاتەی بەویستی خۆی دەستی لەکارەکەی کێشایەوە، واتە بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەك لە ئەرکەکەی بەردەوام بوو.

---

١. ابن حجر، الإصابة ٤٣/١.

## ٦. خۆشەویستی دڵان

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) سەرکردەیەك بوو خەڵکی خۆشدەویست و خەڵکیش ئەویان خۆشدەویست، بەرادەیەك کە هەر یەکێکیان وای دەزانی پێغەمبەری لە هەموو کەس زیاتر خۆشدەوێت و، پێغەمبەریش (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوی لە هەمووان زیاتر خۆشدەوێت.

ئەو (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) ئەوینددار بوو. بەر لە کۆچی دوایی چەندین جار لەناو مزگەوتدا لای دەکردەوە بەلای هاوەڵانیدا و سەیری ڕوخساری دەکردن و چاوەکانی فرمێسکیان هەڵدەڕشت. چونکە دەیزانی بەم زووانە لێیان جیا دەبێتەوە و ئیتر لە دنیای ڕۆشندا نایانبینێتەوە. کاتی ئەوە هاتبوو کۆچ بکات بۆ حزووری پەروەردگاری. ئاسماننشینان بەتاسەوە چاوەڕێی بوون. بەڵام ئەو کە نموونەی وەفا و ئەمەك بوو، فرمێسکی دەڕژاند و دڵتەنگ بوو بۆ جیابوونەوەی لە هاوەڵە خۆشەویستەکانی.[1]

هاوەڵەکانی خۆشدەویست و پارێزگاری لێدەکردن، لەبارەیانەوە دەیفەرموو "خەڵکینە جنێو بە یارانم مەدەن، هەروەها دەیفەرموو "هاوەڵانم وەك ئەستێرەن، شوێن هەرکامیان بکەون ڕێگەی ڕاستتان گرتووە."[2] هەروەها چەندین فەرمایشتی تریش کە دەبنە بەڵگەی ئەو خۆشەویستی و پاراستنە.

هەروەها خەڵکیش ئەویان خۆشدەویست، خۆشەویستییەك کە پەسنکردنی لەتوانادا نییە. ئەو خۆشەویستییە لە کرۆکی دڵانەوە سەرچاوەی گرتبوو. مەگەر خۆشویستنی ئەو بەڵگە نییە لەسەر کامڵبوونی ئیمانی ئیمانداران؟

---

١. البزار، المسند ٣٩٥/٥.

٢. الديلمي، المسند ١٦٠/٤.

هاوەڵانی کە لە لوتکەی باوەڕدا بوون، لە بڵندترین ئاستدا ئەو ئازدارەیان خۆشدەویست (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).[1]

بێباوەڕانی قوڕەیش حەزرەتی خوبەیبیان لەلای ئاوی "الرجیع" بەدیلگرت و هێنایان بۆ جێگەی لەسێدارەدان، لێیان پرسی "ئایا پێت خۆش بوو ئەگەر محەممەد لە جێگەی تۆ بووایە و تۆش لەناو ماڵ و منداڵی خۆتدا بێوەی دابنیشتیتایە؟" ئەگەر بیوتایە بەڵێ لەوانەبوو ئازادیان بکردایە، بەڵام ئەو بەم جۆرە وەڵامی دانەوە "نە سوێند بەخوا حەز ناکەم تەنانەت دڕکێکیش بچێت بە پێیەکانیدا."[2]

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی ئوحود، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پیاوێکی نارد تا سەعدی کوڕی ڕەبیع بدۆزێتەوە. کە دۆزییەوە زۆر بەسەختی بریندار بووبوو، لە حاڵی پرسی، ئەویش وتی: تازە من بە مردوو لەقەڵەم دەدرێم، بەڵام سەلامم بە پێغەمبەری خوا بگەیەنە سوێند بەخوا لەو دیو کێوی ئوحدەوە بۆنی بەهەشت دەکەم، هەروەها سەلامم بە هۆزەکەت بگەیەنە و پێیان بڵێت: سەعدی کوڕی ڕەبیع پێتان دەڵێت "هەتا چاوێکتان بە تروکاوی بمێنێت و ڕێگە بدەن کەس دەستی خراپەی بگاتە پێغەمبەر، ئەوا بزانن لەلای خوا هیچ بیانوویەکتان لێ قبووڵ ناکرێت."[3]

سومەیرا کە یەکێك بوو لەو هاوەڵە ئافرەتانەی بەشداری جەنگی کردبوو، لە مەیدانی جەنگدا بەدوای پێغەمبەردا دەگەڕا و دەیپرسی "کوا پێغەمبەری

---

١. صحيح البخاري، الايمان ٨؛ صحيح مسلم، الايمان ٦٩-٧٠.

٢. إبن كثير، البداية و النهاية ٦٦/٤.

٣. إبن كثير، البداية و النهاية ٣٩/٤.

خوا؟" خەڵك ئاماژەیان بۆ جێگەکەی کرد، کاتێك بینی سەلامەتە، وتی "دوای بینینی تۆ بە ساغ و سەلامەتی، ئیدی هەموو بەڵا و موسیبەتێك ئاسانە."[1]

لەوکاتەدا کە نوسەیبەی کچی کەعبی ئەنساری شمشێری بەدەستەوە بوو و بەرگری لە پێغەمبەر دەکرد، پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) ئاماژەی بۆ کوڕە بریندارەکەی کرد و داوای لێکرد بچێت بەدەمیەوە. نوسەیبە بیری نەمابوو کە کوڕێکی هەیە و بریندار بووە. بەپەلە چوو بۆ لای و برینەکەی تیمارکرد، ئەوجا پێی وت "هەستە ڕۆڵەی خۆم، ڕۆژ ڕۆژی بەرگریکردنە لە پێغەمبەری خوا."[2]

جارێکیان حەزرەتی ئەبوبەکری صدیق لەئاکامی بەرگریکردن لە پێغەمبەر و بانگکردنی خەڵکی بۆ ئیسلام، هێندە دووچاری ئازار و لێدان بووەوە لەلایەن بتپەرستانەوە، لەهۆش خۆی چوو. دواجار لەگەڵ خۆرئاوابووندا دەمی بە چەند وشەیەك هاتە گۆ، ئەوەبوو پرسی "پێغەمبەری خوا چی بەسەر هات؟" ئیدی خزمەکانی خەمیان نەما و هەڵسانەوە و بە "ئومولخەیر"ی دایکیان وت "بزانە بەڵکو شتێك بخوات." دایکی هات بۆ لای و تکای زۆری لێکرد، بەڵام ئەو هەر دەیوت "پێغەمبەری خوا چی بەسەر هات؟" دایکی وتی "سوێند بەخوا هیچ لەبارەی هاوەڵەکەتەوە نازانم،" ئەویش سوێندی خوارد هیچ شتێك نەخوات هەتا هەواڵی نەزانێت.[3]

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٥٠/٤.

٢. إبن سعد، الطبقات الكبرى ٤١٤/٨-٤١٥.

٣. إبن كثير، البداية و النهاية ٣٠/٣.

ئەمە و سەدەها نموونەی تریش ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە سەرداری بوونەوەران (عَلَيهِ أفضَلُ صَلاةٍ وَسَلامٍ)، خۆشەویستی دڵی هاوەڵانی بووە و ئامادەبوون خۆیان بکەنە قوربانی لە پێناویدا. هەر بەوشێوەیەش بووە خۆشەویستی سەرجەم ئوممەتەکەی. بەو خۆشەویستییە بێگەردە وەك خەرمانەی مانگ دەورە درابوو. بۆیە چاوت بە پاسەوانێك یان خزمەتکارێك نەدەکەوت لەبەردەم دەرگاکەیدا،[1] چونکە متمانەی بە دەوروبەری هەبوو. هەمووان خۆشیان دەویست، ئەویش هەموانی خۆشدەویست.

## ٧. هەر لە سەرەتاوە پارێزراو بوو

ڕابردووی خۆشەویستمان پاك و بێگەرد بوو. شتێکی نەکردووە پێی لەکەداربێت. حەزرەتی ئەبوبەکر هاوەڵی سەردەمی منداڵی و لاویی بوو. خۆ ئەگەر ئەکەیەکی تێدا بەدی بکردایە، ئایا هەرگیز ڕێی تێ دەچوو لەگەڵ بانگەوازی پێغەمبەرایەتیدا یەکسەر بڕوای پێ بهێنێت؟ دایە خەدیجەشمان سەرباری هەموو ئەو داواکارانەی دەهاتنە خواستنی، کەچی سەروەرمانی هەڵبژارد. هەروەك ئایەتە پیرۆزەکە دەفەرموێت:

﴿وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ﴾ (النور: ٢٦)

"ئافرەتانی پاك و پاکیزە بۆ پیاوانی پاك و، پیاوانی پاك و پاکیزەش بۆ ئافرەتانی پاك."

خاتوو خەدیجەی هاوسەری پاکیزە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) ئەوەی لەدەستی هات بەختی کرد، تاکو هاوسەرێکی شایستەی ئەو کەسە پاکیزەیە بێت. هەتا دوا ساتی ماڵئاواییشی هەروا ژیا.

---

١. صحيح البخاري، الجنائز ٣٢؛ صحيح مسلم، الجنائز ١٥.

ڕەوشت و ئاکارە بەرزەکانی تەنانەت بەر لە پێغەمبەرایەتیش لای هەمووان ئاشکرا بوون. ئەوەتا خەڵکی مەککە پێیان دەوت "ئەمین".[1] ڕاستڕەوی و ئەمەکداری و پەیماندۆستیی لای هەمووکەس زانراو بوو. تەنانەت ئەبوجەهل و ئەبولەهەبیش ئەو ڕاستییەیان دەزانی و دانیان پێدا دەنا.[2] هەرچی دوژمنایەتی و ڕەخنە و بەرهەڵستیشیانە هۆکاری تری لەپشتەوە هەبوو. ئەگینا سەرجەم دوژمنانی دانیان بەوەدا ناوە کە لە هەموو گوفتار و ڕەفتارێکیدا سەرڕاست بووە.

پاکیزەیی و پاڵفتەیی و دووربوونی لە هەموو پرژی گوناهێك، سیفەتێك بوو لە سیفەتەکانی. بەردەوام پارێزراو و مەعصوم بوو، بۆیە هیچ گوناهێکی ئەنجام نەداوە. ئەوەبوو لە بەشی "عیصمەت"دا تیشکمان خستە سەر ئەم لایەنە.[3]

سێر ویلیام مۆر دەڵێت "محەممەد کەسایەتییەکی نایاب و نموونەی چاکە و ڕێزە. لە ژیانیدا کارێکی نەکردووە لە پیاوی گەورە و ئاستبەرز بوەشێتەوە. وێڕای ئەوەش توانی چەندین دەوڵەت بنیات بنێت و چەندەهاش بڕوخێنێت. لە گەرمەی ئاڵۆزی و هەرەتی ژیانیدا ئەو گەورەیی و چاکییەی پاراست و بە گوزەرانێکی پاکیزە و بێخەوشەوە ژیانی بردە سەر."

هاوکات مرۆڤێکی پاك بوو، دوور بوو لە سیفەتە لاوازەکانی مرۆڤ. خاوەنی چەندین ئامادەیی و لێهاتنی بەرز و بێوێنە بوو. جگە لە پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لە توانای کەسی تردا نەبووە ئەو هەموو تایبەتمەندییە بەرزانەی تێدا کۆببێتەوە.

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ١٩/٢.

٢. بڕوانە: صحيح البخاري، التفسير (١١١) ١؛ صحيح مسلم، الايمان ٣٥٥-٣٥٦؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٦٥/٣.

٣. نووری نەمر ٣، عیصمەتی سەروەرمان ٢١٣-٢٦٤.

چونکە بوونی ئەو هەموو توانست و لێهاتنە لەو ئاستە بڵندەدا، هیچ پێویست نەبوون بۆ کەسانی تری غەیری پێغەمبەران. بۆ نموونە؛ لێوەشاوەییەکەی لە بازرگانیدا هەلی بۆ ڕەخساند تاکو ببێتە باشترین بازرگان. خۆ هێشتا توانا سیاسی و سەربازییەکانی بەگەڕ نەخستبوون. دیارە هەروەك بازرگانێکی چاك بووە، ئاوەهاش کارگێڕێکی دانسقە و سەرکردەیەکی بلیمەتیش بوو. بەڵام هەڵەیە گەر مەزنیی ئەو زاتە (عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ) تەنها لە چوارچێوەی ئەو بوارانەی سەرەوەدا هەڵبسەنگێنین. چونکە ئەو بۆ ئەو مەبەستە بەدیهێنرابوو کە سەرجەم مرۆڤایەتی لەخۆ بگرێت. دیارە ئەوجۆرە ئامادەیی و لێهاتنانەش تەنها بە پێغەمبەران دەدرێن. گەرنا ئەوکات دانستێك نەدەمایەوە بۆ بوونی تایبەتمەندییەکانی دیکەی. خوای باڵادەستیش دوورە لە کاری بێهودە.

حەزرەتی محەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) لوتکەی چاکە و گەورەیی و بەرزی بوو. ئەوەش بۆ ئەو پێویست بوو تاکو لەسەرووی توانا و ئامادەیی هاوەڵانیەوە بێت و ڕۆڵی ڕابەر و سەرکردەیان بۆ ببینێت. لەڕووی توانست و لێهاتنەوە حەزرەتی ئەبوبەکر پاش ئەو دێت، کەچی هێشتا هەر شوێنکەوتەی سەرودر بوو، بگرە دڵسۆزترینی شوێنکەوتە و هۆگرەکانی بوو.

## ٨. دەرەنجام

ئەوەبوو لە بڕگەکانی سەرەوەدا ئاماژەمان بە هەندێك لەو تایبەتمەندی و ئاکارانە کرد کە پێویستە لە سەرکردەدا بوونیان هەبێت. وەختێکیش لەو گۆشەنیگایەوە ڕوانیمانە سەرداری پێغەمبەران (عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ)، بینیمان کە ئەو تاکە کەسایەتییە ئەو ئاکارانەی تێدا کۆبوویێتەوە. هیچ کەسیش نییە توانیبێتی لەو ئاستە نزیك ببێتەوە تاکو لەم بوارەدا بیکەینە پێوەر و بەوی

بەراورد بکەین. لەمەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە ڕەوشت و ئاکارەکانی لە لوتکەدا بوون. خوا هەر بەوجۆرە دروستی کردبوو و بە چەندین سیفەتی بەرز و بڵند ئارایشی دابوو. واتە مەزنی و بڵندیی ئەو بە بەراورد بە کەسانی تر نییە، بەڵکو هەر لەبنەڕەتدا پەروەردگار لە بڵندترین ئاستی مرۆڤایەتیدا خەلقی کردبوو.

لەلایەکی ترەوە، سەرکردەیەکی سەربازیی مەزن بوو، بگرە هەڵەیەکی گەورەیە گەر بە وشەی "بلیمەت" گوزارشت لەم لایەنەی بکەین. بەڵام کەموکورتی و سنووردارێی زوبان وامان لێ دەکات بەناچاری ئەمجۆرە هەڵانە بکەین و سیفەتی "بلیمەتیی سەربازی" بدەینە پاڵی. چونکە ناگونجێت ڕەهەندی سەربازیی پێغەمبەر بەو تەنها وشەیە ڕاڤە بکرێت. خۆ ئەو (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەك پێغەمبەرێك ئەم سیفەتەی -هاوشێوەی کۆی سیفەتەکانی تری- وابەستە بووە بە نیگای خوایی و فەتانەتە دەراسا و بێهاوتاکەیەوە. ئێمەش هەردەم ویستومانە پێ لەسەر ئەوە دابگرین؛ واتە پیشاندانی ئەوەی کە ئەم لایەنانەی بەڵگەن لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی. ئێمەش لەم ڕوانگەیەوە نزیك دەبینەوە لە گشت ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بەسەروەرمانەوە هەیە، سا ئەوە بە ئاشکرا باس بکەین یان نا.

ئەوەندە هەیە کە ڕەوشی بێهاوتای سەروەرمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لەڕووی سەربازیی و بلیمەتیی مەیدانی جەنگەوە لەئاستێکدا بووە پێش سەرجەم ئەو سومبولە سەربازییانە کەوتووە کە بەدرێژایی مێژوو هاتوونەتە سەر شانۆی ژیان. لەمەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە بلیمەتیی ئەو نازدارە لە خودی خۆیەوە نەبووە. چونکە ئەو کەسێکی ئوممی بووە و، پێشتریش جگە لە جەنگی "فیجار"، کە ئاکۆکییەکی بچووك بووە، جەنگی تری نەدیوە. لەو

جەنگەشدا تەنها تیری بۆ مامەکانی هەڵگرتووە و تیری نەهاویشتووە.[1]
بەڵام وا ئێستا چەندەها جەنگ بەڕێوە دەبات کە ستراتیژیەتی خۆیان هەیە و لە هەمووشیاندا سەردەکەوێت. بەجۆرێکیش زاڵ دەبێت کە سەرجەم سەرکردە و فەرماندە سەربازییەکان دەستەوسانن لە ئاستیدا. ئەوەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەیەکی تری پێغەمبەراتییەکەیەتی، چونکە:

یەکەم: بە فەرمانی خوای باڵادەست نەخشەی بانگەوازێکی دیار و ڕوونی کێشا، ئامانجی تەواو ڕوون و ئاشکرا بوو. دەبووایە حەقیقەت بڵاو بکاتەوە و هەموو کۆسپ و ئاستەنگەکانی بەردەمی بڕەوێنێتەوە و سەرتاپای ژیانی تەرخان بکات لەپێناو گەیشتن بەو مەبەستەدا. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەم لەخۆیدا و هەم لە کەسانی چواردەوریدا پێشکەوتنی خێرا لە تێگەیشتن و پەی بردن بەو ڕێگاو شێوازانەی بەرەو ئەو ئامانجە دەڕۆشتن هاتنەدی. بەڵام ئامانجەکە وەك خۆی مایەوە و هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهات و لە ڕێڕەوی خۆی لای نەدا. نە خۆی و نە پەیڕەوە ڕەسەن و بەختەوەرەکانی هیچکات خۆپەرست و خودپەسەند نەبوون. ئەوانەی وردەکاری بیست و سێ ساڵەی تەمەنی بانگەوازەکارییەکەی دەکەن، چاك دەزانن کە هەر لە سەرەتای پەیامەکەیەوە هیچ قسەیەکی نەگۆڕیوە، بگرە تا دواساتی ژیانی وەك خۆی ماوەتەوە.

لە هیچ قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانیدا جەنگ ئامانجێك نەبووە لە ئامانجەکانی. بەڵکو دوایین ئامراز بووە کە پەنای بۆ بردووە. چونکە هەردەم جێگرەوە و ڕێگەچارەی تری پێشکەش بە لایەنی بەرامبەر کردووە. دوو جێگرەوەی یەکەم بریتی بوون لەوەی سەرپشکی کردوون لەنێوان ئەوەی

[1] ابن هشام، السيرة النبوية ٣٢٦/١.

موسڵمان ببن یاخود باج و سەرانە بدەن.[1] جا بۆیە هەرکەسێك یەکێك لەو دوو جێگرەوەیە قبووڵ بکات، لە ئیسلامدا دروست نییە جەنگی لەگەڵ بکرێت.

بەرلەوەی سوپا بەڕێ بکات بەرەو بەرەکانی جەنگ، ئامۆژگاری سەرکردە و سەربازەکانی دەکرد و یادی دەخستنەوە کە بە هیچ جۆرێك نزیکی ژن و منداڵ و بەساڵاچوو و ئەوانە نەکەونەوە کە چەکیان هەڵنەگرتووە.[2]

جارێکیان خالیدی کوڕی وەلید و ئوسامەی کوڕی زەید هەڵەیەکیان کرد و کەسانێکیان کوشت بەگومانی ئەوەی لە ترسا[3] و بۆ خۆدەربازکردن[4] موسڵمان بوون. کاتێك پێغەمبەر (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەوەی زانی، زۆر بە توندی سەرزەنشتی کردن. بەڵێ، بەڕاستی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) ئامانجێکی زانراوی دیاریکردبوو. تەنها خۆی و هاوەڵەکانی بەرەو ئەو ئامانجە نەڕۆیشتن، بەڵکو ئەوانەش کە دوای چەندین سەدە پاش ئەوان هاتوون، هەر بەو ئاراستەیە ڕێیان کردووە و پابەندبوون بە ڕێنماییەکانییەوە.

دووەم: پێغەمبەری سەروەر (صَلَوَاتُ ٱللَّهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بەگوێرەی ئەم بنەمایە دەجوڵایەوە "هێرشکردن چاکترین شێوازی بەرگرییە". ڕاستە لە چەند ڕووبەڕووبوونەوەیەکدا ناچاربوو شێوازی بەرگری هەڵبژێرێت، بەڵام لە کۆی جەنگەکاندا هەوڵی سازاندنی زەمینەی هێرشکردنی داوە.

سێیەم: هەموو ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانی لەسەر بەرچاوڕوونی و کارزانی

---

١. صحيح مسلم، الجهاد ٣؛ سنن الترمذي، السير ٤٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٥٢/٥.

٢. صحيح البخاري، الجهاد ١٤٧-١٤٨؛ صحيح مسلم، الجهاد ٣، ٢٤-٢٥؛ سنن الترمذي، السير ٤٨؛ سنن أبي داود، الجهاد ٨٢.

٣. صحيح البخاري، المغازي ٤٥؛ صحيح مسلم، الإيمان ١٥٨.

٤. صحيح البخاري، المغازي ٥٨، الأحكام، ٣.

بوون. له هیچ شتێکدا بەدوای بەخت و ئەگەردا نەگەڕاوە و بەتەمای نەبووە. بەڵکو هەڵسەنگاندنی تایبەتی بۆ هەموو هەنگاوێك دەکرد. بەڵگەش ئەوەیە کە لە ژیانیدا هەنگاوێکی بۆ دواوە نەناوە.

بۆ نموونە، جارێکیان هاوەڵان ویستیان ژمارەی سوپای دوژمن بزانن، ئەوەیان پێ نەکرا، هەتا کەسێکیان گرت و بەزۆر هێنایانە قسە. بەڵام هەرچەند کابرا ڕاستی بوتایە، بڕوایان پێ نەدەکرد و بەلێدان دایاندەگرتەوە. لەکاتێکدا ئەگەر بۆ ڕازیکردنی ئەوان درۆی بکردایە، وازیان لێ دەهێنا. پێغەمبەر (عَلَيْهِ صَلَاةٌ وَسَلَام) فەرمانی دا دەستبەرداری ببن و ئازاری نەدەن. پاشان بانگی کرد بۆلای خۆی و لێی پرسی "ڕۆژانە چەند وشتر سەردەبڕن بۆ خواردن؟" ئنجا لەو وەڵامەوە ژمارەی سوپای دوژمنی خەمڵاند. لەسەر بنەمای ئەو زانیارییانەش خۆی ئامادە دەکرد و ستراتیژی جەنگی دانا.[1] کەواتە هەرگیز هەنگاوی هەڕەمەکی نەناوە. دیارە ئەوەش یەکێکە لە داخوازییە بنچینەییەکانی سەرکردایەتی.

چوارەم: لە جموجوڵەکانیدا ڕەچاوی کۆمەڵە بنەمایەکی دیاریکراوی دەکرد و پشتگوێی نەدەخستن. بۆ نموونە زۆر بەوردی پلانی بۆ کات و شوێنی هێرشەکان دادەڕشت. جەنگی خەیبەر نموونەیەکی بەرجەستەی ئەمەیە. چونکە وای نیشاندا کە بە ئاڕاستەی هۆزی غەطەفان دەڕوا، کەچی مەبەستی ڕاستەقینەی ئەو خەیبەر بوو. غەطەفانیش وایان زانی بەرەو ئەوان دێن، بۆیە خۆیان لەناو شووراکانیاندا قایمکرد، دانیشتووانی خەیبەریش پێیان وا بوو هەڵمەتەکە پەیوەندی بەوانەوە نییە، بۆیە هیچ جۆرە ڕێوشوێنێکی خۆپارێزییان

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ١٦٤/٣.

نەگرتە بەر. کەچی بەیانی ئەو ڕۆژە کە هێشتا بەدەم وەنەوزی خەوەوە چاویان دەپرواند، موسڵمانەکان کە نوێژی بەیانییان کردبوو، بەو بەیانییە زووە هەڵیان کوتایە سەریان. ئەوەش لە ئەنجامی پلانڕێژیی ناوازەی پێغەمبەرەوە بوو، کە هەموو کێشەکانی وەك خواردنەوەی کوپێك قاوە بەئاسانی چارەسەر دەکرد.[1]

لەسەر هەمان دەستوور و بنەماش چووە ناو مەککەوە. تەنانەت حەزرەتی ئەبوبەکریش نەیدەزانی ڕوو لە کوێ دەکات. بۆیە خەڵکی مەککە خۆیان لەبەردەم ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراودا بینییەوە. کاتێکیش بەخۆیان زانی، هیچ بوارێکیان نەمابوو بۆ هەڵهاتن.[2]

پێنجەم: کاتی گونجاوی دیاری دەکرد بۆ جەنگ، بە جۆرێك کە کات و شوێنی جەنگ لە بەرژەوەندی موسڵمانان و بە زیانی دوژمنان بێت. ئەوەتا لە جەنگی بەدردا موسڵمانان لە شوێنێك دابەزین کە ئاوی تێدابوو. بەدرێژایی جەنگ دوژمن لە ئاو بێبەشکرا.[3]

شەشەم: فاکتەری 'کات'ی زۆر بە باشی بەکار دەهێنا. کاتی جەنگی خەندەقی درێژکردەوە، تا زستان شالاوی هێنایە سەر دوژمن و ناچاری کشانەوەی کردن. دیسانەوە پێگەی جەنگەکەش لە بەرژەوەندی موسڵمانان بوو.[4]

هەروەها کاتی جەنگی حونەینیش کاتێکی نایاب بوو، خۆ ئەگەر لەوکاتە دوا بکەوتایە ئەوا موسڵمانان هەلی هێرشیان لەکیس دەچوو، بەڵکو ناچار دەبوون بکەونە بەرگری لە دۆخێکدا کە هەرگیز بە قازانجیان نەدەشکایەوە.

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٢٩٩/٤-٣٠٠؛ إبن سعد، الطبقات الكبرى ١٠٦/٢؛ إبن كثير، البداية و النهاية ١٨١/٤-١٨٢.

٢. إبن هشام، السيرة النبوية ٥٥/٥.

٣. إبن هشام، السيرة النبوية ١٦٧/٣-١٦٨.

٤. إبن هشام، السيرة النبوية ٤/ ١٨٩-١٩٢.

هەروەها تیرهاوێژەکانی دوژمنی ڕاکێشا بۆ ناوجەرگەی شەڕ، لەکاتێکدا لە سەنگەرەکانی خۆیاندا تۆکمە و قایم بوون. هێزی پێشڕەوی موسڵمانان وای نیشاندا کە دەکشێنەوە. هەربۆیە یەکەی تیرهاوێژانی دوژمن کە بەهێزترین بەرە بوون، کەوتنە شوێنیان و بەوەش بەشێکی زۆری هێزیان لەدەستدا. چونکە لە پێگەی خۆیاندا نەمانەوە و نێزە و تیرەکانیان دادی نەدان.

حەوتەم: بێگومان دابینکردنی بژێوی و پێداویستیی جەنگاوەران لە گرنگترین مەرجەکانی ڕێکخستنی سوپایەکی تۆکمەیە. لە هیچکام لە غەزاکانی پێغەمبەردا (عَلَيهِ أفضَلَ صَلاةٍ وَسَلَام) ڕووی نەداوە سوپاکەی بەهۆی کەمی ڕۆزی و پێداویستیی جەنگییەوە دەستیان لە جەنگ هەڵگرتبێت و پاشەکشەیان کردبێت. قورئانی پیرۆز لە سەدان ئایەتدا داوا دەکات موسڵمانان بۆ ئەو مەبەستە سامان ببەخشن و سەخاوەتمەندی بنوێنن. پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) توانی بە باشترین شێوە ئەو ئامادەییە لە موسڵماناندا بخاتە گەڕ. بۆیە جیهاد لە ئیسلامدا بە گیان و سامان ئەنجام دەدرێت.

## ٩. شاگردەکانی مەدرەسەی نبووەت

تا ئێستا باسی هەندێك ڕوخساری تاکتیکی جەنگ و تایبەتمەندیی ئەو ڕێوشوێنانەمان کرد کە پێغەمبەرمان (عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) گرتونییەتە بەر. ئەوەبوو لەماوەیەکی زۆر کورتدا سوپایەکی بێوێنەی پێکهێنا، ئەو سوپایەی کە توانی لە ماوەیەکی کورتدا فەتحی بەشێکی بەرفراوانی گۆی زەوی بکات. بۆیە دەتوانین بڵێین پێغەمبەری سەردار (صَلَواتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ) کەسایەتییەکە نموونەی نییە لە بواری ڕێکخستنی سوپا و ئامادەکردنی جەنگاوەراندا. هەرخۆیشی

دارِێژەری یەکەمی سوپای ئیسلام بووە. لەسەر دەستە پیرۆزەکانی خۆی ئەو سوپا مەزنە دامەزرا، واتە سەرکردایەتی لەشکرێکی دامەزراوی نەدەکرد وەك ئەوەی لەلای سەرکردە سەربازییەکانی تر دەبینرێت.

گرنگترینی خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە ئەو سوپایەی پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) پێکی هێنا، ئەم سێ تایبەتمەندییە گرنگەی تێدا بووە:

١- ئامادەکاری.

٢- ڕەوشتی باڵا و پەروەردەی نموونەیی.

٣- ئیمانێك لە لوتکەدا و هەستی گوێڕایەڵی.

کاتێك پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێت "بزانن کە هێز تیرهاویشتنە"[١] ئەوا ئاماژەی بۆ بواری پیشەسازیی سەربازی کردووە هەتا ڕۆژی قیامەت. ئەوە یەکێکە لە فەرمایشتە پرشنگدارەکانی و لەسەردەمی خۆیدا بەچاکی پیادەی کردووە و بایەخی بە تیرهاوێژی داوە. چەندەها فەرمووودەی زۆر هەن کە هان دەدەن بۆ تیرهاوێژی و برەو پێدانی.[٢] لەناو ئەو فەرموودانەدا فەرمایشتێکی سەرنجڕاکێش هەیە کە بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەفەرمووێت "تیر بهاوێژە دایك و باوکم بەفیدات بن."[٣] پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) بە زۆر کەسی فەرمووە "باوکم فیدات بێت" یان "دایکم فیدات بێت"، بەڵام تەنها بە سەعدی فەرمووە "باوکم و دایکم بەفیدات بن."

---

١. صحيح مسلم، الإمارة ١٦٧؛ سنن أبي داود، الجهاد ٢٣.

٢. بۆ نموونە بڕوانە: صحيح البخاري، الجهاد ٧٨، الأنبياء ١٢، المناقب ٤؛ صحيح مسلم، الإمارة ١٦٩، ١٦٧؛ سنن الترمذي، فضائل الجهاد ١١؛ سنن أبي داود، الجهاد ٢٣.

٣. صحيح البخاري، الجهاد ٨٠؛ صحيح مسلم، فضائل الصحابة ٤٢.

پێغەمبەر (عَلَيهِ أَفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بۆخۆی سوپاکەی ئامادە دەکرد. لەکاتی ئاشتیشدا هانی دەدان ڕاهێنان و چالاکیی وەرزشی ئەنجام بدەن. هەر بۆ ئەو مەبەستەش کۆمەڵە پێشبڕکێیەکی لەنێوانیاندا ڕێك دەخست.[1] تەنانەت خۆیشی بەشداری هەندێکیانی دەکرد.[2] هەروەها زۆرانبازی لەنێوان ئەو لاوانەدا ڕێك دەخست کە هێشتا نەگەیشتبوونە تەمەنی جەنگان. ئەوەش بەڵگەیە لەسەر بایەخدانی بە چالاکییە وەرزشییەکان.[3] سوپای ئیسلام ئا لەوکاتەدا لەڕووی مەشقی سەربازی و پلانی جەنگەوە زۆر بەهێز بوو. با ئەوەش بوەستێت کە ورە و گیانی سەربازەکانی لەوپەڕی بڵندیدا بوو.

سوپای ئیسلام ڕەوشتێکی هەبوو فریشتەکانیش خۆزگەیان پێ دەخواست. چونکە پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيهِ) کۆمەڵە سەربازێکی پەروەردەکردبوو، بۆ هەرکوێ بڕۆشتنایە دەبوونە کانگای ئاسایش و ئارامی. هەر جێگەیەك لەلایەن هاوەڵانەوە فەتحکرابێت هیچ ڕووداوێکی دەستدرێژی تێدا نەبینراوە. بەڵێ، ئەوە ئەندازەی ئەو ڕەوشتبەرزی و پاکیزەییە بوو کە سوپای ئیسلامی پێگەیشتبوو. بێگومان هەموو ئەو ئاکارە بەرزانە هەڵقوڵاوی بیروباوەڕەکەیان بوو، چونکە ئەوە داخوازی و بەروبومی ئیمان بوو، قورئانی پیرۆزیش تیشك دەخاتە سەر ئەم لایەنە و دەفەرموێت:

﴿ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ

---

١. بڕوانە: صحيح البخاري، الصلاة ٤١، الجهاد ٥٦-٥٨؛ صحيح مسلم، الإمارة ٩٥، الجهاد ١٣٢.

٢. بڕوانە: صحيح البخاري، الجهاد ٥٩؛ سنن أبي داود، الأدب ٨.

٣. إبن حجر، الإصابة ١٧٨/٣.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾

(المجادلة: ٢٢)

"کەسانێکت دەست ناکەوێت باوەڕ بهێنن بە خوا و بە ڕۆژی دوایی، لەکاتێکدا کەسانێکیان خۆش بوێت کە دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەیان کردبێت. ئەگەرچی ئەو دوژمنانە باو و باپیریان بن یان نەوەیان بن، یان برا یان عەشیرەتیان بن. ئەوانەی بەوشێوەیەن (ئیمانیان لە هەموو کەسێك لا بەنرختر و پیرۆزترە)، خوا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە و جێگیری کردووە و لە بەهرە و میهرەبانیی تایبەتیی خۆی، وە بە هێز و گیانێکی تایبەتی لەلایەن خۆیەوە (مەبەست قورئان و ئیمانە) پشتگیری کردوون و یارمەتی داون، سەرەنجامیش دەیانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەخت و کۆشکەکانیدا تێ دەپەڕێت. هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوەدا. ئەوانە خوا لێیان ڕازییە و ئەوانیش لە خوا ڕازین. ئا ئەوانە دەستە و لایەنی خوای گەورەن، ئاگاداربن کە بەڕاستی هەر لایەن و دەستەی خوا سەرکەوتوو و سەرفرازن."

باوەڕیان ئەوەندە قووڵ بوو هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك نەدەبووە ڕێگریان لە گەیشتن بە ئامانجەکانیان. جەنگی وا هەبووە کە برا و باوك و مامەکانی خۆیان بەرامبەریان وەستاونەتەوە. ئەمجۆرە هەڵوێستانە -کە مرۆڤ لە ئاستیاندا دۆش دادەمێنێت- نەیانتوانی هاوەڵان بوەستێنن یان دڵەڕاوکێ و کشانەوە بخەنە دڵیانەوە، بەڵکو هەستان بە ئەنجامدانی ئەو فەرمانانەی بۆیان دەرکرابوون، بەرەو ئەنجامدانی ئەو ئامانجە ڕۆیشتن کە بۆیان کێشرابوو. بەڵێ، پێغەمبەر (عَلَيۡهِ أَفۡضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) سوپایەکی پێك هێنا کە تا ئەو ڕۆژە بە ئەندێشەی جیهاندا نەهاتبوو، شمشێری سەربازەکانی ئەو سوپایە بۆیان هەبوو باوکیان

یان براکانیان یان خزمەکانیان بکوژن، هەر دوودڵییەکیش لەوبارەیەوە بۆی هەبوو جوڵەی تەواوی سوپا پەك بخات. کەچی تاکە سەربازێك لە سوپاکەی پێغەمبەردا بۆ تاکە ساتێکیش دوودڵ نەبووە.

ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح (رضيَ اللهُ عَنْهُ) لە جەنگی بەدردا لەگەڵ باوکی خۆی جەنگا. سەرەتا دوورکەوتەوە و خۆی لێ لادا، بەڵام باوکی شوێنی کەوت هەتا ناچاری کرد شەڕەشمشێری لەگەڵ بکات و بیکوژێت.[1]

ڕووبەڕووبونەوەی باوکی لە مەیدانی جەنگدا نەبووە کۆسپ لەبەردەم ئەنجامدانی ئەرکەکەی. بانگەواز بانگەوازە، هەرکەس لەبەردەمیدا بوەستێت پێویستە لەڕێ لابدرێت، (ئەمە جگە لە هەندێك حاڵەت کە داخوازی سۆز و بەزەیی و نەرمی نواندنە). ئەبوعوبەیدەش تەنها نەبوو لەم ڕەفتارەیدا، بەڵکو هاوەڵانی تریش هەروا بوون. ئەوەتا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صدیق لە جەنگی ئوحوددا لە ڕیزی بتپەرستان بوو. لە گەرمەی شەڕدا چاوی کەوت بە باوکی، حەزی نەدەکرد لەڕوویدا بوەستێتەوە، بۆیە خۆی لێ لادا، پاش موسڵمانبوونی ئەو هەڵوێستەی بۆ باوکی گێڕایەوە. لەبەرامبەردا ئەویش وتی "بەڵام ئەگەر من تۆم بەرچاو بکەوتایە، دڵنیابە ڕووبەڕووت دەبوومەوە."[2]

عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی زۆر خەمبار بوو بەو هەڵوێستەی باوکی نواندبووی و دەیزانی شایستەی سزای مەرگە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ڕێزی لێ دەگرت. هات بۆ لای پێغەمبەر و وای زانی فەرمانی بە کوشتنی باوکی داوە، بۆیە پێی وت "ئەی پێغەمبەری خوا! پێم گەیشتووە کە بەنیازیت عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی باوکم بکوژیت، جا ئەگەر نیازت وایە ئەوە بکەیت، ئەو

---

١. إبن حجر، الإصابة ٥٨٧/٣.

٢. الحاكم، المستدرك ٥٣٩/٣.

بەر پرسیارێتیە بەمن بدە. سوێند بەخوا خەزرەجییەکان چاك دەزانن کە پیاوێکی تری وەك من لەناویاندا نییە کە پیاوێکی تریان لەناودا نیە هێندەی من چاکەکار بێت لەگەڵ باوکیدا، دەترسم فەرمان بدەیت کەسێکی تر بیکوژێت و منیش نەفسم وازم لێ نەهێنێت بکوژی باوکم ببینم لەناو خەڵکدا بگەڕێت و دەستم بچێتە خوێنی، بەوەش باوەڕدارێك لەبری بێباوەڕێك بکوژم و بچمە دۆزەخەوە."[1]

عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی هاوەڵێکی گەورە بوو، باوکیشی سەرۆکی دووڕووان بوو. بەڵام پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) نەیدەویست ئەو دووڕووە بکوژێت، بۆیە فەرمانی کرد بە کوڕەکەی تا لەگەڵیدا باش بێت و چاکەی لەگەڵدا بکات.

پێشتریش باسی ئەوەمان کرد کە ئەو هاوەڵە بە باوکی وتبوو کە ڕێی نادات پێی بخاتە ناو مەدینەوە هەتاکو نەڵێت "من خۆم زەلیل و سەرشۆڕم، محەممەدیش سەربەرزە." چونکە باوکی وتبووی "هەرکە گەڕاینەوە بۆ مەدینە، دەبێت سەربەرزەکان ڕیسوا و زەلیلەکان دەربکەن!"[2] بەوە خۆی بەسەربەرز و، پێغەمبەریشی (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَسَلَامُ) -هەزار هەزار جار حاشا- بە پێچەوانەکەی وەسف کردبوو. کوڕەکەشی سووربوو لەسەر ئەوەی بیسەلمێنێت کە پێچەوانەکەی ڕاست و دروستە. هاوەڵان باوەڕیان وابوو کە:

﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا ۗ وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾

(آل عمران: ١٤٥)

---

١. إبن هشام، السيرة النبوية ٢٥٥/٤-٢٥٦؛ الطبراني، تاريخ الأمم و الملوك ١١٠/٢.

٢. صحيح البخاري، المناقب ٨؛ صحيح مسلم، البر ٦٣، المنافقون ١.

"هیچ کەسێك نامرێت مەگەر بە ویستی خوا نەبێت لەکاتی دیاریکراودا. جا ئەوەی پاداشتی دنیای دەوێت هەندێکی پێ دەبەخشین، ئەوەش کە قیامەتی دەوێت هەندێکی پێ دەبەخشین، لە داهاتوویەکی نزیکیشدا پاداشتی سوپاسگوزاران دەدەینەوە."

بۆیە لەناو مەیدانی جەنگدا بەبێ ترس و لەرز دەسووڕانەوە، ئەگینا بێباکیی ئەبودوجانە لە مردن چۆن لێك دەدرێتەوە.[1]

حەزرەتی عەلی زۆرجار نەخۆش دەکەوت، خزم و دۆستەکانی نیگەرانی حاڵی دەبوون، بەڵام ئەو دڵنیای دەکردنەوە کە بە نەخۆشی نامرێت. چونکە باوەڕی تەواوی بەوە هەبوو کە نامرێت هەتاکو ڕیشی بە خوێنی سەری سوور نەبێت، چونکە پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) ئەو هەواڵەی پێ دابوو.[2]

لە جەنگێکدا گوێچکەی عەممار کوڕی یاسر بڕرا، خوێنێکی زۆری لێ ڕۆشت، بەڵام ئەو دڵنەوایی دەوروبەرەکەی دەکرد و دڵنیایی دەدانێ کە بەو پێکانە نامرێت، چونکە لە پێغەمبەری بیستبوو "هاوار بۆ عەممار، کۆمەڵێك دەستدرێژکار (فِئَة باغِية) دەیکوژن، دوا شتێکیش کە لە دونیا وەریدەگرێت پەرداخێك شیر دەبێت"[3]

خۆی لەوە دڵنیابوو و هیچ گومانی لە چارەنووسی خۆی نەبوو. هەر ئەو ئیمانە بوو کە سەرجەم پیلان و نەخشەی دوژمنانی پوچەڵکردبوویەوە.

هەر ئەو باوەڕەش لێکدانەوەی ئەو ئازایەتییە مەزنە دەکات کە مرۆڤ هان دەدات تاکو خۆی بدات لە ئاوی زەریاکان بۆئەوەی لە پێناوی خوادا جیهاد بکات.

---

١. بڕوانە: صحيح مسلم، فضائل الصحابة ١٢٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٢٤/٣.

٢. أحمد بن حنبل، المسند ١٠٢/١؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٣٢٤/٧-٣٢٥.

٣. إبن الأثير، أسد الغابة ١٣٤/٤.

جا نازانم تۆ بڵێیت پێویست بکات باسی ئەو گوێڕایەڵی و ملکەچییە بکەین کە هاوەڵە بەڕێزەکان هەیانبووە لەئاست فەرمایشتەکانی سەروەردا! گوێڕایەڵی ئەوان هێندە بەڵگەنەویستە هەرکات ناوی هاوەڵە بەڕێزەکان برا، خێرا واتای "گوێڕایەڵیی تەواو و کامڵ" بەبیرماندا دێت. جا لەبەرئەوەی ئەمەش باس و خواسێکی سەربەخۆیە، بۆیە لێرەدا بەمەندە دەست هەڵدەگرین.

لە دێرەکانی ڕابردوودا تیشکێکی خێرامان خستە سەر ئەو بایەخەی کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە مەشق و ڕاهێنانی سەربازیی داوە. جا بۆئەوەی کۆتاییەکەی میسك و گوڵاو بێت، دەچینە خزمەت دوو فەرموودە و ئایەتێك سەبارەت بەو بابەتە:

سەرداری پێغەمبەران (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت "منداڵەکانتان فێری مەلەوانی و تیرهاویشتن بکەن."[1] هەروەها دەفەرموێت "هەرکەس فێری تیرهاوێژی بوو پاشان وازی لێهێنا، لە ئێمە نییە -یان سەرپێچی کردووە-"[2] پەروەردگاریشمان فەرمانمان پێدەکات و دەفەرموێت:

﴿ وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُوا مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴾

(الأنفال: ٦٠)

"هەرچی لە تواناتاندا هەیە بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام بیخەنە گەڕ و ئامادەی بکەن. وە لە ئامادەکردنی هەموو جۆرە ئەسپ و (هۆکارەکانی تری

---

١. البيهقي، شعب الإيمان ٦/٤٠١؛.

٢. صحيح مسلم، الإمارة ١٦٩؛ سنن أبي داود، الجهاد ٢٣.

گواستنەوە) کەمتەرخەمی مەکەن. تا دوژمنانی خوا و دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکەن. با کەسانی تریش جگە لەم دوژمنانەی ئێستا پێی چاوترسێن ببن کە ئێستا ئێوە نازانن کێن و نایانناسن. بەڵکو هەر خوا خۆی دەیانناسێت و هەر شتێك ببەخشن لە پێناوی خوادا (بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام). ئەوە بەزایە ناچێت و دەستتان دەکەوێتەوە و ستەمتان لێ ناکرێت."

هەرچییەك دەکەم دڵم رێم نادات خاڵی کۆتایی ئەم بابەتە دابنێم. چۆن بتوانم لەکاتێکدا کە مرۆڤ دەچێتە خزمەت ژیاننامەی بۆنخۆشی ئەو نازدارە، وا هەست دەکات لەگەڵ ئەودا و لە هەرێمە نوورانییەکەی ئەودا دەژی. ئاخر کێ دەخوازێت دەستبەرداری هاودەمییەکی پیرۆزی لەوجۆرەبێت! بەڵام چار چییە..! باسەکەمان لێرەدا بەپایان دەگات.. ناچارم دەروازەی ئەم بەشەش دابخەم. جا بۆئەوەی کۆتایی قسەکانمان بۆن و بەرامەی میسك و عەنبەری لێبێ، دەمەوێت ئەم چەند پەیڤە ناوەرۆکدار و پرشنگدارەی مامۆستای گەورە، بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی بکەمە دواهەمین دێرەکانی ئەم بەشە:

حەزرەتی محەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) ئەو کەسەیە کە لەبەر گەورەیی مەعنەویی ئەو: سەر ڕووی زەوی بووە بە مزگەوتی و، مەککە بە میحرابی و، مەدینە بە مینبەری و، خۆیشی پێشنوێژی سەرجەمی ئیماندارانە کە لە پشتیەوە ڕیزیان بەستووە و، وتاربێژی هەموو مرۆڤایەتییە و، یاساکانی بەختەوەرییان بۆ ڕوون دەکاتەوە و، سەروەری گشت پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ السَّلَامُ)، تەزکییەیان دەکات و بەوەش کە ئایینەکەی ئەم سەرجەم بناغەکانی هەموو ئایینەکانی ئەوانی لە خۆیدا کۆکردووەتەوە، ئەوا تەسدیقی هەموویان دەکات.. ئنجا گەورەی هەموو ئەولیاکانە، چونکە بەهۆی ڕووناکیی خۆری پێغەمبەرێتییەکەیەوە پەروەردە و ڕابەری و ڕێنمایی هەموویان دەکات..

ئەم پێغەمبەرە (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جەمسەرێکە لە ناوەندی بازنەیەکی زیکردا کە لە پێغەمبەران و صیددیقان و پیاوچاکان پێکهاتووە و هەموویان بە یەك دەنگ ئەو وشەیە دەڵێنەوە کە پێغەمبەر پێی ڕاگەیاندوون.

درەختێکی نوورانیی وەهایە کە ڕەگ و ڕیشە مەحکەم و زیندووەکانی بریتین لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلَامُ) بەهۆی ئەوەی کە بناغەی بانگەکانیان لەلایەن خواوەندەوەیە. لق و پەل و گەڵا سەوز و بەروبوومە جوان و بەتامەکانیشی ئەولیاکانن، کە بەهۆی ئەو زانیارییانەی لەڕێی ئیلهامەوە سەبارەت بە ناسینی خوای گەورە دەستیان کەوتووە، بوون بە لق و پەل و بەری ئەو درەختە. کەواتە ئەم پێغەمبەرە (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەر بانگەشەیەك بکات، هەموو پێغەمبەران بە موعجیزاتیان و، ئەولیاکان بە کەرامەتەکانیان تێکڕا و بە یەکدەنگ شایەتیی بۆ دەدەن و تەسدیقی دەکەن.

بەم جۆرە، هەموو دەعوایەکی ئەم پێغەمبەرە (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) مۆری هەموو مرۆڤە کامڵەکانی گرۆی مرۆڤایەتیی بە سەرەوەیە. ئەوەتا دەبینیت کە ئەو دەفەرمووێت "لاَ إلهَ إلاَ الله" و بەمەش بانگەوازی "یەکتایی" خواوەند ڕادەگەیەنێت، ئەوا لەلایەن ڕابوردوو و ئاینده و لە هەردوو ڕیزە نوورانییەکەیەوە،لەو زیکر گۆیانەوە کە لە بازنەی زیکرەکەدان، هەمان وشە دەبیستیتەوە کە هەموویان دەیڵێنەوە و دووپاتی دەکەنەوە و، گشتیان لەمەدا یەکیان گرتووە.. وەك بڵێی ئەوان بەم یەکدەنگییەیان بەم پێغەمبەرە دەڵێن "صَدَقْتَ وَبِالحَقِ نَطَقْتَ (ڕاستت وت و حەقت دەربڕی)" ئیتر ئایا چ وەهم و خەیاڵێك دەتوانێت بۆ بەربەرچدانەوەی دەعوایەکی وەها دەست درێژ بکات کە شایەتیدانی کەسانی لەژمارەبەدەری ئەوتۆ پشتی گرتبێت؟

بزانە ئەم بەڵگە نوورانییە کە بوو بە بەڵگە لەسەر "یەکتایی" خوا و، ڕێنمایی مرۆڤایەتی بۆ "تەوحید" کرد، هەروەك بە ئەندازەی هێزی ئیجماع و تەواتوری هەردوو باڵی پێغەمبەرێتی و ویلایەت پشتگیری کراوە، سەدان ئاماژەی ناو کتێبە ئاسمانییەکانیش، وەك ئەو مزگێنییانەی ناو (تەورات و ئینجیل و زەبوور و زەبوورەکانی پێشین) تەسدیقی دەکەن.

هەروەها هێمای هەزاران ئیرهاصی زۆر، کە هەموویان بە چاو بینراون، تەسدیقی دەکەن. هەروەها مژدەدانی چەندین دەنگ (هاتف) و شایەتیدانی موتەواتیری کاهینەکانیش تەسدیقی دەکەن.

هەروەها موعجیزەکانیشی دەبن بە بەڵگەی تەسدیقی ئەو.

هەروەها شەریعەتەکەشی، کە بەختەوەری هەردوو دنیای لەخۆدا کۆکردووەتەوە، تەسدیقی دەکات. لەلایەکی دیکەشەوە خورەوشتی جێ سەنای لەکەماڵدا بووی و کەسێتی و هەڵسوکەوتە ناوازە و دروستەکانی پەیوەست بەئەرکەکەیەوە، تەقوا دەراساکەی، بەندایەتیە دەراساکەی جددییەتە دەراساکەی، فەتانەتە دەراساکەی کەنیشاندەری ئیمانی بەهێز و متمانەی پتەو و پشت پێ بەستراوی لەڕادەبەدەریەتی، هێندەی ڕۆشتنی خۆر ڕاستگۆ بوونی لە بانگەوازەکەیدا نیشان دەدەن.

با پێکەوە بڕۆین بۆ باشترین سەدە و چەرخی بەختەوەریی پێغەمبەرێتی، تاکو -با بە ئەندێشەیش بێت- بە خزمەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شاد و بەختەوەر ببین، لەکاتێکدا کە لەسەر کارەکەی بەردەوامە و لە ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیدا کار دەکات. کەواتە چاوت بکەرەوە و بڕوانە..

یەکەم شت دەبینین ئەومیە کە:

کەسێکی لەعادەت بەدەر، دیمەنێکی لەڕادەبەدەر جوانی لەگەڵ ڕەوشتێکی لەڕادەبەدەر بەرزدا هەیە، ئەوەتا کتێبێکی خاوەن ئیعجازی بەنرخی بەدەستەوەیە و وتارێکی ئەزەلی ڕادەگەیەنێت کە بەسەر هەموو گرۆی ئادەمیزاددا، بگرە بەسەر هەموو جیننی و ئینس و، تەنانەت بەسەر هەموو بوونەوەرانیشدا دەیخوێنێتەوە.

چەندە سەرسووڕهێنەرە! ئایا لەم وتارەدا چی دەڵێت؟

بەڵێ، شتێکی گرنگ دەڵێت و، لە هەواڵێکی گەورە دەدوێت. چونکە ئەو مەتەڵە حەل دەکات کە لە نهێنیی بەدیهێنانی جیهاندایە و، ئەو گرێ کوێرە و تەلیسمە داخراوەش دەکاتەوە کە لە نهێنیی حیکمەتی بوونەوەراندا هەیە و، لەبارەی ئەو سێ پرسیارە گرنگ و قورسەوە دەدوێت و وەڵامیان دەداتەوە کە ژیریی مرۆڤیان تێدا مات و سەرسام بووە، چونکە هەر ئەو سێ پرسیارەن کە هەموو بەدیهێنراوان دەیانکەن و، دەڵێن "تۆ کێیت؟.. لەکوێوە هاتوویت؟.. بەرەو کوێ دەڕۆیت؟"

ئایا نابینیت ئەو هۆز و تیرە سەرەتایی و دواکەوتووانەی ناو ئەو بیابانە بەرینە، کە سەبارەت بە داب و نەریتیان توندوتیژن و لە دەمارگیری و ناکۆکیی نێوانیاندا تابڵێی سەرسەختن، چۆن ئەم کەسە، ڕەوشتە خراپە سەرەتاییەکانی ئەوانی لە ماوەیەکی زۆرکەمدا لابرد و، بە یەکجاری ڕیشەکەنی کردن و، لەبری ئەوانە، ڕەوشتی جوان و بەرزی پێ بەخشین و، کردنی بە مامۆستا و ڕابەری جیهانی مرۆڤ و نەتەوە پێشکەوتووە خاوەن شارستانییەکانیش!

ئنجا بڕوانە! ئەم دەسەڵاتەشی تەنها بەسەر ڕووی دەرەوەدا نییە! بەڵکو دەرگای "دڵان" و "ژیری"یەکانیش دەکاتەوە و "ڕۆح" و "دەروونەکان"یش

دەهێنێتە ژێر بار. بەرادەیەك کە بووە بە خۆشەویستی دڵان و، مامۆستای ژیرییەکان و، پەروەردەکاری دەروونەکان و، پادشای گیانەکان![1]

ئەی سەرداری دڵان! تۆ بوویتە سەرداری ڕۆحمان و ڕۆحیشمان قوربانی تۆ بێت! لوتف بفەرموو.. قبووڵ بفەرموو...!

١. وتەکان، وتەی نۆزدەیەم، نی ١،٢،٣ و ٧.